گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات

# مێژوو ٧



مەسەلەی کورد لە پەیوەندییەکانی سوری تورکیدا (١٩٨٤-١٩٩٨) م.شوان محمدامین خۆشناو
دامەزراوەی شێخی ئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانی قارەمان حەیدەر رەحمان
بازرگانی دەرەکی لە دەولەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم نجم الدین عبدالله اسماعیل
قضايا المرأة العاملة في كردستان العراق والاجحاف بحقها د.أحمد عبدالعزيز محمود
الجيش والانبعاث الإسلامي في تركيا ١٩٤٦ -١٩٦٠ أ.د. خليل علي مراد

ژمارە 26
ساڵی حەوتەم
بەهاری 2013

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات



ژمارە ( ٢٦ ) | ساڵی حەوتەم | بەهاری ٢٠١٣









- گۆڤار : مـێژوو
- ژمارە : (٢٦)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپخانە : ڕۆژهەڵات



**کوردستان / هەولێر - پشت - بەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین**

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێڕست

## ◀ سەروتار

ئەمڕۆ و دوێنێ

## ◀ توێژینەوە


| مەسەلەی کورد لە پەیوەندییەکانی سوری تورکیدا (١٩٨٤-١٩٩٨) | م.شوان محمدامین خۆشناو | ٩ |
|---|---|---|
| بازرگانی دەرەکی لە دەولەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم | نجم الدین عبدالله اسماعیل | ٤١ |
| کۆنگرەی ڤیەننا | بارزان محمد علی | ٧٥ |
| ئەمریکا و شەڕی یەکەمی جیهان | ئومید خطاب وهاب | ٩٧ |
| دامەزراوەی شێخی ئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانی | ئا: قارەمان حەیدەر رەحمان | ١٢١ |
| وەرزەکانی شارستانیەت لای شپنگلەر | سامان احمد عبدالله | ١٤٩ |
| خوایە لە دۆستانم بپارێزی دوژمنانم لەسەر خۆم | د.حسن جاف | ١٨٧ |


## ◀ القسم العربي


| ألفاظ ريفية مصرية في القرن السابع عشر دراسة في كتاب هز القحوف: أ.د. عماد عبدالسلام رؤوف | | ٢٢٩ |
|---|---|---|
| نبذة عن الصناعة و التجارة في مصر خلال العهد الأيوبي | أ.م.د.آكو برهان محمد | ٢٩٧ |
| قضايا المراة العاملة في كردستان العراق والاجحاف بحقها | د.أحمد عبدالعزيز | ٣٠٧ |
| الجيش والانبعاث الإسلامي في تركيا ١٩٤٦-١٩٦٠ | أ.د. خليل علي مراد | ٣١٥ |

## ◂ کەشکۆڵی گۆڤار


| | | |
|---|---|---|
| کورتەیەك لە مێژووی کەنعانیەکان (فینیقیەکان) | م. کلثوم جمیل | ٣٤٣ |
| بەراوردێك لە نێوان لایەنە باش و خراپەکانی سیستەمی کۆمۆنیزم و کەپیتالیزم | بژار عثمان احمد | ٣٥٣ |
| ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا | بەفرین محمد اسماعیل | ٣٦١ |
| کتێب فرۆشییەك بۆ مێژوو | د. محمد عبدالله کاکەسور | ٣٨٣ |
| چۆنیەتی گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کوردی و ساڵی کۆچی بۆ زاینی و ... | م. نارام مەجید عەلی | ٣٨٥ |
| یەکێك لەو ئاینانەی لە کوردستان سەریهەڵداوە و بنکەو... ئێزیدن سی | بژار عثمان احمد | ٤٩٣ |
| زەردەشت و ئاینی ئێران | وەرگێڕانی لە فارسیەوە/ قارەمان مستەفا | ٤١١ |
| دوژمنانی مێژووی کورد | د.محمد عبدالله کاکەسور | ٤٢٩ |

# ئەمرۆ و دوێنێ

## سەروتار

لە ساڵی(١٩٩٢)ەوە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کوردستانی عێراقدا بوونیان هەیەو لە پێشکەوتنی بەردەوام دان، دیارە ئەمڕۆ بەرهەمی دوێنێیەو بە لەبەرچاوگرتنی خەباتی ئەمڕۆش، کورد پێشتر میرنشینی کوردی هەبووە لە سەدەکانی ناوەڕاست و مێژووی نوێ بەڵام ئەم میرنشینانە بە ناوی کوردستان نەبوونە بەڵکو چەند نموونەیەك لە ناوەکانیان بریتی بوون لە میرنشینەکانی مەروانی، عەنازی، شوانکارە، سۆران، بابان و بۆتان...تد. دەوڵەتی ئەیوبی و دەوڵەتی زەند بە ناوی کوردستان نەبوونە و پاشگری کورد یان کوردستان بە ناوەکانیانەوە نەبووە. شێخ محمود خۆی بە مەلیکی کوردستانی باشور ناساندووە بەڵام ئەزموونی حوکمڕانییەکەی کورت بووە، هەروەها کۆماری کوردستانیش ١٩٤٦ پاشگری کوردستان بە ناویەوە بووە بەڵام ئەویش ئەزموونێکی کورت خایەن بووە.

بۆ یەکەم جارە لە مێژووی کورد ئەزموونێکی حوکمڕانی بە ڕاشکاوی بە ناوی کوردستانەوە بێت و ئەو ماوەیە درێژە بخایەنێت و خۆشبەختانە تاکو ئێستاش بەردەوامە، هەروەها لە ڕووی دان پیادانانەوە هیچ حوکمڕانییەکی کوردی پێشووتر لە لایەن ئەو هەموو دەوڵەتە هەرێمایەتی و جیهانییەوە دانی پیانەنراوە. یەکەمین جارە لە حوکمڕانییەکی کوردیدا کورد بەرهەمی نەوتی کوردستان بفرۆشێت و لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بەکاری بهێنێت لە کاتێکدا لە پێشووتر ئەو بەرهەمە نەوت لە لایەن دەوڵەتانی سەر دەستی کوردستان دەردەهێنراو بۆ سەرکوتکردنی کورد بەکاردەهات.

هەرگیز لە ئەزموونەکانی حوکمڕانی کوردی پێشووتر کورد لە ڕووی دبلۆماسی ئەوەندە سەرکەوتوو نەبووە بتوانێ ئەو هەموو قونسلیەتە بهێنێتە پایتەختی کوردستان وەکو ئەمڕۆ لە هەولێری پایتەخت دەیبینین. ئەم هەموو شاندە

فەرمییە لە دەرەوەی کوردستان دێنە کوردستان و لە کوردستانیشەوە بە فەرمی داوەت دەکرێن بۆ وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهان.

بە شێوەیەکی گشتی لە هیچ قۆناغێکی تری مێژووی کورد، کورد وەکو ئەمڕۆ خاوەن ئابوورییەکی بەهێز نەبووەو خەڵکی کوردستان هەرگیز خۆشگوزەرانییەکی ئابووری وەکو ئەمڕۆیان بەخۆوە نەبینیوە، ئەمەش لەوانەیە بەشێکی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەمڕۆ کورد سوودی لە هەڵەو کەموکوڕی هەموو ئەزموونەکانی حوکمڕانی پێشوو وەرگرتووە بە ئاراستەی دووبارە نەکردنەوەی هەڵەکان و بەدەست هێنانی دەست کەوتی پتر.

هەروەها کورد لە پێشتر وەکو ئەمڕۆ ئەم هەموو دامودەزگایەی نەبووە لە پەرلەمان و حکومەت و دەزگای ڕاگەیاندنی جۆر بەجۆرو دامودەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ...تد، هەر بۆ نموونە لە سەردەمی شێخ مەحمود کۆماری کوردستان حکومەت هەبووە بەڵام پەرلەمان بوونی نەبووە.

خاڵێکی تر زۆر گرنگە کورد لە پێشتر ئەو هەموو کادیرەی ئیدارەو بەڕێوەبردنی نەبووە چونکە خۆشبەختانە لە کۆتایی شەستەکانەوە زانکۆ لە کوردستان هەیەو ئێستاش ژمارەی ئەو زانکۆیانە بە حکومی و ئەهلی لە زیادبوون دان ئەوانە ساڵانە هەزاران کادیری ئیداری و بەڕێوەبردن بۆ ئیدارەی کوردی بەرهەم دەهێنن، لە کاتێکدا لە سەردەمی حوکمداری کوردی پێشووتر بۆ نموونە سەردەمی شێخ مەحموودو کۆماری کوردستان یەکێك لە کەموکوڕییە گەورەکان بوونی ژمارەیەکی کەمی پزیشك و ئەندازیارو مامۆستاو کادیری ئیداری سادە بووە دیارە حکومەت هەر بە دڵسۆزی و شۆڕش و دروشمیش بەڕێوەناچێت. بۆیە دەتوانین بڵێین کورد ئەمڕۆ بە بەراورد لەگەڵ دوێنێ لەهەر کاتێکی تر لە دەوڵەت بوون نزیکترە، ئەگەر چی ئەم بڕیارەش بڕیاری سەرکردایەتی سیاسی حەکیمی کوردستانە کە خۆی دەزانێ کەی دەیدات و پێش هەر بڕیارێکیش ئامادەسازی باشی بۆ دەکات هەرچەند کاتی بوێت چونکە بەرژەوەندی کوردو کوردستان لە پێشەوەی هەموو بەرژەوەندییەکان دادەنێت بۆیە کوردیش متمانەی تەواوی خۆی پێداوە.

# مەسەلەی کورد لە پەیوەندییەکانی سوری تورکیدا (١٩٨٤-١٩٩٨)

م.شوان محمدامین خۆشناو

## پێشەکی

پرسی کورد لە پەیوەندیەکانی سوری-تورکیدا، ناونیشانی ئەو کورتە باسەیە، لە یەکەم کردەی سەربازی پارتی کرێکارانی کوردستان (١٩٨٤) دژی تورکیا تا وەدەرنانی رێبەری رێکخراوەکە لە (١٩٩٨)دا، ماوەیەکی مێژوویی گرنگە دەکرێ زیاتری لەسەر بنوسرێت، بەتایبەتی بوونی کورد لە چوار وڵاتدا، پەیوەندیەکان بەرەو هەورازی و نشێوی دەبات، مەسەلەی بەکارهێنانی ئەو پرسە بێ گوێدانە هەستی ئەو کوردانەی لەو وڵاتەدا دەژین لە لایەن سوریاوە جێگەی باسە.

باسەکە بەسەر دوو تەوەرە دابەشکراوە، لە تەوەرەی یەکەمدا باسی پەیوەندیەکانی ئەو دوو وڵاتە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە کراوە، تا ساڵی ١٩٨٤و ئەو کێشانە باسکراوە، کە کاریگەریان لەسەر رێرەوی پەیوەندیەکان هەبووە، هەروەها ئاماژە بەرەوش و پرسی کورد کراوە، بە شێوەیەکی گشتی تا ساڵی ١٩٨٤، لە تەوەرەی دووەمدا باسی ئەو پەیوەندیە کراوە لە نێوان ساڵانی (١٩٨٤-١٩٩٨) کە مەسەلەی کورد لە ناویدا تەوەرەی بنەرەتی بووە، هەروەها تیشك خراوەتە سەر دانوستان و رێککەوتنە دوو قۆڵیەکان و مەسەلەی ئاو و پرسی کورد لە نێو پەیوەندیەکاندا، هەروەها رۆشنایی خراوەتە سەر هەوڵەکانی

تورکیا بۆ بەرەنگاربوونەوەی دالدەدانی پارتی کرێکاران کوردستان لە لایەن سوریاوە.

لە نوسینی ئەو باسەدا سود لە کۆمەڵێك سەرچاوە وەرگیراوە بەتایبەتی کتێبەکەی هنری بارکر و محەمەد نورەدین و کتێب و نوسینەکانی د.خلیل علی مراد و چەندانی تر.

## مەسەلەی کورد لە پەیوەندیەکانی سوری-تورکیدا( ١٩٨٤-١٩٩٨ )

## تەوەرەی یەکەم

## ئاوڕدانەوەیەك لە پەیوەندیەکانی تورکی-سوری و ڕەوشی کورد لەم دوو وڵاتەدا پێش ساڵی ١٩٨٤

### ١- ئاماژەیەکی خێرای پەیوەندیەکانی تورکی-سوری لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی تا ساڵی ١٩٨٤:

دوا بەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و سەرکەوتنی هاوپەیمانان و دابەشکردنی قەڵەمڕەوی هەژمونی خۆیان، سوریا کەوتە ژێر باری ماندێتی فەڕەنسا(١٩٢٠-١٩٤٦) سنوری نێوان تورکیاو سوریا بە گوێرەی پەیماننامەی نێوان فەڕەنسا-تورکیا لە ٩ی مارتی ١٩٢١ کە لە لەندەن بەسترا، دەست نیشانکرا، پەیماننامەکە لە ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ بە پەیماننامەی ئەنقەرە هەموارکرا[١] ماددەی یەکەمی کۆتایی بە شەڕی نێوان دوو وڵاتەکە هێناو ماددەی سێیەمی سنوری فەڕەنسای لە تورکیاو سوریا دەست نیشانکرد[٢].

هەموارکردنی دووەمیش بە پەیماننامەی (چوڤنال)ی ساڵی ١٩٢٦ تێیدا هەرێمی هانای (لیوای ئەسکەندەرۆنە) کە زۆرینەی عەرەب بوون درایە تورکیاو سێ ناوچەی کوردنشینیش(عیفرین، گۆبانی و ناوچەی جەزیرە) درایە سوریا[٣].

بەڵام ئەو کێشەیە "لیوای ئەسکەندەرۆنە" مایەوە تا ٢٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٩ پەیمانێك لە نێوان فەرەنساو تورکیا بەسترا و لیوای ئەسکەندەرۆنە بوو بە ویلایەتی شەست و سێیەمینی تورکیاو بە تەواوی بە تورکیا لکا[٤].

وەکو گرێ کوێرەیەك لە پەیوەندی سوریا-تورکیا کێشەکە بەردەوامی هەبوو لە ٣١ی مارتی ١٩٤٩ کاتێك سوپا سالار (حوسنی زەعیم) یەکەم کودەتای سەربازی بەسەر دەسەڵاتی (شوکری قوەتلی) ئەنجامدا، وەرچەرخانێك لە پەیوەندی ئەو دوو وڵاتە ڕوویدا، کاتێك سەرۆکی نوێ ڕایگەیاند: بۆ گەیشتن بە هاوکاری و دۆستایەتی تورکیای دراوسێ دانوستان دەکات و هەوڵ دەدات هاوشێوەی ئەتاتورك: چاکسازی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە سوریا بکات، لە یۆلیۆی هەمان ساڵیشدا وەزیرێکی سوری ڕایگەیاند دەستبەرداری لیوای ئەسکەندەرۆنە دەبێت، پەیوەندی نێوان ئەو دوو وڵاتە تا ئاستێکی زۆر پەرەدەستێنێ[٥].

بەڵام زۆری نەبرد سەرهەنگی سوپا سالاری(ئەدیب شیشکەلی) لە ٢٩ی نۆڤەمبەری ١٩٥١ دەسەڵاتی وەرگرت و دوژمنایەتی ئاشکرای تورکیای دەکرد و پەیوەندیەکان بە شێوەیەکی ترسناك پەرەیسەند لە ڕاگەیاندنەکاندا. دوای نەمانی شیشکلی لەسەر شانۆی دەسەڵات لە ٢٤ی فێبریوەری ١٩٥٤ لەسەر دەستی ئەفسەرە نیشتمانیەکان کێشەکە بە زەقی سەریهەڵدایەوەو بەردەوامی هەبوو[٦].

فاکتەرێکی دیکەی گرژبوونی پەیوەندیەکان ئەو دوو وڵاتە لە ماوەی جەنگی سارددا لە بەرەی دژ بە یەك بوون، هەوڵەکانی تورکیا بۆ چوونە ناو پەیمانی باکوری ئەتڵەسی بە هاوکاری و پشتگیریکردنی ئەمریکا و بەریتانیا "ڕۆژئاوا" بە

گشتی، تا لە ٢١ یولیوی ١٩٥١ ئەنجومەنی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی ڕەزامەندی خۆی نیشاندا[٧].

لە ساڵی ١٩٥٢شدا ئەندامێتی تەواوی دەستەبەرکردو لە ١٩٥٥یش چووە نێو پەیمانی بەغدا "دوای کشانەوەی عێراق لە ١٩٥٨ بوو بەسەنتۆ" بێگومان ئەمریکا ڕۆڵی سەرەکی لەو پەیمانانەدا دەگێڕا[٨].

لە بەرامبەردا سوریا لەو سەردەمەدا پەیوەندی هاوکاری و دۆستانەی لەگەڵ یەکتێتی سۆڤیەت و وڵاتانی ئەوروپای "ڕۆژهەڵات" بونیات نابوو بەتایبەتی لە بواری سەربازیدا، ئەو دابەش بوونەش قەیرانی پەیوەندیەکانی نێوانیان قوڵترکردبۆوە، بەتایبەتی دوای هاتنە سەرکاری حیزبی بەعس لە سوریادا[٩].

هاوکات ئیسرائیل تەوەرەیەکی دیکە بوو لە پەیوەندی عەرەب بە گشتی و سوریا بەتایبەتی لەگەڵ تورکیادا. تورکیا لە ٢٨ی مارتی ١٩٤٩ دانی بە دەوڵەتی ئیسرائیل ناو لە ٩ی مارتی ١٩٥٠ بالیۆزخانەی خۆی لە تەل ئەبیب کردەوە، هەرەچەندە لە دوای هێرشی سێ قوڵی بۆ سەر میسر لە ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٦ لەژێر فشاری ڕای گشتی ئیسلامی تورکیا بالویزی خۆی لە تەل ئەبیب کشاندەوە، بەڵام لە ١٩٥٨ دیدارە نهێنیەکانیان دەست پێدەکاتەوە بۆ مەبەستی هاوکاری و ئاسایش دژی هەڕەشەی ناسری (جمال عبدالناصر) لە سوریادا، هاوکات سەرۆکی ئیسرائیل لە سەردانێکی نهێنی بۆ تورکیادا پەیمانێکی نهێنی بە ناوی (پەیمانی دەوروبەر) بۆ ئامانجی تەوق کردنی سوریاو عێراق دەبەستن[١٠].

هەرچەندە لە شەستەکان و حەفتاکاندا پەیوەندیەکان بەرەو گرژی دەچێت دوای شەڕی حوزەیران/یونیۆی ١٩٦٧و شەڕی تشرینی ١٩٧٣، بەڵام لە دوای ڕووخانی شای ئێران و کودەتای ساڵی ١٩٨٠ بەرەو گۆڕانکاری دەچێت و لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردوش پەیوەندیەکان بەرەو لوتکە دەچێتەوە[١١].

لە بەرامبەردا، ناکۆکی درێژخایەنی تورکی-یۆنانی بە شێوەیەك کاریگەری خۆی لەسەر ڕەوشی پەیوەندی سوری-تورکی هەبوو، دوای کودەتای سەربازی ساڵی ١٩٦٠، قەیران و تەنگژەی پەیوەندیەکانی قوڵتربۆوە کاتێك لە ڕووداوەکانی قوبرسدا لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەنگی لەسەر درا لە ساڵی ١٩٦٤، سوریا لە دژی تورکیا بۆ بەرژەوەندی حکومەتی قوبرس دەنگیدا(١٢).

جگە لە هاوکێشە نێودەوڵەتی و هەرێمایەتیانەی کە وەکو پارسەنگ لە تای تەرازووی پەیوەندیەکاندا هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە مەسەلەی دیکەش کاریگەری هەبووە.

دوای ئەوەی (حافز ئەسەد) لە ساڵی ١٩٧٠ دەسەڵاتی گرتەدەست هەرچەندە هەندێ ئاماژەی خستەڕوو بۆ پەرەپێدانی پەیوەندیەکان لەسەر ئاستی فەرمی دەوڵەت سەردانی ئاڵوگۆڕکرا و لەو ماوەیە مەسەلەی ئەسکەندەرۆن پشتگوێ خرا، بەڵام قۆناغی ئەسەد گرژی زۆری بەخۆوە بینی، لە پێشەوەی هەموو گرژیەکان مەسەلەی ئاوبوو(١٣).

دۆسیەی ئاوی فورات دەگەڕێتەوە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، بەڵام لە حەفتاکاندا گەیشتە پلەیەکی زەق لە ڕەنگڕێژکردنی پەیوەندیەکاندا، کاتێك تورکیا ژمارەیەك بەربەستی لەسەر ڕووباری فورات و لقەکانی دروست کرد، لە چوارچێوەی پرۆژەی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆل "GAP" بێئەوەی ڕاوێژکاری لەگەڵ سوریاو عێراق بکات یاخود ڕێککەوتنێکی پێشوەختەی هەبووبێ، لە کاتێکدا ئاوی فورات نزیکەی (٧٨,٥٪) سەرچاوەو داهاتی ئاوی سوریا پێك دێنێ، جێبەجێکردنی پرۆژەکەو گلدانەوەی ئاوەکەش دەبێتە هۆی کەمبونەوەی بڕێکی زۆر لە ئاوی هاتوو بۆ سوریاو عێراق(١٤).

سوریا ترسی ئەوەی هەیە تورکیا ڕۆژێك لە ڕۆژان بە تەواوەتی ئاوی فوراتی لێبگرێتەوە، ئەم ترسەش لەگەڵ جێبەجێکردنی پرۆژەی (گاپ)دا زیاتر بوو[15].

بەدرێژایی سالآنی شەستەکان و حەفتاکان سەدەی ڕابردوو، سوریا مافی پەنابەری بەخشیوەتە چەند کەسانێك لە کۆمەڵەی گەریلاکانی ئەرمەنی و کوردەکان[16] کە بەرهەڵستکاری تورکیان، تورکیاش بەتیرۆررستیان دادەنێت[17].

بەتایبەتی ئەوانەی دوای کودەتای ١٢ی مارتی ١٩٧١ لە تورکیا ڕایانکردو پەنایان بۆ سوریا برد[18].

لەوێ لە لایەن سوریاوە دالّدەدران، ئیتر مەسەلەی ئاو و ئاسایش لە گۆشەنیگای تورکیاوە پەیوەست بووەو پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان ئەوو دوو کێشەدا هەیە.

لە سەرەتای یۆلیۆی ١٩٧٩دا (عەبدوڵلآ ئۆجەلان)[19]ی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان تورکیا جێدەهێڵێت و ڕوو لە سوریا دەکات، ئیتر کاتێك لە ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ کودەتای سەربازی[20] لە تورکیا ڕوودەدات چەندەها هاولآتی سڤیل بوونە قوربانی و ناوچە کوردیەکان کەوتنە ژێر باری نائاسایی و هەڵمەتی ڕاوەدونان و دەستگیرکردنی و پێشێل کردنی ئازادیە دیموکراسیەکان دەستی پێکرد. بنەماکانی سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و سەرکوتکردنی گەلی کورد لە دەستوری نوێی سەپێنراودا لە ٧ی نۆڤێمبەری ١٩٨٢دا ئاواتی گەلی کوردو کەمینەکانی تورکیای ڕەتکردەوە[21].

پارتی کرێکارانی کوردستان دوای ئەوەی ژمارەیەکیان پەنایان بردە بەر سوریاو لەوێ دالّدەدران، لە ٢٠ی ئوگوستی ١٩٨٢ دووەمین کۆنگرەی خۆی لە لوبنان بەست و بڕیاری گەڕانەوە بۆ ولآت تێکۆشانی چەکداری دا، ئیتر لە شێوەی دەستەو گروپ لە سالآنی (١٩٨٢–١٩٨٤) زۆریان لەسەر سنوری عێراق

ئێران جێگیردەبن ئامادەسازی و پڕوپاگەندەی ئەنجامدانی هەڵمەتی سەربازی دەنێرنە ناوەوەی تورکیا[٢٢].

ئەو پەرەسەندن و پێشهاتانەی ئاماژەمان بۆ کرد، کار لە پەیوەندیە هەرێمایەتیەکان دەکات و لە دیدی تورکەکان دوای ئەو ماوەیە هاوکێشەی ئاو-ئاسایش بڕیار لەسەر پەیوەندی سوری-تورکی دەدات.

**٢- چەرەدەیەك لەسەر ڕەوش و پرسی کورد لە تورکیاو سوریادا تا ساڵی ١٩٨٤:**

**أ- تورکیا:**

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، دۆسیەی کورد لەسەر مێزی دالآنە نێودەوڵەتیەکاندا، لە ناو دانوستانی پەیماننامەو کۆنگرەکاندا تاوتوێ کراو لە هاوکێشەی بەرژەوەندیەکانی هاوپەیمانان و وڵاتانی براوەی جەنگ پێگەی خۆی هەبوو، کاتێکیش کەمالیەکان لە بواری سەربازی و سیاسیدا سەرکەوتنیان وەدەست هێنا، سیناریۆی ماف و چارەنوسی کوردان لە ئەجێندای هاوپەیمانان و لە ١٩٢٣ لە کۆنگرەی لۆزان بەدوماهی هات[٢٣].

کاتێك یەکەمین دەستوری تورکیا لە ٢٠ی ئەپریلی ١٩٢٤ پەسەندکرا، پوختەی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆجیاو ئامانجی ناسیۆنالیزمی تورکی تێدا چەسپێنرا لە ماددەی ٨٨ی هاتبوو: ((هەموو دانیشتوانی تورکیا بەبێ جیاوازی ئاین و نەژاد گشتیان تورکن))[٢٤].

بەمەش هیچ دەرفەتێکی لەبەردەم بوونی نەتەوەی کورد لە کۆماری نوێدا نەهێشتەوە، بەرەنجام لە نێوان ساڵانی ١٩٢٥-١٩٣٩ زنجیرەیەك ڕاپەڕین و شۆڕش باکوری کوردستانی گرتەوەو بە هەزارەها کەسیش بەزۆر لە زێدی خۆیان دوورخرانەوە بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای تورکیاو بە سەدان کەس لە سێدارە دران[٢٥].

هەر بەم هۆیەوەش کارڕاییەکانی دەوڵەتی تورکی بەرامبەر کوردەکان لە نێوان سالآنی (١٩٢٥–١٩٤٥) پرۆسەی ڕاگواستنی زیاتر لە (٤٠٠,٠٠٠) چوار سەد هەزار کوردی لە ناوچەکانی خۆی دەست پێکردو ئەوەش کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر پەرتەوازەبوونی دانیشتوان و پێشکەوتنی کوردستان لە ڕووی ئابوری و کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە[٢٦].

لە ماوەی سالآنی (١٩٤١–١٩٧٩) کۆمەڵێك پێشهات و گۆڕانکاری سیاسی لە ناوەوو دەرەوە دێتە کایەوە، کاریگەری لەسەر ڕەوشی بزوتنەوەو چالاکی کوردان دەبێت لە تورکیادا، توێژەرێك ئەو ماوەیە بە ماوەی (بوژانەوەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی) لە تورکیا وەسف دەکات[٢٧].

هەرچەندە هێڵی فەرمی تورك و هێڵی کورد هەرگیز هاوتەریب و پێك نەگەیشتوو بووە، هێڵی فەرمی تورك درێژەپێدەری ئەو بۆچوونە سواوەبووە کە گوایە کورد لە تورکیا نیەو ئەوەی هەیە تورکی کێوییە، حیزبە گەورەکانی تورکیاش هەرە زۆریان دیدی شۆڤێنیستیان بۆ مەسەلەی کورد هەبوو، پاش یەکەم کودەتای سوپاش لە ساڵی ١٩٦٠ جەنەڕاڵ گورسیلی ڕابەری نوێ لە لێدوانێکی دا بۆ ڕۆژنامەیەکی سویدی گوتی: "ئەگەر ئەو چیایانە بۆ خۆیان ئارام دانەنیشن، سوپا هیچ کەمتەرخەمیەك لە لێدانی شارو گوندەکانیان ناکاو ... ڕووبەڕووی کوشتارێکی تر دەبنەوە"[٢٨].

بەڵام ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەمیشە تورکیا ترسی لە بوژانەوەی هەستی نەتەوەیی کورد لێنیشتووە.

سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەی کورد لە بۆنەی کۆمەڵگای تورکیدا تاڕادەیەك پاشەکشەی کرد، بە گوێرەی دەستوری ١٩٦١ هەندێك لە مافە مەدەنیەکانی تێدا دەستەبەرکراو ئازادیەکانی بە شێوەیەکی ڕێژەیی والآکران، ئەمەش وایکرد

ڕۆشنبیران و دەستەبژێری کورد بچنە ناو ئەو پارتانەی کەمێك لە داخوازیە نەتەوایەتیەکانیان دەستەبەر دەکات بەتایبەتی (پارتی کرێکارانی تورکی) کە محەمەد عەلی قەیدار سەرۆکایەتی دەکرد، بیرۆکەو چالاکی شۆڕشگێڕی کە تورکێکی مارکسی هەبوو سەرنجی گەنج و لاوانی کوردی بۆ خۆی ڕاکێشابوو لەو سەردەمەدا[٢٩].

لە کودەتای ساڵی ١٩٧١، چالاکیە سیاسیەکانی کورد کپ نەکرایەوە، سەرەڕای سەپاندنی باری نائاسایی لەسەر کوردستان و دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی ڕێکخراوە چەپەکان، بەڵام لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم بزوتنەوەی وشیاری نەتەوەیی کوردی لەسەر بنەمای چەپ و کۆمەڵایەتی گەڕایەوە، ژمارەی ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردیانەی کە ئارەزووی جیاخوازی و ئاراستەیەکی مارکسیانەیان هەبوو دەگەیشتە زیاتر لە ١٢ڕێکخراو، ئەوەی زۆرترین کاریگەری و ڕێکخستنی هەبوو پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) بوو[٣٠].

ئیتر بەهۆی پەرەسەندنەکانی حیزبە چەپەکانی تورکی و کوردی ئاژاوەو لەناوبردن و تەنگژەی سیاسی بەردەوام بوو تا کودەتای یولیوی ١٩٨٠و دەسەڵات وەرگرتنی سوپا زیاتر لە ١٧ هەزار کورد خرانە زیندانەکان و باری نائاسایی ڕاگەیەنراو حوکمی عورفی هەموو ناوچە کوردیەکانی گرتەوە، لە ماوەی حوکمی سەربازی (١٩٨٠-١٩٨٣) پارتی کرێکارانی کوردستان بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لە ناوچە سنوریەکان هێرشی دەکردو هەندێ سەربازی تورکی لە ناوچە سنوریەکان کوشت، لەو کاتەوە ناوچە سنوریەکانی عێراقی و سوری و ئێرانی گۆڕەپانی سەرەکی چالاکیەکان پارتی کرێکارانی کوردستان و هەندێ جار هێزەکانی تورکیا بووە[٣١].

ڕەوشەکە مایەوە تا ساڵی ١٩٨٤و ڕاگەیاندنی خەباتی چەکداری لە لایەن پارتی کرێکارانی کوردستانەوە، جگە لە زیانی گیانی تەنگژەیەکی گەورەی ئابووری بۆ تورکیا دروستکردو کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتەدا هەبوو بەتایبەتی لە بواری پەیوەندی هەرێمایەتیدا لە تەوەرەی دوووەم ئاماژەی پێدەکەین.

ب- سوریا:

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و لکاندنی کوردستانی ڕۆژئاوا بە وڵاتی سوریا، ڕەوشی ئەو پارچەیە لە پارچەکانی دیکەی کوردستان چاکتر نەبوو، لە سەرەتادا پرۆژەیەکی فەرەنسی هەبوو بۆ دابەشکردنی سوریا، بەڵام دواتر پرۆژەکە نەچووە بواری جێبەجێکردنەوەو دەسەڵاتدارە فەرەنسیەکان پلانەکەیان گۆڕی، لە سەردەمی دەسەڵاتی فەرەنسیەکان(١٩٢٠-١٩٤٦) کوردەکان هەندێ مافی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریان پیادەدەکرد، وەکو دامەزراندنی کۆمەڵەی ئەدەبی و یانەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و دەرکردنی گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردی[٣٢].

هۆشیاری سیاسی کوردی لەو پارچەیەدا بەهۆی مافی سیاسی نوێ و بزوتنەوە ناسیۆنالیستە کوردیەکان و ڕاپەڕینەکانی پارچەکانی دیکە تورکیاو عێراق و ئێران لەو ماوەیەدا کاریگەربوو، تەنانەت بەشداری لە ڕاپەڕینەکانی ئەو ماوەیەدا کردووە[٣٣].

دوا بەدوای سەربەخۆیی سوریا ١٩٤٦و کشانەوەی فەرەنسا، کورد بەشێکی گرنگ بووە لە پێکهاتەی سوپادا، دوو کودەتا لەو ماوەیەدا ڕوویاندا کە لە ٣٠ی مارتی ١٩٤٩ کە پشتی بە کەمینەکانی ناو سوپا بەست بەڵام پێنج مانگی خایاند بە کودەتایەك ڕوخێنرا، دووەمیش(ئەدیب شیشکلی) لە نۆڤێمبەری ١٩٥١، هەردوو کەسایەتی بەڕەچەڵەك کورد بوون، بەڵام ئەوەی دوایی سوربوو لەسەر

دامەزراندنی دەوڵەتێکی موسڵمانی عەرەبی هەماهەنگ، ئەوەش هەستی کوردو ئەرمەن و ئاشوریەکانی بزواند بەهۆی دەرکردنی ژمارەیەك مەراسیم وەکو ناونانی شوێنە گشتی و تایبەتیەکان بە ناوی عەرەبی و تەنها بەکارهێنانی ئەو زمانە لە دیدارو کۆڕ و ئاهەنگەکاندا[٣٤].

دوای لادانی شیشکلی لە ساڵی ١٩٥٤ هەڵمەتێکی چڕوپڕ، بەڵام بە هێواشی دژی کورد پیادەکرا، سەرەتا پاکسازی لە نێو سوپادا کرا لە ناو هێزی چەکداری ئەفسەرە پلەدارە کوردەکان دوورخرانەوە[٣٥].

لە نیوەی دووەمی پەنجاکانی سەدەی بیستەمیش گڕوتینی ناسیۆنالیزمی عەرەبی ناوچەکەی گرتەوە، بەهۆی پەرەسەندنی هەژموونی ناسرو جەنگی سوێس ١٩٥٦و شۆڕشی ١٩٥٨ی عێراق، ئەو شەپۆلە کە سوریای داپۆشیبوو، کوردەکان ناسنامەی نەتەوەیی و کلتوری خۆیان لەبەردەم هەڕەشەدا بینیوە، لە دوای ٢٢ی فیبرایەری ١٩٥٨ لە ماوەی یەکێتی سوریاو میسر لە ژێر چەتری کۆماری یەککگرتوی عەرەبی، هەڵمەتێکی پڕوپاگەندە دژی کورد بەرپاکرابوو، کوردیان بە داردەستی زایۆنیزم و ئیمپریالیزم دەبەستەوە، ئیتر ناسنامەی کلتوری کوردی زمان و ئاخاوتن و مۆسیقاو گۆرانی کوردی قەدەغەبوون[٣٦].

دوای ڕووخانی کۆماری یەککگرتوو، بۆ یەکەم جار سوریا ناونرا "کۆماری عەرەبی سوری) و ئینکاری هەموو کەمینە نەتەوەیەکی جگە لە عەرەبی کرد، لە مارتی ١٩٦٣ کودەتای بەعس لە سوریا مانگێك دوای کودەتای بەعسی یەکەمی عێراق، هەڵمەتێکی ڕاستەوخۆ دژی دانیشتوانی جەزیرەو ناوچە کوردنشینەکان لەژێر دروشمی "جەزیرە ڕزگار بکەن تا نەبووە بە ئیسرائیلی دووەم" ئەنجام درا[٣٧].

ئیتر سیاسەتی بە عەرەبکردن بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو دەستی پێکرد بە تایبەتی دوای "سەرژمێری نائاسایی" و پڕۆژەکەی "محمد طلب هلال" کە بووە بەرنامەی سیاسی حکومەت لە ١٢ خاڵ پێکهاتبوو پوختەی پڕۆژەکە لەسەر (ڕاگواستن، فەرامۆشکردن، سەندنەوەی شوناسنامە، بڵاوکردنەوەی بێکاری، پەرتکەو زاڵبە، نیشتەجێکردنی کەسان و هۆزی عەرەب و بێبەشکردنی کورد لە کایە سیاسیەکاندا) سیاسیەتێکی شۆڤینی فاشیانە دەرهەق بە کورد دیاری دەکات، ئیتر لە حەفتاکانیش پرۆسەی ڕاگواستن و نیشتەجێکردن و بە عەرەبکردن و گۆڕینی ناوی گوندو شارۆچکەکان و چەوساندنەوەی بەردەوامی هەبوو[٣٨].

## تەوەرەی دووەم

## مەسەلەی کورد لە پەیوەندیەکانی تورکی-سوری دا( ١٩٨٤-١٩٩٨ )

### ١- پرسی کورد"PKK" لە پەیوەندی تورکی-سوری (١٩٨٤-١٩٩١):

مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان بەشێکە لە مێژووی ڕزگاریخواز و ئازادیخوازی کورد، عەبدوڵلا ئۆجەلان لەمبارەیەوە دەڵێت: ((ئەوەی شیدەکرێتەوە سات نیە، مێژووە تاڵ نیە، کۆمەڵگایە، ئەوەی لەسەر پارتی کرێکارانی کوردستان شیدەکرێتەوە، هەم مێژووی کوردە هەم کۆمەڵگایەکەیەتی، بەتەواوی لایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکان(سلبیە وایجابیە)یەوە[٣٩].

لەو ماوە مێژووییەشدا (PKK) دەبێتە تەوەری دەست نیشانکردنی پەیوەندیەکان، دوای ئەوەی ئۆجەلان ڕووی لە سوریا کرد و لەوێ پارتی کرێکارانی کوردستان لەو وڵاتەدا پەناگەیێکی باشی دەستەبەرکرد، بۆ بەکارهێنانی وەکو بنکەی مەشق و ڕاهێنانەکانی سەربازی و خاڵی دەرچوونی چالاکیە سەربازیەکانیان بەرەو تورکیا ئەو کاتە ئۆفیس و کامپەکانی مەشق

کردنی (PKK) لە دیمەشق و دۆڵی (بیقاع) لە لوبنان دامەزران، وا دەبینرا دەسەڵاتی سوریاش بە شێوەیەکی نافەرمی هاوکاری کردون، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە (PKK) سوریاو لوبنانی وەکو بنکەیەك بۆ هێرشی چەکداری بەکارهێنا، ئەوەش وایکرد مەسەلەکە ببێتە بەشێکی گرنگ لە سیاسەتی ناوخۆو دەرەوە (هەرێمایەتی) ئەنقەرەدا[٤٠].

کاتێك لە ساڵی ١٩٨٤، دوای ئەوەی لە ماوەی حوکمی سەربازی تورکیادا(١٩٨٠–١٩٨٣) چەندین هێرشی جیاجیا لە شێوەی دەستەی چەکداری دەکاتە سەر سەربازانی تورك، هێزی ڕزگاری کوردستانی پێکهێناو خەباتی چەکداری ڕاگەیاند[٤١].

لە ١٥ی ئۆگستۆسی ١٩٨٤ یەکەم کردەی سەربازی چەکداری لە شێوەی هێرشکردنە سەر شارۆچکەکانی شرناخ و ئارۆخ شێروان (لە ویلایەتی سێرت)و شارۆچکەی شەمدینی لە ویلایەتی هەکاری، دەست پێکردو ناویان لە کردەوەکەنا (لێبدەو ڕاکە) بڵاوکراوەشیان دابەشکرد و نوسیبویان (ئەوان نەیانتوانی بمانگرن)، لە هێرشی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵیش ژمارەیەك لە هێزەکانی ئاسایشی تورکیان کوشت، لە ناویاندا سێ ئەندامی بەرپرسی تیپی پاسەوانانی سەرۆك کەنعان ئیفرینی تێدابوو[٤٢].

ئەوە سەرەتای ڕاگەیاندنی شەڕێکی درێژخایەن بوو، تەنها ناوچە کوردیەکان باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیای نەگرتەوە، بەڵکو بۆ شارە تورکیەکەی ناوەڕاست و ڕۆژئاوای تورکیاش پەرپەوە[٤٣].

لەو شەڕە دەستەویەخانەدا ژمارەیەکی زۆری گیانی لێکەوتەوە، تەنها لە لایەن پارتی کرێکارانی کوزستان لە نێوان ساڵانی (١٩٨٤–١٩٩١) نزیکەی (٣٠٠٠)

سێ هەزار کوژراو لە (١٩٩١ بۆ ٢٠٠٠)یش زیاتر لە (٣٥٠٠٠) هەزار قوربانی لێکەوتەوە[٤٤].

بە گوێرەی مەزەندەی نوێ ئاماژە دەکات تێچووە داراییەکانی تورکیا بۆ جەنگی دژی (PKK) ساڵانە دەگاتە بڕی (٨)ملیار دۆلار و (٧٥٪)ی سوپای تورکیاش بەو ململانێیەوە سەرقاڵە[٤٥].

سەرچاوە فەرمی و نافەرمیەکانی تورکیا بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە ئاماژە بە سوریا دەکەن، کەوا لە سەرەتای کردەی چەکداریەوە "سوریا هێزی بنەڕەتی هاندەرو پاڵپشتی کردەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بووە"[٤٦].

لە دیدگای هەندێ لە تورکەکان وایدەبینن پارتی کرێکارانی کوردستان هاوکارێکە بۆ دوورخستنەوەی کوردەکانی سوریا بۆ نانەوەی کێشە بۆ (ئەسەد) لە بەرامبەر دابینکردنی پەناگەیێکی ئارام بۆیان[٤٧].

بە گوێرەی ڕاپۆرتی "کۆمەڵەی سیاسەتی دەروەو بەرگرێ (DSA) تورکی، کە لە کۆتاییەکانی ١٩٩٢ ئامادەکراوە، پێی وایە سوریا بەڕەسمی ڕایدەگەیەنێ دژی دەوڵەتی کوردیە، بەڵام لەسەر پشتیوانی کردنی (PKK) بەردەوام، لەبەر ئەوەی دڵنیایە لەوەی تورکیا شتێکی وا بە کوردەکان نادات تا ببێتە سەرمەشقێك بۆ کوردەکانی سوریا[٤٨].

لە لایەکی دیکەوە سوریا بێباك بوو لە یارمەتیدانی ئەو ڕێکخراوە، چونکە(PKK) بەڕاشکاوی باوەڕی بە کوردستان سوریا نەبوو، بەڵکو پێی وابوو ئەوەی کوردی سوریایە ئاوارەو کۆچکردوون، بە درێژایی مێژووی نوێ و هاوچەرخی تورکیا بەرەو سوریا وە دەرنراون[٤٩].

لە بەرامبەردا سوریا نکوڵی لە هاوکاریکردنی (PKK) دەکات و زۆرجار دوپاتی کردۆتەوە کە تورکیا بەڵگەیەکی نیە کە ئەوە بسەلمێنێ، هەروەها

بەرپرسـانی سـوری ڕایاندەگەیانـد، سـوریا نـاتوانێ ڕۆڵـی "پـۆلیس" بگێـڕێ لـە سنوری تورکیادا و ڕێگە لە دزەکردنی ڕەگەزەکانی پارتی کرێکارانی کوردسـتانی دژ بـە ئەنقـەرە بگـرێ، هـەروەها نـاتوانێ ژمارەیـەکی زۆری سـەربازانی لەسـەر سنوری باکوریدا گردبکاتەوە بۆ ڕێگەگرتن لە پەڕینەوەیان[٥٠].

پرۆژەی گەشەپێدانی باکوری خۆرهـەلاتی ئـەنادۆڵ، فرەئامـانج و فرەڕەهەنـد بوو سەبارەت بە تورکیا ستراتیژترین پرۆژەی بوو[٥١].

یەك لە ئامانجەکانی کپ کردنـەوەی جیـاخوازی کوردەکـان بـوو، لـە ناوچـەی کوردەکانیش ئەنجامدرا، لە کۆتایی سـاڵی ١٩٨٦ پەیوەنـدی تـورکی-سـوری بـە شێوەیەکی دراماتیکی زۆر بەرەو گرژی هەنگاوی نا، کاتێك دەسـەڵاتدارانی تـورك پــەردەیان لەســەر بــوونی پلانێــك ڕامــاڵی و ڕایانگەیانــد پلانێــك بــۆ تێکــدانی پێگـەی "بەنـداوی ئـەتاتورك"[٥٢] لـە ئـارادابووە، پاڵپـشتی و هانـدانی سوریاشـی لەگەڵ دابووە[٥٣].

لە پشت ئەو تۆمەتانەوە، داوا لە باڵیۆزی سوریا کرا لە ئەنقەرە کە وڵاتـەکـەی ڕێگە لە دزەکردنی "تسلل" پارتی کرێکارانی کوردستان بگرێ لە پەڕینەوەیان لە سنوری سوری-تورکیدا، ئەو نیگەرانیانە ئارام بوونـەوە کاتێـك سـەرۆك وەزیـران تۆرگۆت ئـۆزال لـە ١٥ی یۆلیـۆی ١٩٨٧ بـە سـەردانێکی فـەرمی گەیشتە سـوریا لەگـەڵ "عەبدولکـەریم قاسـم" گفتوگۆیـان کـرد، هـەروەها چـاوی بـە سـەرۆکی سوری "حافز ئەسەد" کەوت و داوای لێکرد ڕێگە بە "چالاکیەکانی تیرۆرسـتان لـە خاکی سوریا" نـەدرێت، ئەسـەد دوپـاتی کـردەوە لـە خـاکی سـوریاوە ڕێگـە بـە چالاکیان نەدراوەو نادرێ دژی تورکیا[٥٤].

لە ڕاستیدا دروستکردنی بەنداوی مەزنی ئەتاتورك لەسەر ڕووباری فوڕات سوریا بێ بەش دەکات لە نیوەی ئەو بڕە ئاوەی بۆ سوریا دێت و تورکیا دەتوانێ بەنداوەکە وەکو کارتێکی براوە دژی سوریا بەکاربهێنێ[٥٥].

هەر بۆ ئەو مەبەستە سەرۆك وەزیرانی تورکیا تۆرگۆت ئۆزال پرۆتۆکۆلیکی لەگەڵ سوریەکان واژۆکرد کە (ئاو و ئاسایش) تەوەری سەرەکی بوو، لە ١٥ی یۆلیۆی ١٩٨٧ لە دیمەشق، بۆ هاوکاری ئابوری و کۆمەڵێك مەسەلەی گرتەخۆ، بە گوێرەی پرۆتۆکۆڵەکە سوریا ڕەزامەندی نیشاندا ڕێگە نەدات پارتی کرێکارانی کوردستان لە سنوری سوریاوە هێرش بکەنە سەر تورکیا و کەمپەکانی ڕێکخراوەکە لە خاکی خۆی دەربکا، تورکیاش لە لایەنی خۆیەوە بڕیاریدا بڕی (٥٠٠م٣)چرکە مانگانە ئاو بۆ سوریا بەربداتەوە، بەڵام ئەوە چارەسەرێکی کاتی بوو[٥٦].

هەروەها لە مەسەلەی دیاریکردنی بڕە ئاوەکە کێشەی لێکەوتەوە چونکە لە مانگی ئۆگستۆتس و سێپتەمبەر ئەو بڕە ئاوە خۆی بۆ (٢٥٠م٣) دادەبەزێت[٥٧].

هەروەها تورکیا سەرکەوتوو نەبوو لەم ڕێککەوتنەدا، بەڵکو سوریا پابەندی خاڵەکانی نەبوو، لە ئەپریلی ١٩٨٨ پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ ماوەی دوو هەفتە کۆنگرەی خۆی لە (لاذقیة) بەست بە بەشداری (٣٠٠)کەس[٥٨].

هەر دوای ئەوەش سوریا کەمپەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانی لە سوریاوە بۆ (دۆڵی بیقاعی) لوبنانی گواستەوە کە بە کردەوە لەژێر دەستی خۆی دابوو، بەڵام لە دەرەوەی باڵا دەستی یاسایی سوریدا[٥٩].

لە لایەکی دیکەوە ئۆزال مەبەستی بوو لەگەڵ عبدالکریم قاسمدا، ڕێککەوتنامەیەکی هاوشێوەی ڕێککەوتنامەی ئەنقەرە–بەغداد، "ڕێگەدان بە

لێدان و ڕاونانی یاخیگەرە کوردەکان لەو دیوی سنور" ببەستی، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو[٦٠].

کاتێك تورکوت ئۆزال لە سەردانێکی بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵات لە شاری بەتلیس لە ٢٨ی ئۆگستۆسی ١٩٨٩ هۆشداری دایە سوریاو ئێران و عێراق لە پێشکەشکردنی هەر هاوکاریەك بە جیاخوازە کوردەکان، کاتێك گوتی: "هەر دراوسێیەکی تورکیا پاڵپشتی بزوتنەوە جیاخوازەکان (مەبەستی کوردەکان) بێت دەبێت بزانێت سەبرو ئارامی تورکیا سنوری هەیە، ئەو سەبرەش لە خاڵێکی دیاریکراو دەوەستێت" زیاتریش گوتی: "تورکیا دەیەوێت پارێزگاری لە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ سوریا بکات و بە هیواین، بەڵام دەبێت بزانێت چی ڕوودەدات کە سەبرو ئارامی تورك نامێنێ" هەروەها گوتی: "تورکیا بەهێزترین دەوڵەتە لە ڕووی سەربازیەوە ئەگەر پێویست بکات هێزە چەکدارەکانی ئامادەیە سنور ببڕێت و هەموو ڕەگەکانی تیرۆر ریشەکێش بکات"[٦١].

لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ تورکیا ئاوی فوراتی گرتەوە بۆ مەبەستی گلدانەوەو پڕکردنەوەی بەنداوی ئەتاتورك لە ١٣ی یەنایر تاوەکو ١٢ی فیبرایەری ١٩٩٠ ئاوەکەی گرتەوە، لە کاتێکدا سوریا نارەزایی دەبڕی لە دابەزینی ئاستی ئاو و تورکیای بەرپرسکرد بەوەی زیان بە بەروبومی زستانەی کەوتووەو ئاستەنگی لەبەردەم دابینکردنی ئاو بۆ شاری حەلەب دروست کردووە، بێ ئەوەی سوریا هیچ زانیاریەکی لەسەر ئەو پلانە هەبووبێ لە ڕووی هونەریەوە تورکیا لە لای خۆیەوە بیانووی هێنایەوە، کەوا ئەنقەرە مەبەستی فشار نیە لەسەر دراوسێکانی[٦٢].

بەڵام لە ڕاستیدا ئەنقەرە ئاوی وەکو کارتی گوشار بۆ سەر سوریا بەکاردەهێنا دەمێك ئاوی لێدەبڕێ تا هەندێك لە بەنداوەکان پڕبکاتەوە، دەمێکی

تریش دەستی بە دروستکردنی بەنداوی دیکە دەکرد لەسەر ڕووباری فورات لە سەرچاوەی سەرەك دابینکردنی ئاوی سوریایە، مەسەلەی کوردیش لەو نێوەندەدا بەجۆرێك تێکەڵ بە مەسەلەی ئاوکرا بە جۆرێك ناتوانێت باسی یەکێکیان بەبێ ئەوەی دیکە بکەیت(٦٣).

**٢- پرسی کورد لە نێو پەیوەندیەکانی سوری-تورکی لە ماوەی (١٩٩١-١٩٩٨)دا:**

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ساردو هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، زۆر بیروڕا هاتە ئاراوە، کەوا تورکیا هەژمونی جیهانی خۆی لە دەستدەدا چونکە سەرچاوەی ڕۆڵی تورکیا لە هاوپەیمانێتی ڕۆژئاوا دژ بە سۆڤیەت هاتبوو، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانە هەڵسەنگاندنێکی ڕووکەشی بوون بەرامبەر بایەخی تورکیای ستراتیژی و جیۆپۆلەتیکی لە ناوچەکەدا(٦٤).

هەروەها تورکیا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك دەرفەت و هەل بۆوە، لە چاو ئەوەی ڕووبەڕووی گرفت بێتەوە، بەڵکو پێگەو سەنگی خۆی لە ناوچەکەدا مایەوە بە شێوەیەکی بەهێز لە جاران(٦٥).

هەروەها سوریا بە لە دەستدانی چەتری سۆڤێتی هۆکارێکی گرنگی خۆپاراستنی هەرێمی لەدەستدا، لەوانەش پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیادا(٦٦).

هەرچۆنێك بێت لەو ماوەیەدا دۆسیەی کوردی و مەسەلەی ئاو و پەیوەندیەکانی نێوان تورکیا-سوریا لە نێوان بەرپرسەکانی ئەو دوو وڵاتە زیاتر لە جارێك خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە، سوریا بەردەوام پشتگیری خۆی بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان بەکارهێنایەوە وەکو ئامرازێك بۆ فشار لەسەر تورکیا، لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی کەنداودا لە ساڵی ١٩٩١ سوریا جارێکی تر سنوری دیاریکراوی لەسەر چالاکیەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان دانا کە لە سوریاوە ئاراستە دەکران(٦٧).

لە ئەپریلی ١٩٩٢ وەزیری دەرەوەی تورکی سەردانی دیمەشقی کردو چاوی بە سەرۆکی سوری حافز ئەسەد کەوت و کۆمەڵێك بەڵگەی پێشکەش کرد لەوانە:

١- ئۆجەلان تا ئێستا لە دیمەشق نزیك مزگەوتی سەلاحەدین ئەیوبی دەژین، رەگەزەکانی هەواڵگری سوری بۆ پاسەوانێتی شەونخونی دەکەن.

٢- هەواڵگری سوریا پارەو کەرەستەو ناسنامەی ساختە پێشکەش بە (PKK) دەکات.

٣- سوریا رێگەی داوە بە سازدانی کۆبوونەوەو دیدارو کۆنگرەکانی رێکخراوی (PKK) لەسەر خاکی خۆیدا، لە رێکەوتی جیاجیادا.

٤- سوریا رێگەی بەبوونی کامپەکانی (PKK)و مەڵبەندەکانی راهێنانی لە دۆڵی بیقاع داوە، موشەکی زەمین-ئاسمانی(ارض-جو) لە جۆری (SAM-٧) بۆ دابینکردوون بۆ ئەوەی پارێزگاریان بکات.

٥- سوریا هاوکاری بە (PKK) دەبەخشێ، لەو کۆگایانەی چەك و تەقەمەنی نزیك سنوری تورکیا.

٦- سوریا رێگەی داوە بە دروستکردنی ئێزگەیەکی پەخشکردن لە دووری (٧٢کم) لە دیمەشق[٦٨].

ئیتر سەردانەکە لە رووی بڕیارەوە سەرکەوتووبوو، کاتێك رێککەوتنێکی ئاسایشی لە نێو هەردوولا واژۆکرا لە ١٧ی ئەپریلی ١٩٩٢ رێککەوتن لەسەر دژایەتی و پرۆتستۆکردنی تیرۆر، رێککاری تایبەت وەربگرن و رێگە نەدەن نەوایەك (مأوی) یاخود دەروازەیەك بۆ چالاکیەکانی تیرۆر دژی یەکتر لە خاکی ئەو دوو وڵاتە دابین بکرێت، هەروەها رێگە لە پەڕینەوەی ناشەرعی (بە قاچاخ) بگیرێت بە درێژایی سنوری هەردوولا، زانیاری و بەڵگەنامەکان ئاڵوگۆڕ بکرێن کە هاوکاری دەستگیرکردنی تاوانکاران دەکات، لایەنی سوری دووپاتی کردەوە کەوا

پـارتی کرێکـاران کوردسـتان رێکخراوێکـی ناشـەرعیە (یترۆریـستیە)، ئەنـدامانی پارتەکە لە دوای دەستگیرکردنیان دەدرێنە دادگاکان[٦٩].

دوای ئەوە (عیسمەت سەزگین)ی وەزیری دەرەوە ڕایگەیاند "لـەو بـاوەڕدانیم سوریا لە پشت تیرۆر(PKK) بێت"[٧٠].

لـە ئۆگـستۆسی ١٩٩٢ (حیکمـەت چـەتین)ی وەزیـری دەرەوەی تـورکی سەردانێکی فەرمی سوریای کرد، بۆ بەدواداچوونی ئەنجامـەکانی رێککەوتنەکـەی (سـەزگین) لـە پێـشوودا، لـە کـانونی دووەمـی ١٩٩٣ سـەرۆك وەزیـران تـورکی سەردانی دیمەشقی کرد و دووبـارە کێـشەی ئـاو و پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان تاوتوێ کران[٧١].

لە ڕاستیدا دانوستان و رێککەتنەکان بەرهەمێکی نـەبوو، چـەند مانگێـك دوای رێککـەوتنی ئـەپریلی ١٩٩٢، پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان کـەمپێکی نـوێی لـە دووری (٢٠کم) لە ڕۆژئاوای دۆڵی بیقاع نزیك شارۆچکەی "بار إلیـاس"ی لوبنـانی دامەزراند[٧٢].

لە ماوەی ساڵانی (١٩٩٣–١٩٩٨) ئۆجەلان سێ جاران ئاگربڕی یـەك لایەنـەی ڕاگەیانـدوەو خوازیـاری چارەسـەری ئاشـتیانە بـووە لەگـەڵ ئەنقـەرەدا (مـارتی ١٩٩٣، دیـسێمبەری ١٩٩٥، سـبتێمبەری ١٩٩٨) بـەڵام تورکیـا هەمیـشە ئـەو خواستەی ڕەتکردۆەوە[٧٣].

پەرەسەندنە سیاسیەکانی لە تورکیادا لە پەیوەندی لەگەڵ سوریادا، داخوازی ڕادەستکردنی ئۆجەلان، لەو ماوەیەدا پەرەیسەندبوو، ئـەو پەرەسـەندنانە سـاڵی ١٩٩٤ گەیشتە لوتکە کاتێك تورکیا کردەیـەکی سـەربازی دژی پـارتی کرێکـارانی کوردستان لـە خـاکی سـوریدا ئەنجامـدا، کـە بـووە هـۆی کوشـتنی ٣١ کـورد لـە هەڵمەتەکەدا[٧٤].

لەماوەی ساڵانی (١٩٩٣-١٩٩٥) چەند ئاماژەیەکی دڵخۆشکەر هەبوو بۆ تورکیا، کاتێك سوریا پارتی کرێکارانی کوردستانی وەك ڕێکخراوێکی تیرۆرستی ناساند، ئەندامانی دەستگیر دەکردو ڕەوانەی تورکیای دەکردنەوە، بەڵام ڕەتیکردەوە عەبدوڵلا ئۆجەلان ڕادەستی تورکیا بکاتەوە، هەر بۆیە پەیوەندیەکانیان دەگەیشتە بنبەست[٧٥].

هەر لەو ماوەیەدا دامەزراندنی بنەمای پەیوەندی-ئیسرائیلی لە بواری هاوکاری ئاسایش و سەربازی لە ئارادابوو، تەنانەت ساڵی ١٩٩٤ (تانسۆچیلەر)ی سەرۆك وەزیرانی تورکی بە هاوکاری لەگەڵ ئیسرائیل خەریکی ئامادەکردن و جێبەجێکردنی پلانی تیرۆرکردنی ئۆجەلان بوون، تورکیا لە ڕێگەی وێنەکانی مانگی دەستکردنی دەزگای هەواڵگری جولەکە "موساد"ەوە، کەمپەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانیان لە بیقاع کێشابوو، بەڵام چیلەر لە ساتی کۆتایی پلانەکە بەهۆی ناکۆکیەکانی سیاسەتی نێوەخۆو تۆمەتبارکردنی بەدەست خستنە سەر خەزێنەی گشتی، پلانەکەی ڕەتکردەوە[٧٦].

ئەوەی زیاتر بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندیەکانی سوری-تورکی، واژۆکردنی ڕێککەوتنامەیەك بوو لە لایەن تورکیاوە لەگەڵ کۆمەڵێك کۆمپانیای بیانی لە ١٩ی نۆڤەمبەری ١٩٩٥، بۆ بیناکردنی بەنداوی گەورەی "بیرجیل" نزیك سنورەکانی سوریا، ئەوەش لە سەردەمی تانسۆچیلەر دابوو، کە بەوە ناسرابوو دوژمنی عەرەبەو حەز بە نزیك بوونەوە لە ئیسرائیل دەکات[٧٧].

لە ٦ی مایسی ١٩٩٦ لە دیمەشق ئۆتۆمبیلێکی بۆمبڕێژکراو لە نزیك ئەو شوێنەی مەزەندە دەکرا ئۆجەلانی لێبێت تەقێنرایەوە، دەسەڵاتدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان ڕایگەیاند تورکیاو ئیسرائیل هەندێ کەسانی هەواڵگری سوری بەو کارە هەستان و ئەنجامیاندا[٧٨].

لەگەڵ نەرمی نواندنی ئۆجەلان لە بەرامبەر ئەو دوو دەوڵەتەدا، لە لایەک ئاگر بەستی ڕاگەیاندبوو پەیوەندی خۆشی لەگەڵ سیاسەتی سوری هاوتەریب کردبوو کاتێك ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٩٦ لە دیدارێکیدا گوتبووی کوردەکانی لە سوریا دەژین بە گەڕانەوەیان بۆ باکور دڵشاد دەبن(٧٩).

بەڵام پەرەسەندنەکان بە شێوەیەکی مەترسیدار، لە نێوان تورکیاو سوریادا بەڕێوەدەچوو، لە ماوەی سالانی (١٩٩٤ تا قەیرانی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨) تۆمەتەکان و هەڕەشەکانی تورکیا دژی سوریا بەردەوام بوو بەهۆی مەسەلەی (PKK) لە سوریاوە، پەرەسەندنەکان زۆرتر بە ئاراستەیەکی خراپ داڕۆیشت کاتێك هاوپەیمانی تورکی–سەهیۆنی لە فبرایەری ١٩٩٦ بەسترا، ئەو تەنگژەیە لە مایۆی ١٩٩٦ گەیشتە پۆپە لە لێواری ڕووبەڕووبونەوەیەکی سەربازیدا بوون و سوپاکانیان لەسەر سنور کۆکردەوە، هەندێ لەو وڵاتانەی پەیوەندی باشیان بەم دوو وڵاتە هەبوو کەوتنە جووڵە بۆ نەهێشتنی ئەو بارگرژیە، لە دیارترین ئەو وڵاتانە هەوڵەکانی میسر و ئێران بوون(٨٠).

ئامانجی تورکیا دژایەتی کردنی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو کە پێی وابوو سوریا سەنتەری تیرۆر لە دژی تورکیا، هەروەها گەمارۆدانی سوریا بوو لە شێوەی نیوە بازنەیەکدا، لەبەرەنجامدا تورکیا توانی سوود لە تەکنۆلۆجیای سەربازی و ئەزموونی ئیسرائیل وەرگرێ(٨١).

لە هاوینی ١٩٩٦ سەرۆك کۆماری تورکیا (سلیمان دیمیریل) ئاماژەی کرد کەوا پاڵپشتی سوریا بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان، بە شێوەیەکی ڕوون دیارە شێوەیەکی چەسپاوی هەیە، هەروەها تورکیا بەڵگەی لایە سەرکردەکانی ئەو ڕێکخراوە تا ئێستا لە ناوچەکانی سوریاو دەوروبەری دەژین، ئەو ناوچانەی لەژێر

دەستی سوریادان، ئیتر ئەو دانوستان و ڕێککەوتنانەی سوری–تورکی کە هەبوون بێ بەروبوم مانەوە[٨٢].

هەروەها سوریا بابەتی سیاسەتی ئاوی تورکی و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئیسرائیل دووپات دەکردەوە، کاتێک سوریا تورکیای تاوانبارکرد بەوەی مانۆڕێکی هاوبەشیان لە کەنارەکانی سوریا لەگەڵ کیانی سەهیۆنی ئەنجامداوە، تورکیا تۆمەتی هاوکاریکردنی تیرۆر و داڵدەدانی عەبدوڵلا ئۆجەلانی کردەوە بیانوو وەڵامی دایەوە، لە ٢٦ی ئۆگستۆسی ١٩٩٧، تورکیا ٩ گەریلای بۆ ڕۆژنامەنوسان خستەڕوو، ئەوانە چەکداری پارتی کرێکارانن و هەڵگری ڕەگەزنامەی سورین لە باکوری عێراق بە دیلمان گرتوون[٨٣].

هەر لەمبارەیە تورکیا ئاستی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ سوریا بەڕێژەی دەستبەرداربوونی سوریا لە هاریکاری پارتی کرێکاران پێوانەکرد[٨٤].

لە سەرەتای یۆلیۆی ١٩٩٨ ئەنقەرە هەرەسهێنانی دیدارەکانی ئاشکراکرد کەوا لە نێوان (عدنان عمران)ی جێگری وەزیری دەرەوەی سوری و (اسماعیل جم)ی وەزیری دەرەوەی تورکیا بۆ کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە پەیوەندیەکانیان لە ئارادابوو، (جم) ڕایگەیاند بەدوای داخوازی (فاروق الشرع) ناچێ کەوا سەردانی سوریا بکات بەڵکو سەردانی ئیسرائیل دەکات[٨٥].

لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ تورکیا سوریای تۆمەتبارکرد بە: پشتگیری کردنی تیرۆر، داڵدەدانی ئۆجەلان و فەراهەمهێنانی سەربازگەی ڕاهێنان بۆ (PKK)، لەمبارەیەوە ئاریشەیەکی سیاسی ئاڵۆز سەریهەڵدا، پاش ئەوەی دیمیریل ڕایگەیاند تۆڵە لە سوریا دەکاتەوە، هەروەها سوپا سالار بە ئاشکرا گوتی: تورکیا لە باری شەڕێکی ڕانەگەیاندراو دایە لەگەڵ سوریا. ئیتر مۆڵەتی (٤٥)ڕۆژی بە سوریادا بۆ بەدەستەوەدانی ئۆجەلان، سوپا کەوتبووە ئامادەباشی و لەسەر

سنوری سوریا مۆڵ ببوو، سوریا درکی بە بەهێ‌ی سوپای تورکیاو هاوپەیمانی کردبوو، ئەنجام ڕێککەوتنامەی (ئەدەنە) لە ٢١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ی لەگەڵ تورکیا واژۆکردو بڕیاریدا تەواوی سەربازگاکانی (PKK) لەناو خاکەکەی دابخات و ڕێگە نەدات خاکەکەی بۆ هێرشکردنە سەر تورکیا بەکاربهێنرێت، لەوەش زیاتر سەرکردەکانی دەربکات، تورکیاش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە ڕێگا بە هیچ چالاکیەك دژی سوریا لەناو دەوڵەتەکەی نەدات[٨٦].

بەم شێوەیە دەبینین حافز ئەسەدو دەسەڵاتی سوری کوردیان زیاتر لە جارێك لە ڕێگەی پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ مەبەستی بەرژەوەندیەکانیان بەکارهێنا، دوای ماوەی (١٨)ساڵ پەیوەندی دۆستایەتی، لەژێر هەر بیانوویەك بێت سەرۆکی ڕێکخراوەکەیان وەدەرنا، کۆتایی سیناریۆکەش لە فبرایەری ١٩٩٩ لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانی تورکی و جیهانی بە نیشاندانی ڕێبەری پەکەکە بەدەست و چاوبەستراوی بە کۆتایی هات.

# ئەنجام

– دۆزی کورد لە تورکیاو سوریادا کاریگەری لەسەر ئاراستەی پەیوەندیەکان هەبووە، سیاسەتی ناوخۆی ئەو دوو وڵاتە نکوڵی کردنە لە مافەکانیان و هەر لایێك بە شێوازێك مامەڵەی لەگەڵ ئەو پرسەدا کردووە.

– تورکیاو سوریا کۆمەڵێك کێشەی مێژوویی، لە سەرەتای دروستبوونیانەوە هەبووە، بەڵام لە دوای هەشتاکانی سەدەی بیستەم پرسی کورد ڕۆڵی کاریگەری گێڕاوە بۆ گرژبوون و ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکان.

– لە پەیوەندیەکاندا فاکتەری ئاو (کە خۆی لە دروست کردنی بەنداوەکاندا دەبینێتەوە لە تورکیا)و فاکتەری ئاسایش) کە خۆی لە داڵدەدانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە سوریا) دەبینێتەوە، لە ماوەی (١٩٨٤–١٩٩٨)دا گرێ کوێرەی ئاڵۆزی پەیوەندیەکان بووە و هەمیشە دووانەی (ئاو) (ئاسایش) هاوکێشەو تای تەرازوو بووە.

– لە دوای هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەت، تورکیا بەهێزتر لە جاران فشاری خستە سەر سوریا، لە کاتێکدا هەندێ چاودێر لەو باوەڕەدا نەبوون.

– پەیوەندی (PKK)و سوریا پەیوەندیەکی ئاڵۆز بووە، سوریا زیرەکانە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، لە کاتێکدا دەستی لێ هەڵگرت خۆی لە ئافاتی شەڕێکی بێهودەو ناهاوسەنگ دوورخستەوە.

– تورکیا لەگەڵ نێو دەوڵەتی و هەرێمایەتیەکان سەرکەوتوو بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی توانی ڕێککەوتنامەی هاوکاری ئەمنی و ئابوری لەگەڵ ئیسرائیل ببەستێ و توانا هەواڵگریەکانی ئیسرائیل بۆ بەرژەوەندی ستراتیجی خۆی بخاتە گەڕ کە خۆی لە چاودێری کردنی پارتی کرێکاراندا دۆزیەوە.

– سەرەڕای هەموو ناکۆکیەکان کۆبوونەوەی سێ قۆڵی لەسەر پرسی کورد هەبووە کاتێك لە پارچەیەك کوردەکان هێزیان هەبوویێت،، تورکیا مەبەستی نەبووە لەگەڵ (PKK) ئاشتی سازبکات.

## پەراوێزەکان

١- درية عوني: الأكراد، (القاهرة: ١٩٩٩)، ص٢٢١.

٢- حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية في الشرق الأوسط، (مصر: ١٩٩٢)، ص٣٥٠.

٣- درية عوني: م.ن، ص٢٢١.

٤- عوسمان عەبدولڕەحمان سمایل: کورد لە سوریا(١٩٢٠-١٩٤٦)، (دهوك: ٢٠٠٩)، ل٢٨.

٥- أحمد عبدالعزيز محمود: تركيا في القرن العشرين: دراسة جغرافية سياسية، (أربيل: ٢٠١١)، ص١٩٤.

٦- م.ن، ص١٩٥.

٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: أحمد نوري النعيمي: تركيا وحلف شمال الأطلسي، (بغداد: ١٩٨١)، ص ص١١٥-١٣٧.

٨- سالار ارسي ويوسف ابراهيم الجهماني: تركيا وأمريكا، (دمشق: ٢٠٠٠)، ص١٦.

٩- لوقمان محەمەد: تورکیا چۆن جەنگی خۆی لەگەڵ سوریا کۆتایی پێهێنا، (گۆڤاری گوڵان)، ژمارە(٢٠٠)، ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨.

١٠- يوسف ابراهيم الجهماني: تركيا واسرائيل، (دمشق: ١٩٩٩)، ص ص٥٤-٥٥.

١١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: يوسف ابراهيم الجهماني: م.ن، ص ص٥٦ ومابعدها. محەمەد نورەدین: تورکیا لە سەردەمی گۆڕاندا، و.ئازاد بەرزنجی، (سلێمانی: ٢٠٠٠)، ل ل٤٠٦-٤١٦.

١٢- ابراهيم الداقوقي: فلسطين والصهيونية في وسائل الاعلام التركية، (بغداد: ١٩٨٧)، ص٨٢. أحمد عبدالعزيز: م.س، ص١٩٦.

١٣- محەمەد نورەدین: س.پ، ل٤٠١.

١٤- خليل علي مراد: العلاقات السورية-التركية في ضوء أزمة أوجلان، تشرين أول/أكتوبر ١٩٩٨، مجلة أوراق تركية معاصرة، (مركز الدراسات التركية-جامعة الموصل: ٢٠٠١)، ع/١٦، ص٧٢.

١٥- محەمەد نورەدین: س.پ، ل٢٤٢.

١٦- مەبەست لە ڕێکخراوی ئەزالای (Asala)ی ئەرمەنی و پارتی کرێکارانی کوردستان(pkk)یە.

١٧- هیریەت مونتگومری: کوردی سوریا: بونێکی نکوڵی لێکراو، و.مینەو پێشەوا، (چاپخانەی ڕەنج)، سلێمانی: ٢٠٠٩، ل١٨٤.

١٨- محەمەد نورەدین: هـ.س، ل٤٠١.

١٩- لە ساڵی ١٩٤٨ لە دەڤەری شانلی ئورفە لە دایك بووە، زانستە سیاسیەکانی لە زانکۆی ئەنقەرە خوێندووە، لە ساڵی ١٩٧٣ کۆمەڵەیەکی ماویزمی لە کوردو تورك دامەزراندوە، لە ٧ی تشرینی

یەکەمی ١٩٧٨ پارتی کرێکارانی کوردستانی دامەزراند؟ (pkk) ناسراوە، ئەو پارتە لە ١٩٨٤ یەکەم چالاکی سەربازی وەکو شۆڕش دژی تورکیا ڕاگەیاند، لە ساڵی ١٩٨٥ تورك هێزی پاسەوانانی گوندی دژی (pkk) دامەزراند، دوای ئەوەی لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ سوریای جێهێشت و پەنای بردە چەند وڵاتێك لە ناوەڕاستی شوباتی ١٩٩٩ بە کردەیەکی هەواڵگری دەستگیرکرا. بڕوانە: کورد گەلی خۆخۆری بەشخوراو: چەند لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شیکارە، و.بەرزان مەلا تەها، (سلێمانی: ٢٠٠٩)، ل ل١٢٣-١٢٧( لە نوسینی صلاح عصام أبوشقراو).

٢٠- بۆ زانیاری پتر لەسەر کودەتای ١٩٨٠ بڕوانە: ابراهیم خلیل أحمد و خلیل علي مراد: ایران وترکیا، (جامعة الموصل: ١٩٩٢)، ص ص٣٠٢-٣٠٤.

٢١- جبار قادر: قضایا کردیة معاصرة: کرکوك-الانفال-الکرد وترکیا، (دار اراس للطباعة والنشر)، (أربیل: ٢٠٠٦)، ص٢٠١-٢٠٢.

٢٢- حەسەن جودی: مێژووییەك لە ئاگر: نهێنی خۆڕاگری بزوتنەوەی ئاپۆچی دیمانەیەك لەگەڵ جەمیل بایك، لە بڵاوکراوەکانی کۆمیتەی ڕاگەیاندنی (پ.ج.د.ك)، ٢٠٠٨، ل ل٧١٢-٧١٣.

٢٣- بۆ زانیاری پتر لە مەڕ پەیماننامەو کۆنگرەکانی ئەو ماوەیە (١٩١٨-١٩٢٣)، بڕوانە: شوان محەمەدئەمین تەها خۆشناو: دۆزی کورد لە کۆنگرەی ئاشتی تا لۆزان (١٩١٩-١٩٢٣)، گۆڤار(K٢١)، ژ(٩)، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل ل١٠٥-١٢٧.

٢٤- م.ئە.حەسرەتیان: یاسا دەستوریەکانی تورکیاو کورد لە سەردەمی نوێدا، و.دلێر ئەحمەد، (سلێمانی: ٢٠٠٧)، ل٨.

٢٥- بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو ماوەیە بڕوانە: ڕۆبەرت ئۆلسن: ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، و.ئەبوبەکر خۆشناو، (دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم)، (سلێمانی: ١٩٩٩)، ل١٧٥ و لاپەڕەکانی دواتر. عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاری کوردستان، چ٣، (سلێمانی: ١٩٩٨)، ل ل١١٧-١٣٨.

٢٦- مارف عومەر گوڵ: جینوسایدی گەلی کورد: لەبەر ڕۆشنایی تازەی نێودەوڵەتاندا، (سلێمانی: ٢٠٠٦)، ل٧٠.

٢٧- بڕوانە: دیڤید مکدول: تاریخ الأکراد الحدیث، ت.راج آل محمد، دار الفارابي، (بیروت: ٢٠٠٤)، ص٥٩١ ومابعدها.

٢٨- فەرۆز ئەحمەدو ئەوانی تر: تورکیا نەبەرد لە پێناوی مانەوەدا، (سلێمانی: ٢٠٠٦)، ل ل٢٦٢-٢٦٣.

٢٩- بیار مصطفی سیف الدین: موقف الحکومة الترکیة من حزب العمال الکردستاني(١٩٨٣-١٩٩٣)، گۆڤاری توێژینەوە، ژ(١٠)، ئاداری ٢٠٠٧)، ل١٨٢.

٣٠- بيار مصطفى سيف الدين، م.س، ص١٨٢.

٣١- بيار مصطفى سيف الدين: تركيا وكوردستان العراق "الجارين الحائرين"، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، (أربيل: ٢٠٠٨)، ص ص١٣٩-١٤٠.

٣٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جود ملا: كردستان والكرد: وطن مقسم وأمة بلا دولة، تقديم: جما نبز، (دار الحكمة، (لندن: ٢٠٠٠)، ص ص٧٧-٧٨. عوسمان عەبدولڕەحمان سمایل: س.پ، ل ل٩١، ١١٥، ١١٨.

٣٣- هێریەت مونتگومری: س.پ، ل٤٠.

٣٤- ديفيد مكدول: تاريخ الاكراد الحديث، ت.راجع آل محمد، دار الفارابي، (بيروت: ٢٠٠٤)، ص٧٠٠.

٣٥- ديفيد مكدول: م.س، ص٧٠٠.

٣٦- هێریەت مونتگومری: س.پ، ل ل٤٩-٥١.

٣٧- ديفيد مكدول: م.ن، ص٧٠٠.

٣٨- سەبارەت بە سەرژمێری ناثاسایی و پرۆژەکەی محمد گلب هلال بڕوانە: مارف عومەر گول: س.پ، ل ل٩٠-٩٩.

٣٩- عەبدوڵلا ئۆج ئالان: بەرگریکردن لە گەلێك، وەرگێڕانی لە تورکیەوە: لوقمان عەبدوڵلا، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕاگەیاندنی (پ.چ.د.ك)، چ١، چاپخانەی ڕەنج، ل٣٧٩.

٤٠- هێریەت مونتگومری: س.پ، ل١٨٥.

٤١- نەورۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: تورکیا نەبەرد لە پێناوی مانەوەدا، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، (سلێمانی: ٢٠٠٦)، ل٢٦٥. ديفيد مكدول: م.س، ص٦٢٨.

٤٢- ديفيد مكدول: م.س، ص٦٣٠.

٤٣- خليل علي مراد: العلاقات السورية-التركية...، م.س، ص٧١.

٤٤- حەمید بۆز ئەرسەلان: مێژووی تورکیای هاوچەرخ، و.نەجاتی عەبدوڵلا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠٠٩)، ل١٢٩.

٤٥- هنری بارکی وآخرون: القضية الكوردية في تركيا، ت.هظال، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، (أربيل: ٢٠٠٧)، ص٩٦.

٤٦- خليل علي مراد: م.ن، ص٧٢.

٤٧- هنري باركي وآخرون: م.س، ص١٠٠.

٤٨- محەمەد نورەدین: س.پ، ل٤٠٢.

٤٩- هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم، پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا(١٩٩١-١٩٩٨)، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، (سلێمانی: ٢٠٠٧)، ل١٤٣.

٥٠- خليل علي مراد: م.س، ص ص٧٢-٧٣.

٥١- بۆ زانیاری دەربارەی وردەکاری پرۆژەکە بڕوانە: محمد نورەدین: س.پ، ل ل٢١١-٢٣٦.

٥٢- ئەو بەنداوە ئەلقەی سەرەکی پرۆژەی گاپ لە ساڵی ١٩٨٢ بەردی بناغەی دانرا، لە یۆلیۆی ١٩٩٢ لەگەڵ وێستگەی کارۆئاویەکەیدا کرایەوە، لە ئاهەنگی کرانەوەی (٢٩) دەوڵەت بەشداربوون لە نێوانیاندا سوریا بوو. بڕوانە: محەمەد نورەدین: هـ.س، ل٢١٦.

٥٣- جلال عبدالله معوض: اورهان كولوغلو وآخرون: العلاقات العربية-التركية: حوار مستقبلي: بحوث ومناقشات الندوة الفكرية التي نظمها مركز دراسات الوحدة العربية، (بيروت: ١٩٩٥)، ص٢١٢.

٥٤- خليل علي مراد: م.س، ص٧٣.

٥٥- جيرارد جالديان: المأساة الكوردية، ت.عبدالسلام النقشبندي، دار ارارس للطباعة والنشر، (أربيل: ٢٠٠٧)، ص١٥٧.

٥٦- علي احسان باغيش: اورهان كولوغلو وآخرون: م.س، ص١٧٥. خليل علي مراد: العلاقات السورية...، ص٧٣. هنري باركر وآخرون: م.س، ص١٠٠.

٥٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەمەد نورەدین: س.پ، ل ل٢٣٦-٢٣٧.

٥٨- ديفيد مكدول: م.س، ص ص٦٣٧-٦٣٨.

٥٩- هنري باركر وآخرون: م.س، ص ص١٠٠-١٠١.

٦٠- جرجيس حسن: تركيا في الاستراتيجية الأمريكية بعد سقوط شاه، (د.م: ١٩٩٠)، ص ٦٣.

٦١- جرجيس حسن: م.س، ص ص٦٣-٦٤.

٦٢- علي احسان ياغنيش: اورهان كولوغلو وآخرون: م.س، ص١٧٥.

٦٣- محەمەد نورەدین: س.پ، ل٤٣١.

٦٤- احسان غوركان: اورهان كولوغلو وآخرون: م.س، ص٥٨٨.

٦٥- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گراهام فۆللەر و ئەوانی تر: جیۆپۆلەتیکی نوێی تورکیا: ئاسیای ناوەند، بەلقان، کورد، و.عەتا قەرەداغی، (سلێمانی: ٢٠٠٦)، ل ٧٣-٨٠.

٦٦- محەمەد نورەدین: س.پ، ل٢٠.

٦٧- گراهام فۆللەرو ئەوانی تر: هـ.س، ل١٣٢.

٦٨- هنري باركر وآخرون: م.س، ص١٠١.

٦٩- خليل علي مراد: م.س، ص ص٧٣-٧٤.

٧٠- هنری باركر وآخرون: م.ن، ص١٠١.

٧١- خليل علي مراد: م.٠، ص٧٤.

٧٢- هنری بارکر وآخرون: م.س، ص١٠٢.

٧٣- صلاح عصام أبوشقرا، دیارترین وێستگەکانی خەباتی نەتەوەیی کورد لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە، کتێبی: کورد گەلی خۆخۆری بەشخوراو، و.بەرزان مە تەها، (سلێمانی: ٢٠٠٩)، ل١٢٥.

٧٤- خلیل علي مراد: م.ن، ص٧٤.

٧٥- هێریەت مۆنتگومری: س.پ، ل١٨٧.

٧٦- بڕوانە: یوسف ابراهیم الجهماني: ترکیا واسرائیل، ص٨٧.

٧٧- محەمەد نورەدین: س.پ، ل٤٣١.

٧٨- بڕوانە: حسن جودی: س.پ، ل ل٤٨٤-٤٨٨.

٧٩- دیڤید مکدول: م.س، ص٧١٤.

٨٠- خلیل علي مراد: م.س، ص٧٤.

٨١- هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: س.پ، ل ل١٤٤-١٤٥.

٨٢- هنری بارکر وآخرون: م.س، ص١٠٢.

٨٣- خلیل علي مراد: م.س، ص٧٥.

٨٤- هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: س.پ، ل١٤٥.

٨٥- خلیل علي مراد: م.ن، ص٧٥.

**٨٦- خليل على مراد: دوافع التحالف التركى الصهيونى، مجله دراسات العربيه، العدد الپانى، السنه الاولى ١٩٩٩، ص٧١. هێرش عەبدوڵلا: س.پ، ل ل١٤٥-١٤٦. هێریەت مونتگومری: س.پ، ل ل١٨٧-١٨٨.**

## لیستی سەرچاوەکان

### أ- بەزمانی عەرەبی:

- ابراهيم الداقوقي: فلسطين والصهيونية في وسائل الاعلام التركية، بغداد، ١٩٨٧.
- أحمد عبدالعزيز محمود: تركيا في القرن العشرين، دراسة جغرافية سياسية، مطبعة رۆژهەلات، اربيل، ٢٠١١.
- أحمد نورى النعيمي: تركيا وحلف شمال الأطلسي، بغداد، ١٩٨١.
- بيار مصطفى سيف الدين: تركيا وكردستان العراق "الجارين الحائرين"، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٨.
- اورهان كولوغلو وآخرون: العلاقات العربية-التركية، حوار مستقبلي: بحوث ومناقشات الندوة الفكرية التي نظمها مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٥.
- جبار قادر: قضايا كردية معاصرة، كركول، انفال، الكرد وتركيا، دار آراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٦.
- جواد ملا: كردستان والكرد، وطن مقسم دانة بلا دولة، تقديم: جمال نبز، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠٠.
- جيرارد جالديان: المأساة الكردية، ترجمة إلى العربية: عبدالسلام النقشبندي، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٧.
- جرجيس حسن: تركيا في الاستراتيجية الأمريكية بعد سقوط الشاه، دون مطبعة، ١٩٩٠.
- درية عوني: الأكراد، ابوللو للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٩٩.
- ديفيد مكدول: تاريخ الاكراد الحديث، ت.راج آل محمد، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٤.
- حامد محمود عيسى: المشكلة الكوردية في الشرق الأوسط، مكتبة المدبولي، مصر، ١٩٩٢.
- سالار اوسي ويوسف ابراهيم الجهماني، تركيا وأمريكا، دار حوران، دمشق، ٢٠٠٠.
- يوسف ابراهيم الجهماني: تركيا واسرائيل، دار حوران، دمشق، ١٩٩٩.
- هنرى باركر وآخرون: القضية الكوردية في تركيا، ت:هڤال، مؤسسة موكرياني، اربيل، ٢٠٠٧.

### ب- بەزمانی کوردی:

- حەسەن جودی: مێژوویێك لە ئاگر، نهێنی خۆراگری بزوتنەوەی ئاپۆچی دیمانەیەك لەگەڵ جەیل بایل، لە بڵاوكراوەكانی (پ.چ: د.ك)، بێ ساڵ و شوێنی چاپ.
- حەمید بۆز ئەرسەلان: مێژووی توركیای هاوچەرخ، و.نەجاتی عەبدوڵلا، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.
- عەبدوڵلا ئۆج ئالان: بەرگری كردن لە گەلێك، وەرگێرانی لە توركیەوە: لوقمان عەبدوڵلا، لە بڵاوكراوەكانی مەكتەبی ڕاگەیاندنی (پ.چ.د.ك)، چاپخانەی ڕەنج، بێ ساڵی چاپ.
- عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی كوردستان، چاپی ٣، بڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی كوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨.

– عوسمانی عەبدولڕەحمان سمایل: کورد لە سوریا(١٩٢٠–١٩٤٦)، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٩.
– فەرۆز شەممەدو شوانی تر: تورکیا نەبەرد لە پێناوی مانەوەدا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٦.
– م.ئە.حەسرەتیان: یاسا دەستوریەکانی تورکیاو کورد لە سەردەمی نوێدا، وەرگێڕانی لە روسیەوە: د.دلێر ئەحمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
– محەمەد نورەدین: تورکیا لە سەردەمی گۆڕاندا، وەرگێرانی: ئازاد بەرزنجی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
– کۆمەڵێك نوسەر: کورد گەلی خۆخۆری بەشخوراو: چەند لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شیکاریە، وەرگێڕانی: بەرزانی مەلا تەها، خانەی چاپ و پەخشی سایە، سلێمانی، ٢٠٠٩.
– گراهام ڤولڵەر و ئەوانی تر، جیۆپۆلەتیکی نوێی تورکیا ئاسیای ناوەند بەلقان کورد، و.عەتا قەرەداغی، سلێمانی، ٢٠٠٦.
– هێرش عەبدوڵلا حەمە کەریم: پەیوەندیە سیاسیەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا(١٩٩١–١٩٩٨) مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
– هیریەت مونتگومری: کوردی سوریا بونێکی نکوڵی لێکراو، وەرگێڕانی: مینەو پێشەوا، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩.
– مارف عومەر گوڵ، جینوسایدی گەلی کورد: لەبەر رۆشنایی تازەی نێودەوڵەتاندا، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٦.
– رۆبەرت ئۆڵسن: شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، وەرگێڕانی: ئەبو بەکر خۆشناو، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩.

– **گۆڤارەکان:**

* به زمانی عەرەبی:

– مجلة اوراق تركية معاصرة، عدد(١٦)، ربيع ٢٠٠١.
– مجلة دراسات العربية، العدد الثاني، السنة الأولى ١٩٩٩.

* **به زمانی کوردی:**

– گۆڤاری (K٢١)، ژمارە (٩)، هەولێر ٢٠١٠.
– گۆڤاری گوڵان، ژمارە(٢٠)، ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٨.
– گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە(١٠)، ئاداری ٢٠٠٧.

# بازرگانی دەرەکی لە دەولەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم

نجم الدين عبدالله اسماعيل
قوتابی ماستەر

## پێشەکی :

سەردەمی دەولەتی عوسمانی بەیەکێك لەگرنگترین سەردەمەکانی مێژووی جیهان بەگشتی وڕۆژهەلات بەتایبەتی دادەنرێت،بەهۆی ئەو کاریگەریەقووڵ وگرنگەی دروستی کردووە لەسەر رەوت ورووداوەکان لەجیهاندا.

بێ گومان بایەخدان وتوێژینەوە لەلایەنێکی گرنگی چالاکی ئابووری کەخۆی دەنوێنێت لە بازرگانی دەرەکی لەدەولەتی عوسمانی ورۆلی دەرکەوتن وجولانەوەی رەورەوەی ئابووری لەرۆژهەلات،کەبەشێکی زۆری خەڵکی پێوە خەریك بوون وە پەیوەندیەکی گرنگی هەبوو بەژیانی ئابووری هاوڵاتیان.لەگەڵ ئەوەش کاریگەریەکی راستەوخۆی هەبوو لەسەر بارودۆخی سیاسی وکۆمەلایەتی وپەیوەندیە نێو دەولەتیەکان.لەوهەڵ ومەرجەدا گۆرانکاریەکی روون لەپیادەکردنی سیاسەتی بازرگانی دەرەکی لەدەولەتی عوسمانی هاتەئاراوە بەتایبەتی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە چونکە دەولەتی عوسمانی هەر لەسەرەتای دروست بوونی دا وابەستەبوو بەبازرگانی ناوەخۆی بەلام لەگەڵ فراوان بوونی دەسەلات وسنووری دەولەت پێویستی بەکرانەوە هەبوو لەگەڵ ولاتانی تر لەرۆژهەلات ورۆژئاوا،ئەمەش بووە هۆی فراوان بوونی بازرگانی دەرەکی وە زیاد بوونی جیاوگەی ولاتانی ئەروپی لەناودەولەتی عوسمانی.

سەبارەت هەڵبژاردنی بابەتەکە دەگەرێتەوە بۆ گرنگی و بایەخی ئەم چالأکیە ئابووریە بوو کەبازرگانی دەرەکی یە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە لە ناو دەولەتی عوسمانی وە ئەم لایەنە پەیوەست بوو بەژیانی هاولاتیان لەلایەك وەسوود و قازانجی بۆ وولات لەرووی سەپاندنی رەسمی گومرگ وەبووژاندنەوەی خەزێنەی دەولەت لەرێگەی بازرگانی دەرەکی.وە لەلایەکی تر ئارەزووی توێژەر لەسەر نووسینی ئەم بابەتە هاندەرێکی تر بووبۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە.

جێگای ئاماژەپێکردنە بۆ لێکۆلینەوەیەکی لەم جۆرەش توێژەر دووچاری تەگەرەوکۆسپی زانستی دەبێتەوە لەوانەش بەدەش هێنانی سەرچاوەی رەسەن وتایبەت بەماوەی توێژینەوەکە، دەستە بەرکردنی ئەم سەرچاوانەش لەرێگەی هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر بەدەستەوە هاتووە.

لێکۆلینەوەکەلەپێشەکی یەك وچوار تەوەرە پێك هاتووە،هەر تەوەرەیەکیش دابەش دەبێت بەچەند لقێکە.

تەوەرەی یەکەم: بازرگانی دەرەکی لەدەولەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیە وە تێیدا ئاماژە بەرەوشی بازرگانی کراوە وەهەروەها پەیوەست بوونی دەولەتی عوسمانی بەئابووری ئەوروپا خراوەتە روو.وەباسی کاریگەری سەرمایەداری ئەوروپی بەسەر ئابووری دەولەتی عوسمانی کراوە.

تەوەرەی دووەم : رێگاکانی بازرگانی وئامرازەکانی گواستنەوە لەدەولەتی عوسمانی یە کەپێك دێت لەدوو رێگا رێگەی ووشکانی ورێگەی ئاوی.

تەوەرەی سێیەم: گۆرانکاری لەپەیوەندیە بازرگانیەکانی دەولەتی عوسمانی لەبەرژەوەندی جیهانی سەرمایەداری یە کەتێیدا گۆرنکاری لەهۆیەکانی گواستنەوە کراوە لەوانەش دروست کردنی پیشەسازی کەشتی و بنیادنانی بەندەروپەرەپێدانی وەهێلی ئاسنین وهۆکارەکانی پەیوەندی وگەیاندن وە لەلایەکی تر باس لە جیاوگەی بیانی لەناو دەولەتی عوسمانی کراوە.

تەوەرەی چوارەم : کاردانەوەی گۆرانکاریەکان لەسەر بارودۆخی ئابووری دەولەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە کە لەگەڵ هەموو ئەو گۆرانکاریانە وکاردانەوەکەی بەشێوەیەکی قول لەمەر باردۆخی ئابووری دەولەتی عوسمانی تیدا باس کراوە.

توێژەری لەکۆی گشتی لێکۆلینەوەکەپشتی بەستووە بە ژمارەیەکی زۆر لەسەرچاوەی جۆراو جۆربەزمانەکانی عەرەبی وئینگلیزی، لەسەرووی هەمووشیان سەرچاوە عەرەبیەکان (هاملتون جیب وهارولدوین) کەکتابەکەی بەناوی (المجتمع الاسلامی والغرب)، وە (یلماز اوزتونا) کتابەکەی (تاریخ الدولة العثمانیة)، (عباس اسماعیل صباغ) کتابەکەی (تاریخ العلاقات العثمانیة الایرانیة) وە(ز.ی.هرشلاغ) کتابەکەی (مدخل الی التاریخ الاقتصادی الحدیث للشرق الاوسط) وە (خلیل اینالجیك) کتابەکەی (التاریخ الاقتصادی والاجتماعی للدولة العثمانیة). وە ئەو سەرچاوە ئینگلیزیەی کەسوودی زۆرم لێ دیت بریتی بوو لە ( charles Issawi) کتابەکە بەنـــاوی (Economic History of Turkey).

هەنـدێك لـەم سەرچـاوانە تایبـەت بـوون بەمێـژووی دەولـەتی عوسمـانی وەهەنـدێکیش پەیوەنـدی راستـەوخۆیان نـەبووە بەمێـژووی دەولـەتی عوسمـانی تەنها هەندێك لایەنی لاوەکی تێدا باسکرا بوو.

لەکۆتایـدا لێکۆلینەوەیـەکی لـەم شـێوەیە هـەولێکی زانـستی زۆری بـۆدراوە سەرەرای ئەوەی کەنمانتوانیووە بچینە نـاخی بابەتەکە،بـەلام هیـوادارین بـەپێی ئەو توانایەی هەبوو شتێکمان کردبێ.چەندە بێ کەم کوری نیـە بـەلام هیـوادارم بەچاوێکی زانستیانە وەربگیرێت.

## تەوەرەی یەکەم

## بازرگانی دەرەکی لەدەولەتی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە

### أ-رەوشی بازرگانی دەرەکی لەدەولەتی عوسمانی :

بازرگانی لەدەولەتی عوسمانی گرنگی زۆری هەبووە،بەگرنگترین بنەماکانی ژیانی ئابووری دادەنرا.ئەم بازرگانیەش بەردەوام لەگۆران دابووە.وە هەروەها دەولەتی عوسمانی هەر لەسەرەتای دروست بوونی یەوە پیادەی پارێزگاری کردن لە سیاسەتی بازرگانی خۆی کردووە،بەمەبەستی دروستکردنی هاوسەنگی بازرگانی لەبەرژەوەندی خۆی وەهەروەها پەیرەو کردنی سیاسەتی بەرگری کردن لەکەل و پەلی ناوەخۆی یەکان،گۆرینی دەریای رەش بۆ ناوچەیەکی بازرگانی ناوەخۆی،زیاد کردنی باج لەسەر کەل وپەلی هاوردە وقەدەغەکردنی کەل وپەلی بیانی کەپێداویستیەکانی ناوەخۆی یەکان پر ناکاتەوە ئەمەش بووەهۆی گەشەکردنی پیشەسازی ناوەخۆی چونکە دەولەت رەسمی گومرگی لەسەر بازرگانە ئەورپیەکان دانا بەرێژەی ٧٪ وەلەسەر رەعیە ناموسلمانەکانی ناو دەولەتی عوسمانی دانا بەرێژەی ٣٪ بۆ ٤٪، [١].

لەراستی دا سولتانەکانی عوسمانی گرنگی زۆریان بەچالاکی بازرگانی داوە چ لەناوەخۆ بیت یاخود دەرەوە،هەرچەندە بازرگانی لەناو دەولەتی عوسمانی هەلّکشان وداکشانی بەسەر داهاتووە بۆنموونە لەسەردەمی سولتان محمدی دووەم کەناسراوە بە محمد فاتح بازرگانی بووژانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە زۆری شاری گەورەی وەکو (نیقیە)بوژایەوە،بەردەوام شوێن فەتح دەکران بەم شێوەیە چالاکی بازرگانی فراوان دەبوو تا تونیان بگەنە بازارەجیهانیەکان لەرێگای ئاوی ووشکانی،وەرێگا کۆنەکانیش پەرەیان پێدرا وە

ئەمەش بووەهۆی ناچار کردنی دەولەتەبیانیەکان لەوالا کردنی بەندەرەکانیان لەبەردەم بازرگانەکانی عوسمانی [٢].

هەروەها لەسەردەمی سولتان سەلیمی یەکەم بەهۆی گۆرینی ئاراستەی فراوان خوازی لەرۆئاوا بۆ رۆژ هەلات تەکانێکی گەورەی دا بەجموجۆلی بازرگانی،توانیان کۆمەلێك مەلّبەند وریگای بازرگانی بگرن لەوانەش رێگای تەوریز – بۆرسە، وەبەهۆی سەرکەوتنیان بەسەر مەمالیکەکان لەسالّی (١٥١٦–١٥١٧)توانیان کۆمەلێك بنکەی بازرگانی لەمیسرو شام بگرن، لەوانەش حەلەب بوو کەبەگەورەترین شارەکانی عوسمانی دادەنرا لەرووی بازرگانی چونکە گرنگترین ویستگەی بازرگانی بوو کەلەئێران دەهاتن حەریریان دەهێنا دواتر بووبە بنکەی بازرگانی بیانی یەکان [٣].

وە لەسەردەمی سولتان سلێمانی قانونی (١٥٣٤–١٥٦٦) چالاکی بازرگانی زۆر گەشەی کرد بەگرتنی هەردوو شاری بەغدا ١٥٣٤ وەدواتریش شاری بەسرە کەبوونە مەلبەندێکی تری بازرگانی وبنکەی یەکی سەرەکی لەدوورگەی عەرەبی وئێران شان بەشانی موسل،بەگرتنی عێراق دەولەتی عوسمانی توانی بازنەی بازرگانی سەفەوی تەسك بکاتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی وە گەیشتە سەر کەنداوی فارسی لەرێگەی بەسرا بەمەش توانی لەبەرژەوەندی پورتوگال بدات لەم ناوچەیە [٤].

هەر لەسەردەمی سولتان سلێمانی قانونی شاری ئەسکەندەریەش بوژایەوە کەپیشتر فەرامۆش کرابوو،وەشاری قاهیرەش پێگەی بازرگانی بۆ گەرایەوە و زۆر کەل وپەلی دەنارد بۆ دەرەوە،وەدوای گرتنی صەنعا لەوولاتی یەمەن رێگای بازرگانی عەدەنیش مسۆگەر کرا[٥].

شایانی باسە مێژوونوسان کۆکن لەسەر ئەوەی کەشکۆی دەولـەتی عوسمـانی بەرولاوازی دەچێت لـەکۆتای دەسـەلاتی سـولتان سـلیمانی قـانونی وەدوای ئـەو چەند سولتانی لاواز دێن بارودۆخی ئابووری دەولەتی عوسمانی تووشـی داکشان دەبێت بەتایبەتی لەکۆتای سەدەی هەژدە سـەرەتای سـەدەی نۆزدە وولاتـانی ئـەوروپی هـەولی دەسـت خـستنەناو دەولـەتی عوسمانیـان دا بـۆ بیرکردنـەوە لەچارەنووسـی دەولـەتی عوسمـانی ومولکـەکانی لەوانـە بـەریتانیا بەمەبەسـتی پارێزگـاری کـردن لـەرێگاکانی بازرگـانی هیند،روسـیا هـەولی گەیـشتنی بـە ئـاوە گەرمەکان لـەرێگای گـەرووی بـسفۆر ودەردەنیـل وە فەرەنـساش بـۆ پارێزگـاری کردن لەبەرژەوەندی یەکانی لەناوچـەکەدا [٦]. بۆیـە لـەو روانگەیـەوە تێکـچوونی پەیوەندیـە سیاسـیەکانی زلهێزەکـان وبـارودۆخی سیاسـییان کاریگـەری راستەوخۆیان کردبووە سـەر جموجـۆلی بازرگـانی لەدەولـەتی عوسمانی،جـەنگی قەرمیش نموونەی ئەو پەیوەندیانە بـەروونی دەردەخـات لەگـەلّ کاریکەریـەکانی لەسەر پەیوەندی دەولەتی عوسمانی لەرووی سیاسی و ئابووری .

لەلایەکی تـر چاکسازیەکانی دەولـەتی عوسمـانی رێگـا خـۆش کـەر بـوو بـۆ گۆرینی شانۆی دەولەتی عوسمانی لەرووی ئابووری وکۆمەلایەتی بەرەو وولاتـانی ئەوروپی بەتایبەتی لەسەردەمی سولتان عبدالمجید وسولتان عبدالعزیز وسـولتان عبدالحمیدی دووەم کەبناغەی دەگەرێتـەوە بـۆ چاکسازی هـەر یەکـە لەسـولتان سەلیمی سێیەم وسولتانی محمودی دووەم کـە رێگـا خـۆش کـەر بـوون بـۆ ئـەم سولتانانە [٧].

سـەرەرای ئـەوەی کەدەولـەتی عوسمـانی دەسـەلاتی بازرگـانی رۆژهـەلاتی لەدەسـت دەردەچـێ ودەکەوێتـە دەسـت بازرگانـە ئەوروپیـەکان بـەهۆی ئـەو جیاوگانەی کەبەردەوام دەبەخشرانە ئەوروپیەکان بەلام ئەمەش مامانی ئەوەنیـە

کەجم وجۆلی بازرگانی دەرەکی نەمێنێ بەلکو بەپێچەوانەوە زیادی کرد بەشێوەیەك لەهەموو شارە سەرەکیەکان مەلبەندی بازرگانی چالاك وچینی کۆمەلایەتی نویێ ی بازرگانی دەولەمەند پەیدابوون (٨).

هەڵبەتە دەولەتی عوسمانی پارێزگاری کردووە لەسەر پەیوەندیە بازرگانیەکانی لەگەڵ رۆژئاوا کە بەخالێکی سەرەکی دادەنرا لەپەیوەندی بازرگانی دەرەکی لەرێگای دەریای لەگەڵ بندوقیەکان وفەرەنسیەکان وهۆلەندی و ئینگلیزەکان وە لەریگای ووشکانی لەگەڵ باکووری ئەوروپا،بەدرێژی مێژوو بازرگانی لەگەڵ ئاسیا وئەفریقیا کردووە،لەلایەکی تر بەرەو پێش چوونی ئابووری ئەوروپا کاری کردۆتە سەر بازرگانی دەرەکی دەولەتی عوسمانی بەتایبەتی سەرهەڵدانی شۆرشی پیشەسازی وپشکی وولاتانی ئەوروپی زیادبوو لەبازرگانی دەولەتی عوسمانی(٩).

## ب- پەیوەست بوونی دەولەتی عوسمانی بەئابووری ئەوروپا

دەستپێکی پەیوەست بوونی دەولەتی عوسمانی بەسەرمایەداری ئابووری ئەوروپی دەگەرێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە،هەرچەندە لەسەرەتادا بەشێوەیەکی لەسەرخۆ بووە بەلام دواتر گەشەدەستێنێت لەگەڵ زیاد بوون وگەشەکردنی دەرهاوێشتەکانی شۆرشی پیشەسازی بەشێوەیەك لەماوەی سالآنی (١٨٢٩-١٩١١) قەبارەی بازرگانی دەولەتی عوسمانی لەگەڵ وولاتانی ئەوروپی بەرێژەیی بەرەو زیادبوون چوو.

سەبارەت بەپەیوەندیە بازرگانیەکانی وولاتانی ئەوروپی لەگەڵ دەولەتی عوسمانی بەم شێوەیەبوو کەبەریتانیا کەلەسەرووی هەموو وولاتانی ئەوروپی

دەهـــات بـــەهۆی ڕێکەوتنامـــەی بلطـــة لیمـــان [10]. کـــەبووە هـــۆی ئـــەوەی بازارەناوەخۆیـــەکانی دەولـــەتی عوسمـــانی بەرامبـــەر بەکـــەل وپـــەلی بـــەریتانیا کراوەبێت وەکاریگەری زۆری کردە سـەر زیـاد کردنـی قـەبارەی هـاوردەی کـەل وپـەلی بـەریتانیا لـەناو دەولـەتی عوسمـانی تـا لـەماوەی سـالانی (١٨٢٧-١٨٦٩)بەرێژەی ١٦جار زیاد بوو [11].

جێگـای باسـە بـەریتانیا تـەنها نـەبوو لـەقورخ کردنـی بازارەکـانی دەولـەتی عوسمانی،بەڵکو چەند وولاتی دیکەش ڕۆلیان هەبووە لـەوبوارە بەرێـژەی جیـاواز لەوانــە فەرەنـسا لــەنێوان سـالانی (١٨٥٤-١٨٧٣)هـاوردەکردنی زیـادی کـرد بەرێـژەی ٧جـار لەرێـژەی یەکـەمی خۆیـدا،بازرگانی ئـەلمانیش لـەناو دەولـەتی عوسمـانی دوای سـالی ١٨٨٠بەشـێوەیەکی فـراوان رووی لـەزیاد بـوون کـرد تـاکو ساڵی ١٩١٠هاوردەکردنی ئەلمانیا ١٤جار زیادی کرد [12].

دواتـر کاریگـەری قـول دروسـت بـوو لـەبازرگانی دەولـەتی عوسمـانی وە گۆرانکاری لە بازرگانی لەرووی چۆنیەتی بـۆ چـەندایەتی ئەنجامـدرا بەشـێوەیەك کەکـــەل وپـــەلی دەســـتکردە ناوەخۆیـــەکان بەشـــێوەیەکی بەرچـــاو وون بـــوون بەرامبەریـەوە لۆکـەو حـەریر وتـوتن ودانەوێلـە بوونـە بەرهـەمی هـەناردەکردنی دەولەتی عوسمانی کە لەماوەی سالانی (١٨٧٨-١٩١٣) ڕێژەکەی ٣٥٠٪بۆ لۆکـە و٣٦٠٪بۆ حەریر بوو [13].

## ج-کاریگەری سەرمایەداری ئەوروپی بەسەر ئابووری دەولەتی عوسمانی

سەرەتای دەستپێکردنی گۆرانکاری لەبارودۆخی ئابووری دەولەتی عوسمـانی بەروونی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە دەردەکەوێت،بەشـێوەیەکی بنـەرەتی پەیوەست بووە بەگەشەکردنی سـەرمایەداری ئـەورووپی و دەرکـەوتنی کودەتـای

پیـشەسازی لەئـەورووپای رۆژئـاوا لەشەسـتەکانی سـەدەی هـەژدە هـەموو ئـەو گۆرانکاریانـــەی کـــەرۆلیان هـــەبووە لەپێگەیـــشتن وگەشەســـەندن لـــەماوەی ســـەدەونیوێك چـــەندین دەرئـــەنجامی گـــەورەی لەگـــەڵ خـــۆی هێناوەلـــەرووی چـەندایەتی وچـۆنیەتی،وەپەلی هاوێشت بـۆ هـەموو کـون وکەلەبـەرێکی جیهـان بەدوورو نزیك،گرنگترین دەرئەنجامەکانیشی بریتـی بـوو لـە زیـادبوونی بەرهـەم، لـەژێر چـەتری شۆرشـی پیـشەسازی دا وولاتـانی سـەرمایەداری رەورەوەی بەرهەمیان بەشێوەیەکی خێرا رووی لەزیادبوون کرد بەشێوەیەك رێـژەی بەرهـەم هێنان لەماوەی سالانی (١٨٧٠–١٩١٣) بە ٥٠٠٪زیادی کرد (١٤).

لەبەرامبـەر ئـەو زیادبوونـەی کەبەرهـەمی پیـشەسازی بەخۆیـەوە بینـی لـەوولاتانی ئـەورووپای سـەرمایەداری پێویـستی بەسـاغ کردنـەوەی بەرهەمـە زیادەکانە،ئەمـەش وای کـرد کـەوا وولاتـانی ئـەورووپی بـیر لەدۆزینـەوەی بـازار بکەنەوە،لەم روانگەوە دەولەتی عوسمانی گرنگیەکـەی بـەدیار کـەوت بەتایبـەتی لەرووی شوێنی سـتراتیژی یەکـەی وتوانـا وبەرهەمـە زۆرەکانی،هـەر لەسـەرەتای سەدەی هـەژدە یـەکێتی ئەورووپایـەکان دەنوسێت (شـوێنی جـوگرافی دەولـەتی عوسمـانی زۆر گونجـاوە بـۆ وەدەسـت هـاتنی قـازانجی زۆر لەبازرگانی،چـونکە دەولـەتی عوسمـانی دەکەوێتـە ناوەراسـتی هەرسـێ کیـشوەرەکە،هەر ئەمـەش وایکردووە کەهیچ دەولـەتێك نـەبێت لەئـەورووپا پێویـستی بەدەولـەتی عوسمـانی نەبێت بۆبەدەست هێنانی مادەسـەرەتایەکان چـونکە دەولەمەنـدە بـە کەرەسـتە خاوەکان (١٥).

لەلایەکی تر گرنگی شوێنی جـوگرافی دەولـەتی عوسمـانی پـاڵی بـە وولاتـانی ئەورووپای سەرمایەداری نا لەرێگەی دبلۆماتەکانیان گرنگی دەولەتی عوسمانی بۆ بەرژەوەنـدی وولاتـەکانیان وسـاغ کردنـەوەی بەرهـەم پیـشەسازیەکانیان لـەناو

دەولەتی عوسمانی،لەبارەی گرنگی شوێنی جوگرافی دەولەتی عوسمانی بالوێزی بەریتانی لەئەستەمبۆل لۆرد ستراتفورد [١٦]،لەرێگەی نامەیەك كەبۆ ولیامس نوێنەری بەریتانیا لەدیاری كردنی سنووری دەولەتی عوسمانی لەگەلّ ئێران بوو دەلێت ,,زانینی فراوان بوونی بازرگانی كەل وپەل لەكۆتای یەكانی ١٨٤٨دروست كراوەكانمان بەدەست دێت لەكاتی دامەزراندنی قونسلیەی بەریتانی لەسیواس كە ئەمە دەبێتە شوێنێكی گرنگ بۆ هاوردەكردنمان بەنیسبەت بازارەكانمان وە قەبارەی بازاری ناوەخۆی وئاسانی گواستنەوەیان لەگەلّ نزیكترین شوێن بۆ بازاری دەرەكی وهۆیەكانی دروست كردنی پرۆژەی بازرگانی بۆ وولات [١٧].

## تەوەرەی دووەم

## رێگاكانی بازرگانی دەرەكی وئامرازەكانی گواستنەوە لەدەولەتی عوسمانی

### أ- رێگای ووشكانی :

بێ گومان چەندین رێگای ووشكانی هەیە كەوا ناوچە جیاجیاكان بەیەكەوە دەبەستێتەوە،وە لەشارەكان وناوچەكان لقی تریان لێ دەبیتەوە،وەرێگاكان دەرەوەو ناوەوە بەیەك دەگەینن.

لەگرینگترین ئەو رێگا ووشكانیانەش ئەو رێگایە بوو كە وولاتی ئێرانی دەبەستەوە بەعێراق و شام،كە رێگایەكی گرنگی بواری بازرگانی حەریر بوو كەلەهیند و چین دەهات،ئەم رێگایە دواتر دەهاتە هەمەدانەوە دواتر بۆ ئەسەد ئاباد كەبنكەی كاروانچیەكانی نێوان هەمەدان وبەغدا بوون،لەوێشەوە بۆ كرمانشان دەرۆیشت تا حەلوان دواتریش دەگەیشتەوە بەغدا [١٨].

لەوێشەوە لقی تری لێ جیادەبێتەوە بۆ بەسرا کەشوێنێکی گرنگی هەبوو بەهۆی کەنداوی عەرەبی،وەلقی تری لێ دەبویەوە بەرو موسڵ وەدواتر بەرەو ئامادو دیار بەکر وناوچە تورکەکان،رێگایەکی تر لەگەڵ حەلەب بەیەکی دەبەستنەوە کەرێگایەکی زۆر گرنگی بازرگانی بوو کەهەرسێ قارەی ئاسیا وئەفریقیا وئەوروپای بەیەك دەبەستەوە کەبەو رێگایە توانراوە شام بەئەنادۆڵ ببەستی لەرێگەی موسڵ، لەرێگای حەلەبیش رێگایەکی تر هەبوو بۆ تەرابلوس وئەسکەندەریە لەسەر دەریای ناوەراست [١٩].

رێگایەکی ووشکانی تری سەرەکی کە دوو مەلبەندی گرنگی بازرگانی بەغدا و موسلی بەیەك بەستۆتەوە بریتی بوو لەو رێگایەی کە خاکی کوردستانی باشووری بریوە،دوای لەبەغدا بەرەو کەرکوك رۆیشتووە،لەوێشەوە بەرەو ئاڵتون کۆپری و هەولێر،لەوێشەوە بۆ موسل لەرێگەی زێی گەورەوە [٢٠]. بیگومان بایەخ وگرنگی ئەو رێگا ووشکانیانە بۆ دەولەتی عوسمانی لەدوای داگیرکردنی عێراق وشام لەسەدەی شانزە دەرکەوت کە توانی بەهۆیەوە دەسەلاتی تەواوی هەبێت بەسەر بازرگانی ووشکانی رۆژهەلات [٢١].

هەروەها کەل وپەلەکانی ئێران لەرێگای (ئەرزرووم – ارزنجان) دەگەیشتە توقاد لەوێشەوە لەرێگای (ئەماسیا– بولو – ئیزمید) دەگەێنرایە ئەستامبول.بەلام ئەو کاروانانەی روویان دەکردە ئیزمیر رێگای (ئەنقەرە – ئەسکی شەهر) یان دەگرتەبەر،زۆر جار کاروانەکان لەئەنقەرە و ئەماسیا لەنزیك ئیزمید بەیەك دەگەیشتن ئەمەش وایکرد بوو (توقاد وئەماسیا) ببنە ناوەندی بازرگانی گرنگ لەئەنادۆل وە شاری بۆرصەش سەنتەری دابەش کردنی حەریری ئێرانی بووە،وە شاری حەلەب شارێکی تر بوو کەببوە سەنتەری بازرگانی حەریر،هەربۆیە هەردوو شاری حەلەب ودیمەشق هاوشانی شاری بۆرصە

لەگەشەدابوون لەبواری بازرگانی، وە سەبارەت بەرێگاکانی ووشکانی ناوخاکی ئەوروپا دەست پێ دەکات لەئەستامبۆل وغلیبۆلی تێکەل دەبن لە ئەدرنە دواتر ئەم رێگایە درێژ دەبێتەوە لقێکی بۆ ئەخلات وبغدان تێ دەپەرێت بە ئیدۆس وباباداغی،هەرچی دووەمە درێژ دەبێتەوە بۆ تاکو دەگاتە کەناراوەکانی دەریای ئەدریاتی وتێ دەرێت بەسلانیك،سەرەز،ئوفری.وە لقی سێیەم درێژ دەبێتەوە بۆ تاتارو پازاری بەتێپەر بوونی بە (فەلیە) ودواتر دەبێتە دوو لق یەکێکیان دەگاتە مەجەر بەبرینی هەر یەك لە صوفیا وینش وبلغراد،لقەکەی تری دەگاتە دوبرفنیك بەبرینی بکوستندیل وئۆسکوب وسرایڤۆ وموستار[22].

شایانی باسە جگە لەو رێگایانەی کەباسمان کرد دەیان وسەدان رێگا ولقی تریش هەن کە ناتوانین لێرە باسیان بکەین بەلام دەبێ ئەو راستیە بزانین کە لەکۆتایەکانی فەرمانرەوای عوسمانیەکان لەرێگای ووشکانی هێلی ئاسن هاتە کایەوە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە کە بووە یەکێك لەرێگا گرنگەکانی گواستنەوە وئاسانکاری یەکی باشی کرد بۆ بوژاندنەوەی بازارەکان لە ناوچەکانی دەولەتی عوسمانی بەتایبەتی هێلی ئاسنی نێوان ئەزمیر وئایدن وە نێوان ئەزمیرو قصبە وە لەنێوان مێرسین وتەرەقوس و ئەدرنە لەئەنادۆل، لەنێوان سۆنافودا کونستانزاورشوك وڤارنا لەبەلقان، هێلی ئەستەمبۆل –ڤیەننا وە لەنێوان بەرلین وئەنقەرە وە ئەستەمبۆل وئەزمیر[23].

### ب- رێگای ئاوی (دەریایی) :

بەپێی ئەوەی کەدەولەتی عوسمانی ناوچەیەکی فراوانیان لەدەست دابوو لەهەرسێ کیشوەری ئاسیا وئەوروپاو ئەفەریقیا،بۆیە توانیویانە سوودی زۆر لەسێ ئاوی گەورە وەربگرن کەوانیش بریتی بوون لە دەریای ناوەراست ودەریای

سوور ودەریای رەش وێرای کەنداوی عەرەبی.دەریای ناوەراست کەئاراستەی رۆژئاوا—رۆژهەلات دەرێژ دەبێتەوە وەکو بالێکی ئۆقیانوسی ئەتلەسی بوو،کەئاسیای بچووك و وولاتی شام دەبەستێتەوەبەبەلقان وئیتاليا ونیمچە دورگەی ئیبریا لەلایەکی تریشەوە هەموو ئەو ناوچانەش دەبەستیتەوە بەباکوری ئەفریقیا [٢٤].

ئەو رێگەیە بەیەکیك لەریگا سەرەکیەکانی جیهان دادەنرێت،بەلام بەهۆی دۆزینەوەی رێگەی (رأس الرجاء الصالح) بایەخی ئەم رێگایە کەم بۆوە،لەسەردەمی سولتان سلێمانی قانونی لەرێگەی جیاوگەهەولدرا کە دووبارە ئەم رێگە بازرگانیە ببوژێنەوە،بۆیە چەند پەیمانی لەگەڵ ئیتاليا وفەرەنساو بەریتانیا مۆرکرد [٢٥].

سەبارەت بەدەریای سوور کەباڵی ئۆقیانوسی هیندی پێك دێنیّ و لەرێگەی گەرووی باب المندب پێی بەستراوە کە بەهۆیەوە دەگەیشتە بازرگانی هیند وچین.شایانی باسە دەریای رەش کەلەباکوری ئەنادۆل درێژ بۆتەوە و لەرێگەی کەناڵی بسفۆر بەئەستەمبۆل دەبەسترێتەوە کە دەیگەێنێتەوە دەریای مەرمەرە[٢٦]. وە کەنداوی عەرەبیش (فارسی) یەکێك بوو لەکەناڵە گرنگەکانی بازرگانی،بەلام ئەو کەنداوە لەسەرەتاکانی سەدەی شازدە وە پورتوگالیەکان دەستیان بەسەر داگرتبوو،دواتر لەسالی ١٦٩٥ز دەولەتی یەعاربە لەعومان توانیان بەیەکجاری پورتوگالیەکان لەکەنداو دەربکەن [٢٧].

لەلایەکی تر رێگا گرتنی دەسەلاتدارانی عوسمانی لەبەخشینی جیاوگە بەکۆمپانیا بیانیەکان بۆ ئەنجام دانی گواستنەوەی دەریای لەناوەکانی عوسمانی،بووە هۆکارێك کەچەند کۆمپانیەکی ئەهلی لەناو دەولەتی عوسمانی دەرکەوت کەزیاتر ئەرکی گواستنەوەی دەریایان لەناو دەولەتی عوسمان خستە

ئەستۆی خۆیان لەوانە (کۆمپانیای الخیریە) کە دەزگایەکی عوسمانی ئەهلی بوو کەکەشتیوانی لەگەرووی بسفۆر ئەنجام دەدا، هەروەها دەزگای (فوائد العثمانیة) کە دواتر ناوەکەی گۆردرا بۆ (ادارە مخصوصە) کە ئەرکی کەشتیوانی و ئالوگۆری بازرگانی ئاوی لەبەندەرەکانی ئیستانبول و جەددەو ئەفریقای لە ئەستۆدابوو[٢٨].

سەبارەت بەبازرگانی دەرەکی سەرەرای ئەو توندیانەی دەولەت ودەرچوونی فەرمانی سولتانی ١٨٢٢کەتێدا بازرگانی ئاوی لەگەڵ ئەوروپا بەرتەسك کردەوە تەنها لەرێگای کەشتی عوسمانی،بەلام هەولەکان لەگەڵ دەرکەوتنی کەشتی هەڵمی وپرنەکردنەوەی پێداویستیەکان لەلایەن کەشتی عوسمانی هەرەسی هێنا،زەوی عوسمانی چەندین بەندەری سروشتی تێدایە لەوانە لەکەناراوەکانی دەریای ناوەراست ودەریای رەش،لەرێگای چەندین رێکەوتنامەدەولەتی عوسمانی پابەند کردبوو بەوەی لەکاتی تێکچوونی بارودۆخی ئاووهەوا وکەشتیەکان رووبکەنە ئەو بەندەرانە بۆ پرکردنەوەی پێداویستیەکانیان بەبێ هیچ رێگا گرتنێك[٢٩].

دیارە بەندەری تەرابزۆن وسینۆب ووارنا لەسەر دەریای رەش،سیلانیك لەسەر دەریای ئیجە وئیتالیا وئەسکەندەرون وبەیروت لەدەریای ناوەراست لەلایەك پەناگەیەکی باش وسەلامەت بوون بۆ کەشتیەکان،وەبەهۆی پەیوەندیان بەناوەوە تایبەتمەندیەکی گەورەی بەخشیبووە بازرگانی دەریایی لەدەولەتی عوسمانی، سەرەرای گرنگی بەندەرەکان بۆ بازرگانی دەریایی بەلام تاکو ناوەراستی سەدەی نۆزدەم ئەم بەندەرانە بەدەست کەمی وهەژاری شۆستەکان دەیان نالاند چونکە تاکو ئەوکاتە کەشتیە بازرگانیەکان بەهۆی نەبوونی شۆستە

ناچار بوون بۆ بارکردن وخالی کردنی کەل وپەلەبازرگانیەکانیان پشت ببەستن بەکەشتی بچووك ئەمەش بێگومان خەرجی زۆرو کاتی زۆری پێویست بوو[٣٠].

شایانی باسە گواستنەوەی ئاوی تەنها لەدەریاکان نەبووە،بەڵکو رێگای تریش هەبووە کەزیاتربۆ ناوەخۆ بەکارهاتووە،کەبریتین لەرووبارە ناوەخۆیەکان بۆ نموونە رووباری دیجلە،ئەو کەل وپەلانەی دەهاتن بۆ کەنداو یان بەسرا،چ لەئاماد یان لەبەغدا یان لە جزیرە،ئەوا بەو رووبارە دەگواسترانەوە و دەگەیشتنە بەسرا[٣١]. هەروەها بەهۆی رووباری دیجلە کوردستانی باشوریش بەستراوە بە بەغدا،ئەویش لەرێگەی زێی بچوکەوە لەئالتون کۆپری بەرەو دیجلە ولەوێش بۆ بەغدا سەرەرای رووباری سیروان،بەلام ئەم رێگا بازرگانیە تەنها یەك ئاراستەی هەبووە کەبەهۆی رێرەوی ئاوەکە بووە [٣٢].

## ج- ئامرازو هۆیەکانی گواستنەوە:

سەبارەت بەئامراز وهۆیەکانی گواستنەوە لەدەولەتی عوسمانی سەرەتا تارادەیەك دواکەوتوو وسادە بوون وە هۆیەکانی گواستنەوە پەیوەست بووە بە رێگای ووشکانی وئاوی،وەهەروەها هۆیەکانی گواستنەوە لەجێگایەك بۆ جێگایەکی تر جیاواز بوو کەدابەش ببون بۆ گواستنەوە لەرێگەی ووشکانی لەبیابانەکان حوشتر بەکار دەهات بۆ بارهەلگرتن دواتر هێلی ئاسن وەلە رێگەی دەریایش کەشتی بەکار دەهات وە لەرووبارە ناوەخۆیەکانیش بەلەم بەکار هاتووە بۆ گواستنەوەی کەل وپەلەکان .

سەبارەت بەهۆکارەکانی گواستنەوە لەرێگای ووشکانی جگە لەووشتر ئاژەلی تری وەك گوێ درێژ وئیستر بەکارهاتوون زۆر جاریش ئەو ئاژەلانە مولکی بازرگان و گەشتیاران نەبوونە،بەلکو بەکرێ گرتوویانە [٣٣]، لەوبارەیەوە

بازرگانەکانی سەرتاسەری دەولەتی عوسمانی لەئەستەمبۆل وئەزمیر وحەلەب ودیمەشق وقاهیرە وهەمووناوچەکانی دیکە دەچوونە هیند بەمەبەستی هێنانی کەل و پەل، کەتێیدا ئاژەل وەك هۆکاری سەرەکی گواستنەوەی کەل و پەلەکان بەکار هاتووە، بۆیە لەو هەلومەرجەدا بازاری کرین و فروشتنی ئاژەل گرو تینی بەخۆیەوە بینی [٣٤].

گواستنەوەی ئاویش لەدەریا وئاوە گەورەکان بەکەشتی وبارهەلگر بووە،هەروەك لەدەریای سوور بارهەلگری عەرەبی ومالیزی کاریان کردووە،ئەو بارهەلگرانەش لەجۆری کراوە بوون ناسرابوون بە (داو)زۆر بەشیان لەوولاتی هیند دروست دەکران کەتوانای هەلگرتنی (٧٠-٩٠)تەنیان هەبوو ن دواتر کەشتی گەورەو پێشکەوتوو بەکارهات لەکۆتایەکانی سەدەی نۆزدە دواتر بنکەیەکی دروست کردنی کەشتی لە جدە دامەزرا[٣٥].

لەراستی دا لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدە وسەرەتای سەدەی بیست لەرێگای ووشکانی هۆکاری تریۆ گواستنەوە بەکار هات بۆ گواستنەوە چ لەناوەخۆ بیت یاخود لەدەرەوە ئەویش بریتی بوو لەشەمەندەفەر (هێلی ئاسن)،ئەمەش گۆرانێکی گرنگ بوو لە گواستنەوە لەرێگەی ووشکانی،ئەو هێلانەش لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە دامەزران، هێلە نێو دەولەتیە گرنگەکان بریتی بوون لە هێلی (ئەستەمبۆل -ڤیەنا)کە لە سالی ١٨٨٨دامەزرا، وە هێلی (بەرلین - ئەنقەرە) ئەویش لەسالی ١٨٨٨دروست کرا[٣٦].

## تەوەرەی سێیەم :

## گۆرانکاری لە پەیوەندیە بازرگانیەکانی دەولەتی عوسمانی لەبەرژەوەندی جیهانی سەرمایەداری :

لەدەرئەنجامی ئەو گۆرانکاریانەی کە رووبەرووی دەولەتی عوسمانی بووە لەرووی ئابووری بووە هۆکارێك کە دەولەتی عوسمانی ببێتە بازرێکی باشی وولاتە ئەوروپیەکان بۆ ساغ کردنەوەی کالاکانیان و بەدەست هێنانی کەرەستەی سەرەتای، ئەو گۆرانکاریانەش کاریگەری قوولی دروست کرد لەپەیوەندیە بازرگانیەکانی دەولەتی عوسمانی کە کۆتایەکەی بەقازانجی بەرژەوەندی سەرمایەداری وولاتانی ئەوروپی کۆتای پێ هات.ئەو گۆرانکاریانەش بریتین لەگۆران لەشێوازو هۆیەکانی گواستنەوە وجیاوگەی ئەوروپی لەناو دەولەتی عوسمانی کەئەمانەن :

### ١-گۆرانکاری لەهۆیەکانی گواستنەوە

### - دروست کردنی پیشەسازی کەشتی :

گۆرانکاری لەپەیوەندیە بازرگانیەکانی نێوان دەولەتی عوسمانی و وولاتانی ئەوروپی بووە هۆکارێك بۆ گۆرانکاری لەهۆیەکانی گواستنەوە،بەکارهێنانی کەشتی کەلەسەر هێزی هەڵمی کاری دەکرد کەلەکۆتایەکانی سەدەی نۆزدە بۆ گواستنەوەی گەشتیاران و پۆستەو کەل وپەلەکان بەکاردەهات،لەسالی ١٨٤٤چوار هێلی دەریای هەبووە بۆ گواستنەوەی گەشیاران وپۆستە لەئەستەنبۆل بۆ لەندەن جگە لەهێلی دیکە لەدەریای رەش ودانوب [٣٧].

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە لەدەرئەنجامی ئەو گۆرانکاریە خێرایەی کەشتی لەرووی قەبارەوخێرای بووە هۆکارێك بۆ فراوان بوونی ئالو

گۆڕیەکان،کەشتیەهەڵمیەکان شوێنی کەشتیە چارۆکدارەکانیان گرتەوە بۆ گواستنەوەی کەل وپەلە بازرگانیەکان لەناو دەولەتی عوسمانی بۆ ئەوروپا وەبەپێچەوانەوە [٣٨].

## - بنیادنانی بەندەرو پەرەپێدانی :

لەگەڵ ئەو گۆرانکاریانەبنیادنانی بەندەرەکان دوور نەبوون لەگرنگی دان بەشێوەیەك کۆمپانیا بیانیەکان بایەخی گەورەیان بۆئەم لایەنە دانابوو،بەندەری ئەزمیربەیەکەمین بەندەر بووکەگرنگیان پێداوبەرەوپێش چوو،ناو دەولەتی عوسمانی بەتایبەتی دوای وەرگرتنی جیاوگەی کۆمپانیاکانی بەریتانیا،ساڵی ١٨٦٧دواتر پێنج لەخۆی زیادی کرد لەرووی بەتال کردنەوەی کەل وپەلەهاوردەکان [٣٩].

## - هێلی ئاسنی :

گرنگی دان بەهێلی ئاسنی لەلایەن ئەوروپیەکان لەناو دەولەتی عوسمانی پانتایەکی فراوانی گرتەوە، هەرچەندە لەسەرەتاکاندا شێوازێکی ئاسای هەبووە،بەلام لەساڵی١٨٥٦ لەرێگای سوود وەرگرتن لەسەرمایەی بەریتانیا توانرا هێلی ئاسنی (کوستنجە – جرنافودا) هێلی (ئەزمیر– ئایدن) دروست بکرێت کەهێلی دووەم کاری پێکرا تاکو ساڵی ١٨٦٦ [٤٠].

بەرلە تەواوکردنی هێلی(ئەزمیر –ئایدن) کۆمپانیای بەریتانیا لەرێگای وەرگرتنی جیاوگە بنیادنانی هێلی (روسنجق –فارنا) لەساڵی(١٨٦١) لەهێلی (ئەزمیر – قەسەبە) ساڵی (١٨٦٣) کەهەردووکیان لەساڵی ١٨٦٦تەواو بوون،سەرەرای ئەوانەش چەندین هێلی ئاسنی بەسەرمایەی فەرەنسی

ئەنجامدراوە لەوانە هێلی (سالۆنیك – ئیستانبول)،هێلی (سالۆنیك – موناستیر) کەهەریەکەیان بە درێژایی(٥١٠کم ) بۆ یەکەمیان و(٢١٩کم ) بۆ دووەمیان [٤١].

سەبارەت بەهێلی ئاسنی (بەغدا –بەرلین)گەورەترین پرۆژەی بەناوبانگ بوو لەبواری هێلی ئاسنی لەناو دەولەتی عوسمانی بەهۆی ئەو ململانیە زۆرەی لەنێوان وولاتانی سەرمایەداری دا بۆ دەستەبەرکردنی ئەو پرۆژەیە، دوابەدوای ململانیەکان بەلام ئەلمانیا لە٥ی ئازاری١٩٠٢ توانی جیاوگەی ئەو پرۆژەیە بەدەست بهێنێت [٤٢].

## - هۆکارەکانی پەیوەندی وگەیاندن :

گەشەسەندنی ئابووری کاریگەری خۆی دروست کرد لەسەر هۆکارەکانی گەیاندن،بۆ ئەم مەبەستە بۆیەکەمین جار لەسالی(١٨٣٤)لەئەستامبۆل خزمەتگوزارەکانی گەیاندنی هاوچەرخ دەرکەوت،وەبەشێوەیەکی فراوانیش ناوچەکانی تری گرتەوە،لەسالی (١٨٦٨) لەناو دەولەتی عوسمانی نزیکەی (٢٥٨) سەنتەری گەیاندنی هەبووە،لەسالی (١٩٠٨) ئەم ژمارەیە زیادی کرد بۆ (١٢٩٧)سەنتەر کەئەرکی گواستنەوەی نامە وپارەو نمونەی کەل وپەلی بازرگانی کردووە[٤٣]، هەروەها سەبارەت بەهێلی تەلەگراف لەناو دەولەتی عوسمانی سەرەتاکەی دەگەرێتەوە بۆ کاتی جەنگی قرم (١٨٥٣–١٨٥٦)،وەلەماوەی سالانی (١٨٨٢–١٩٠٠) هێلی تەلەگراف لە ٢٣هەزار کم بۆ ٥٠هەزار هێلی تر زیادی کرد[٤٤].

## ٢-جیاوگەی بیانی لەناو دەولەتی عوسمانی :

زۆربەی زۆری پرۆژەکانی کەلەپێشوودا باسمان کردووە لەرێگای جیاوگە ئەنجام دراوە،ئەمەش کاریگەری راستەوخۆی دروست کرد لەسەر دەرفەتی پەیداکردنی جیاوگە لەسنووری دەرەوەی وولاتانی سەرمایەداری ئەورووپی کەبەشێوەیەك لەچوارچیوەی ناوەخۆی دا بەهۆی زیادبوونی بەرهەم وزۆربوونی سەرمایەدەیان نالاند،جیاوگەی ئەورووپی لەناو دەولەتی عوسمانی کێبرکێ و ململانێ ی زۆری لەسەرکراوە لەلایەن وولاتانی سەرمایەداری بۆ وەدەست هێنانی جیاوگەی زیاتر بەمەبەستی پەرەپێدان بەسەرمایەو ئابووری وولاتەکەیان،بۆ ئەم مەبەستە دەولەتی عوسمانی باشترین شوێنە بۆ وەبەرهێنان، سەبارەت بەفەرەنسا قەبارەی وەبەرهێنانی لەناو دەولەتی عوسمانی لەسالی (١٨٨١) بریتی بوو لە (٨٥) ملیۆن فرنك،ئەم رێژەیەش رووی لەزیاد بوون کرد لەسالی (١٨٩٥) بووە (٢٩٢) ملیۆن وە لەسالی (١٩٠٩) زیادی کردبووە (٥١١) ملیۆن فرنك،لەسالی (١٨٩٥) جیاوگەی بیانی لەناو دەولەتی عوسمانی گەیشتە (٧٤١) ملیۆن فرنك، ئەم رێژەیە تاکو سالّی (١٩١٤) زیادی کرد کە پشکی جیاوگەی فەرەنسا گەیشتە ٤٥٪وەپشکی ئەلمانیا ٢٥٪،پشکی بەریتانیاگەیشتە ١٦٪(٤٥).

لەلایەکی تر کاری جیاوگەی بیانی لەناو دەولەتی عوسمانی بووە هۆکارێك بۆ دامەزراندنی بانك بەمەبەستی ئاسانکاری بۆ ئالوگۆرکردنی پارەوپێدانی قەرز،بۆ ئەم مەبەستە لەو بارودۆخەئابووریە نوێیەی دەولەتی عوسمانی بووە راستیەك بۆ دامەزراندنی بانك،بۆیە لە٢٤ئایاری (١٨٥٦) یەکەمین هەولدرا بۆ دامەزراندنی بانك کەبریتی بوو لەدامەزراندنی (بانکی عوسمانی) بەیارمەتی سەرمایەی بەریتانی لەسالی (١٨٦٣) بەگرنگترین دەزگای مەسرەفی دانرا و بووە بانکی رەسمی

دەوڵەتی عوسمانی لەژێر ناونیشانی (بانکی ئیمپراتۆی عوسمانی دواتر فراوان بوو وەچەندین لقی تری لێ بۆتەوە [٤٦].

دواتر چەندین بانکی ترکرایەوە لەوانە فەرەنسا یەکەمین لقی خۆی لە ساڵی (١٨٧٥) لەناو دەوڵەتی عوسمانی کردەوە بوو کە بەناوی (کریدی لیونیە) وە بانکی ئەلمانی لەگەڵ دروست بوونی یەکێتی ئەلمانیا دروست بووە وە بەرێژەی سەرمایەی ١٥ملیۆن مارك جیاوگەی لەناودەوڵەتی عوسمانی کردەوە دواتر زیادی کرد [٤٧].

## تەوەرەی چوارەم :

## کاردانەوەی گۆرانکاری یەکان لەسەر بارودۆخی ئابووری دەوڵەتی عوسمانی :

لەراستی دا ئەو گۆرانارییەی کەبەسەر بارودۆخی ئابووری داهات لەدەوڵەتی عوسمانی کاردانەوەیەکی قووڵی لەسەر بارودۆخی ئابووری هەبوو،یەکێك لەمێژوو نوسە تورکەکان دەربارەی ئەوبارودۆخە بەراشکاوی دەڵێت (گۆرانکاری یەکان شۆرشێکی بچوکراوە بوون)بەتایبەتی لەرووی کشتوکالیەوە کەبەچالاکیەکی سەرەکی دەوڵەتی عوسمانی هەژماردەکرا،لەوبارەیەوە بەرهەمەسروشتیەکان لەناو دەوڵەتی عوسمانی رووی لەکەم بوون کرد،لەشوێنی ئەواندا کەل وپەلی هاوردە نرخی بەرز بووە،لەلایەکی تر نرخی زەوی زۆر بەرز بووە تا لە(١٨٤٤-١٨٥٩)گەیشتە رێژەی ٧٥٪ [٤٨].

بەرزبوونەوەی نرخی زەوی لەهەڵکشان دابوو لەگەڵ بەرزبوونەوەی داواکاری لەسەر بەرهەمەکشتوکالیەکان لەناودەوڵەتی عوسمانی ئەمەش وایکرد زەوی ببێتە کالایەکی باش بەمەبەستی بازرگانی پێ کردن بەتایبەتی لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەت وکەسایەتی سەربازی کەبەتوندترین شێواز بەکاریان

دەهێنا بۆ وەدەست هێنانی رووبەرێکی فراوانی زەوی یاخود پێدانی بەرتیل پێیان [٤٩]. ئەم دیاردەیە سولتانەکانیشی گرتەوە بۆ ئەم مەبەستە سولتان عبدالحمید دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩) تەنها لەسوریا نزیکەی ١٥ملیۆن دۆنم زەوی بەپیتی هەبووە لەگەڵ ١١١٤گوند [٥٠].

شایانی باسە دیاردەی مولکەگەورەکان وگرنگی پێدانی پەلی هاوێشت بۆجیاوگەی بیانی لەسەرووی هەموویان بەریتانیاکەهەولیان دا لەرێگای سوود وەرگرتنیان یاسای سالی ١٨٦٧ کەماف درابوو بەبیانیەکان لەناو دەولەتی عوسمانی ببنە خاوەن مولکی زەوی وخانووبەرە،ئەمەش وای لەبازرگانە بیانیەکان کرد وەبەرهێنان لەسەر شێوازی سەرمایەداری بکەن لەبەکارهێنانی ئامێروکاری کشتوکالی پێشکەوتوو [٥١].

ئەو وەبەرهێنانەی ئەوروپیەکان لەناو دەولەتی عوسمانی ئەنجامیاندا زۆر بەخێرای بەرەو پێش چوو بەتایبەتی لەشەستەکانی سەدەی نۆزدە،بازرگانە ئەوروپیەکان تەنها لەئەزمیر خاوەنی سێەکی زەویە کشتوکالیەکان بوون،لەسالی ١٨٧٨نیوەی زەویە کشتوکالیەکان هەر لەوناوچەیە دەگەرایەوە بۆ مولکداری ٤١ بازرگانی بەریتانی [٥٢].

سەرۆك هۆزەکان وبریکارەکان ببونە خالی گرێدان لەنێوان جوتیاران وریباخۆرەکان،بەشێوەیەك خاوەن پارەکان لەرێگای فشارەکانیان بۆ سەر سەرۆك هۆزەکان بۆ ئەوەی جوتیاران ناچار بکەن بەدانەوەی قەرزەکان،هەرچەندە هەندێك لەسەرۆك هۆزەکان لەرێگای پێدانی قەرز بەجوتیاران هەمان رۆلی خاوەن زەویەکانیان دەگێرا بەمەبەستی دەست بەسەر داگرتنی مولکە بچووکەکانی جوتیاران لەرێگای کۆبونەوەی ئەو زیادەیەی کە لەسەر پارەی قەرزی جوتیاران دانرابوو لەکۆتای دا نەیان دەتوانی بیدەنەوە

ناچار زەویەکەی دەست بەسەر دادەگیرا [٥٣].هەر بۆیەش دەکرێت بلێین جوتیاران لەناو دەولەتی عوسمانی زەرەر مەندی یەکەم بوون چونکە هیچ یاسایەك نەبوو پالپشتیان بکات بەلکو خاوەن زەویەکان چەندین باجی جۆراو جۆریان خست بووە سەر شانیان.

لەراستیدا ئەو بارە قورسەی کە خرابووە سەر شانی جوتیاران لەناو دەولەتی عوسمانی بووە هۆی سەرهەلدانی یاخی بوونی جوتیاران لەدەولەت،بەلام ئەم یاخی بوونانەش لەرووی قەبارەو رێکخستنەکان بەدیاری کراوەی مایەوە بەهۆی زال بوونی دەرەبەگایەتی وقورخکاری گەورە خاوەنداره زەویەکان وپەیوەندیەکان لەگەل پیاوانی ئاینی لەناو دەولەتی عوسمانی وهێزە سیاسیەناوەخۆیەکان کەسەپاندنی دەسەلاتی خۆیان لەرووی کۆمەلایەتی وئابووری ورۆشنبیری جوتیاران کردبوو [٥٤].

هەروەها ئەو گۆرانکاریانەجگە لەدێهاتەکان کاریگەری گەورەیان دروست کرد لەسەر بارودۆخی ژیانی شارە گەورەکانی عوسمانیش ،چونکە لەمیانەی گۆرانکاریە ئابوریەکان چەند دەستەیەك نوێ لەناو کۆمەلگەی عوسمانی پەیدابوون کەرۆلیان هەبووە لەئاواکردنی خوری ،لەلایەکی تر بەهۆی گەورەبوونی پەیوەندیە بازرگانیەکانی دەولەتی عوسمانی لەگەلّ سەرمایەداری ئەورووپی رێگای خوشکرد بۆسەرهەلّدانی بورجوازی عوسمانی کەدەستی بەگەشەکردن کرد بەشێوەیەکی خێرا لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە وسەرەتای سەدەی بیست [٥٥].

رۆلی سەرمایەداری وبورجوزای لەناو دەولەتی عوسمانی خۆی چەسپاند بەتایبەتی لەکۆتای سەدەی نۆزدە کەوەکو نیمچە داگیرکەرێك بوو،چەندین کۆسپ وتەگەرەی خستە بەردەم کرداری گەشەکردن بەتایبەت وبەشێوەیەکی

سەرەکی ئەوجیاوگەگەورانەی کەبیانیەکان لێ سوود مەندبوون لەبەرامبەردا بۆ بازرگانەعوسمانیەکان قەدەغەکرابوو،بەتایبەتی ئەوەی پێویست بوو لەرسوماتی گومرگی کەبازرگانەبیانیەکان لێ ی بەخشرابوو[٥٦].لەو هەلو مەرجەدا دەستەیەکی دیکە بازرگان پەیدابوون لەناو دەولەتی عوسمانی کە ببونە بازنەی پێگەیاندنی بازارەناوەخۆیەکان بەبازاری جیهانی زۆر ئەو بازرگانانەش بریتی بوون لە مەسیحی ویهودی،بەهۆی شارەزابوونیان لەزمانی وولاتان،وەهەروەها زۆربەی بازرگانی ئەورووپیشیان لەدەست دابوو [٥٧].

دواتر ئەو دەستەیە تەنها وەکو بازنەی پێگەیاندن نامێنێتەوە بەڵکو هەولەکانی چر کردەوە بۆ خزانە ناو چالاکیە بازرگانیەکان (هێنان وبردن) ودامەزراندنی چەند دەزگایەکی بازرگانی تایبەت بەخۆیان،لە دەرئەنجامی گەشەکردنی برجوازیەتی مەسیحی بەشێوەیەکی خێرا لەبورجوازیەتی موسولمان،ئەو گەشەکردنە ناهاوسەنگی وکاریگەریەکانی لەتایفەکانی ناو دەولەتی عوسمانی دروست کرد بەشێوەیەك کە چەندین تەیاری بیروهزری وبەرژەوەندیە تایبەتیەکان رۆلیان لەبارودۆخی دەولەتی عوسمانی گێرا دواتر چارەنووسی ئەم دەولەتەشی گۆری لەکۆتای سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست، جگەلەش بارودۆخی دیکەش کاریگەری هەبوولەسەر جولانەوەی سیاسی بورجوازی عوسمانی،زۆربەی بازرگانەکان پەیوەست بوون بە کاریگەری بارودۆخ وگەشەکردنی ئابووری وکۆمەلایەتی ودەرەبەگایەتی کشتوکالی کەپەیوەندی راستەوخۆی هەبووە بەسەمایەداری بازرگانی،واتە زۆرێك لەدەرەبەگەکان ببون بەبازرگان بێ ئەوەی لە خاسیەتی دەرەبەگایەتی دابرێن،بەپێچەوانەوە بازرگانەکان ببون بەخاوەن زەوی بۆ ئەوەی واز لەبازرگانی بهێنن،ئەمەش وای

کرد کەلەشارەکان جۆرە تێکهەلکێشانێك دروست بێت لەنێوان هەردوو دەستەکە کەپارێزگاریان لەبەرژەوەندیەکانیان دەکرد لەسەر حسابی جوتیار[٥٨].

## دەرئەنجام

## لەم توێژینەوەیە توێژەر گەیشتە ئەم خالانەی خوارەوە :

١- بۆمان دەردەکەوێت کە هەر لەسەرەتاوە عوسمانیەکان شارەزایەکی باشیان هەبووە لەسەر بازرگانی وکرداری ئالْ وگۆرکردنی کالا کانیان ناوچەکانی دەوروبەریان ئەنجام داوە جگە لەوەی کە سولتانەکانی عوسمانیش گرنگی زۆر یان بە چالاکی بازرگانی داوە چ لەناوەخۆ بێت ین لەدەرەوە کەوەکو لایەنێکی گرنگی ئابووری،وەبەرزکردنەوەی ئاستی داهاتی نەتەوە.

٢-شۆرشی پیشەسازی کاریگەری زۆری کردە سەر چالاکی بازرگانی لەناو دەولەتی عوسمانی بەوەی کە بەرو ئاستێکی بەرز رۆیشت وەگەشەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی،وەچەندین رێکەتنامەی بازرگانی مۆرکرد لەگەلْ وولاتانی ئەوروپا کەئەمەش کاریگەریەکی زۆری کردە سەر لایەنی ئابووری دەولەتی عوسمانی بەتایبەتی رەوشی بازرگانی ،لەلایەکی تریش بەهۆی ئەو زیادبوونەی کەبەرهەمی پیشەسازی بەخۆیەوە بینی لە ئەوروپای سەرمایەداری پێویستی بەساغ کردنەوەی بەرهەمە زیادەکانە،ئەمەش وای کرد کەوا وولاتانی ئەوروپی بیر لەدۆزینەوەی بازار بکەنەوە ئەویش ناوچەکانی ژێر دەستی دەولەتی عوسمانی بوو،بۆیە ئەم چالاکیەبەرێژەیەکی بەرچاو زیادی کرد وە ئابووری دەولەتی عوسمانی پەیوەست بوو بەسەرمایەداری ئەوروپی بەتایبەتی لەسەرەتای سەدەی نۆزدە کەکاریگەری زۆری کردەسەر چالاکی بازرگانی.

٣- چالاکی بازرگانی لەدەولەتی عوسمانی گەشە وپیشکەوتنێکی زۆری بەخۆوە بینیوە بەپێی ئەوەی کەدەولەتی عوسمانی زۆر ناوچەیان لەدەست بوو لەهەرسێ کیشوەری ئاسیا وئەوروپاو ئەفەریقیا،بۆیە توانیویانە سوودی زۆر لەسێ ئاوی گەورە وەربگرن کەوانیش بریتی بوون لە دەریای ناوەراست ودەریای سوور ودەریای رەش وێرای کەنداوی عەرەبی.

٤-لایەنی ئابووری دەولەتی عوسمانی بەتایبەتی بازرگانی هەڵکشان وداکشانی بەخۆیەوە بینیوە،چونکە بەهۆی ئەوەی کەفراوان خوازی زۆریان ئەنجام داوە لەکاتی دەست گرتن بەسەر ناوچەکانی رۆژهەلات توانی ناوچە بازرگانیەگرنگەکان کۆنترۆل بکات ولایەنی بازرگانی بەرەو هەڵکشان بچێ بەپێچەوانە لەکاتی شکانی لەشەرەکان دا کە ناوچەکانی لەدەست دەچوو ئەمەش دەبووە هۆی داکشان لەلایەنی ئابووری.

٥-لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە گۆرانکاری دروست بوو لەپەیوەندیە بازرگانیەکانی بۆ بەرژەوەندی جیهانی سەرمایەداری لەوانەش گۆرانکاری لەهۆیەکانی گواستنەوە وەکو دروست کردنی پیشەسازی کەشتی وبنیادنانی بەندەرو هێلی ئاسنی،وە لەلایەکی تر گۆرانکاری لەجیاوگەی ئەورویی لەناو دەولەتی عوسمانی کێبرکێ و ململانێ ی زۆری لەسەرکراوە لەلایەن وولاتانی سەرمایەداری بۆ وەدەست هێنانی جیاوگەی زیاتر بەمەبەستی پەرەپێدان بەسەرمایەو ئابووری وولاتەکەیان،

٦- ئەو گۆرانکاریانە کەلەلایەنی ئابووری دەولەتی عوسمانی رووی دا کاردانەوەی زۆر خراپی کردە سەر بەرهەمی سروشتیەکان ورووی لەکەمی کرد، وەپەیدابوونی گەندەڵی وبەرتێل، رەوشی ئابووری دەولەتی عوسمانی شپرزە بوو،لەلایەك بەلاز بوونەوەی نرخی زەوی وزار وە بیانیەکان بوونە خاوەن زەوی

لەناو دەولەتی عوسمانی،لەلایەکی ترسەپاندنی باجی قورس بەسەر جوتیاران ئەمەش بووە هۆی بێزار بوونی جوتیاران، بووە هۆی سەرهەلدانی یاخی بوونی جوتیاران لەدەولەت،بەلام ئەم یاخی بوونانەش لەرووی قەبارەو رێکخستنەکان بەدیاری کراوەی مایەوە بەهۆی زال بوونی دەرەبەگایەتی وقورخکاری.

## لیستی سەرچاوەکان

### ١- کتێبە عەرەبی و وەرگێردراوە عەرەبییەکان

١-ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى الحديث والمعاصر، مكتبة دار العلم للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٧م.

٢-إبراهيم شريف، الشرق الأوسط. دراسة لاتجاهات سياسة الاستعمار حتى قيام ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، بغداد، ١٩٦٥م.

٣-احمد اق كوندز و سعيد اوزتورك، تاريخ الدولة العثمانية (٣٠٢ سؤال و جواب توضح حقائق غائبة عن الدولة العثمانية)، استانبول، ٢٠٠٨م.

٤-اسماعيل احمد ياغى، الدولة العثمانية في التاريخ الاسلامى الحديث، مكتبة العبيكان، الرياض، ١٩٩٨م.

٥-اكمل الدين احسان اوغلى، الدولة العثمانية تاريخ وحضارة، ترجمة: صالح سعداوى، المجلد الاول، استانبول، ١٩٩٩م.

٦-بدر الدين السباعي، أضواء على الرأسمال الأجنبي في سوريا ١٨٥٠-١٩٥٨، دمشق، ١٩٦٨م.

٧-بول دومون، تاريخ الدولة العثمانية (فترة التنظيمات ١٨٣٩-١٨٧٨)، اشراف : روبير مانتران، ترجمة : بشير السباعى، الجزء الثانى، دار الفكر للدراسات والنشر،القاهرة، ١٩٩٣م.

٨-خليل اينالجيك، دونالد كواترت، التاريخ الاقتصادى والاجتماعى للدولة العثمانية، ترجمة: قاسم عبدة قاسم،مجلد الثانى، دار المدار الاسلامى، ليبيا، ٢٠٠٧م.

٩-دونالد كواترت، الدولة العثمانية١٧٠٠-١٩٢٢، ترجمة: أيمن أرمنازي، الرياض، ٢٠٠٤م.

١٠-ز.ي.هرشلاغ، مدخل إلى التاريخ الاقتصادي الحديث للشرق الأوسط، ترجمة :مصطفى الحسني، بيروت، ١٩٧٣.

١١-ستيفن همسلى لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياطن الطبعة الرابعة،بغداد،١٩٦٨م.

١٢-سعدى عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اربيل،٢٠٠٦م.

١٣-شارل عيساوي، التاريخ الاقتصادي للشرق الأوسط وشمال أفريقيا، ترجمة سعد رحمي، بيروت، ١٩٨٥م.

١٤-عباس اسماعيل صباغ، تاريخ العلاقات العثمانية الايرانية، الطبعة الاولى، دار النفائس للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٩م.

١٥-عبدالله حنا، القضية الزراعية والحركات الفلاحية في سوريا ولبنان(١٨٢٠-١٩٢٠)، القسم الأول، بيروت، ١٩٧٥م.

١٦-على حسون، تاريخ الدولة العثمانية و علاقاتها الخارجية، الطبعة الرابعة، المكتب الاسلامى،بيروت، ٢٠٠٢م.

١٧-على محمد محمد الصلابى، الدولة العثمانية عوامل النهوض واسباب السقوط، الطبعة الثانية، المنصورة، ٢٠٠٦م.

١٨-الكسندر أداموف، ولاية البصرة في ماضيها وحاضرها، الجزء الأول، ترجمة الدكتور هاشم صالح التكريتي، البصرة، ١٩٨٢م.

١٩-محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٧٦م.

٢٠-ن.أ.خالفين، الصراع على كردستان. المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ترجمة: أحمد عثمان أبوبكر، بغداد، ١٩٦٩م.

٢١-هاشم صالح التكريتي، الإستعمار. أشكاله تطوراته أساليبه، بغداد، ١٩٨٩م.

٢٢-هاملتون جيب و هارولد بوين، المجتمع الاسلامى والغرب، ترجمة: عبدالمجيد حبيب قيسى، الجزء الاول، القسم الاول، الطبعة الاولى، دمشق، ١٩٩٧م.

٢٣-يلماز أوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة عدنان محمود سلمان، المجلد الثاني،مراجعة:محمود الانصاري،، اسطنبول، ١٩٩٠م.

٢- كتێبە بيانيەكان (الاجنبيە)

١-Charles Issawi, The Economic History of Turkey ١٨٠٠-١٨٥٣, Chicago, ١٩٨٠.

٢-H.Gerber, The Social Origins of the Modern Middle East, London, ١٩٨٢.

٣-J.C.Hurewitz ,Diplomacy in the Near and Middle East. A Documentary Record ١٥٣٥-١٩١٤", Ed., Vol.I, New York, ١٩٧٢.

٤-Roger Owen, The Middle East in the World Economy ١٨٠٠-١٩١٤, New York, ١٩٨١.

٥-W.S.Monroe, Turkey and the Turks an account of the Lands the, Peoples and the Institutions of the Ottoman Empire, New Impression, London, ١٩٨٥.

٣- وتارو لێکۆلینەوەکان:

أ- عەرەبییەکان

١-بوريس توبوليف، سكة حديد بغداد برلين وصراع النفوذ في الشرق الأوسط، ترجمة سعيد نفطجي،(مجلة)، ''آفاق عربية'' بغداد،العدد١١، تشرين الثاني١٩٩٢م.

٢-خليل علي مراد، تغلغل الرأسمال الأجنبي في الدولة العثمانية ١٨٥٤-١٩١٤،(نشرة علمية) ''دراسات تركية''، الموصل، العدد٢، كانون الأول١٩٩١.

٣-ل.ن.كتلوف، خصائص وأهمية الحركات الجماهيرية في المشرق العربي قبيل ثورة الاتحاديين، ترجمة الدكتور هاشم صالح التكريتي،(مجلة) ''المؤرخ العربي''، بغداد، العدد٨.

٤-وليد العريض، تاريخ الامتيازات في الدولة العثمانية وآثارها،(مجلة)،''دراسات'' الأردن، المجلد ٢٤، العدد١، شباط١٩٩٧.

ب- کوردییەکان

١-مستەفا محەمەد کەریم، جەنگی قەرم ١٨٥٣- ١٨٥٦ هۆکار و دەرئەنجامەکانی، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (١٠)، سالی سێیەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٩ز.

---

(١) احمد اق كوندز و سعيد اوزتورك، تاريخ الدولة العثمانية (٣٠٣ سؤال و جواب توضح حقائق غائبة عن الدولة العثمانية)، استانبول، ٢٠٠٨م، ص ص ٦٩٨-٦٩٩.

(٢) على محمد محمد الصلابى، الدولة العثمانية عوامل النهوض واسباب السقوط، الطبعة الثانية، المنصورة، ٢٠٠٦م،ص ١٣٦.

(٣) عباس اسماعيل صباغ، تاريخ العلاقات العثمانية الايرانية، الطبعة الاولى، دار النفائس للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٩م،ص ص٢٣٥،٢٣٢.

(٤) المصدر نفسه، ص ٢٣٤.

(٥) عباس اسماعيل صباغ، المصدر السابق،ص٢٣٥.

(٦) اسماعيل احمد ياغى، الدولة العثمانية في التاريخ الاسلامى الحديث، مكتبة العبيكان، الرياض، ١٩٩٨م،ص ص ١٤٠-١٤١.

(٧) بول دومون، تاريخ الدولة العثمانية (فترة التنظيمات ١٨٣٩-١٨٧٨)، اشراف : روبير مانتران، ترجمة : بشير السباعي، الجزء الثاني، دار الفكر للدراسات والنشر،القاهرة، ١٩٩٣م، ص٦٣ " خليل اينالجيك، دونالد كواترت، التاريخ الاقتصادي والاجتماعي للدولة العثمانية، ترجمة: قاسم عبدة قاسم،مجلد الثاني، دار المدار الاسلامي، ليبيا، ٢٠٠٧م، ص ٥٨٠.

(٨) هاملتون جيب و هارولد بوين، المجتمع الاسلامي والغرب، ترجمة: عبدالمجيد حبيب قيسي، الجزء الاول، القسم الاول، الطبعة الاولى، دمشق، ١٩٩٧م، ص ٢٩.

(٩) خليل اينالجيك، دونالد كواترت، المصدر السابق، ص ٣٨.

(١٠) بەلطە ليمان : ئەم ريكەوتنامە بازرگانيە بوو كەلە١٦ی ئابی ١٨٣٨ لەنيوان دەولەتی عوسمانی و بەريتانيا مۆر كرا كەتيدا رسوماتی گومرگی دياريكرا بەرێژەی ١٢٪ بۆ هاوردەو ٥٪ بۆ نێردراو ن وە رەتكردنەوەی هەموو قۆرخكاريانەی حكومەت لەدەولەتی عوسمانی وە پيدانی مافی بەستنی پەيوەندی راستەوخۆی بازرگانە بيانيەكان بەبازرگانی ناوخۆی دەولەتی عوسمانی. بۆ پتر زانياری بروانە : ز.ي.هرشلاغ، مدخل إلى التاريخ الاقتصادي الحديث للشرق الأوسط، ترجمة :مصطفى الحسني، بيروت، ١٩٧٣، ص٦٢-٦٤ ؛ J.C.Hurewitz ,Diplomacy in the Near and Middle East. A Documentary Record ١٥٣٥- ١٩١٤", Ed., Vol.I, New York, ١٩٧٢, PP.١١٠-١١١.

(١١) ن.أ.خالفين، الصراع على كردستان. المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ترجمة: أحمد عثمان أبوبكر، بغداد، ١٩٦٩، ص٨٧.

(١٢) هاشم صالح التكريتي، التغلغل الألماني في المشرق العربي،(مجلة) ''المؤرخ العربي''، بغداد، العدد٢٧، ١٩٨٦، ص٤٧" الدكتور إبراهيم شريف، الشرق الأوسط. دراسة لاتجاهات سياسة الاستعمار حتى قيام ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، بغداد، ١٩٦٥، ص٨١.

(١٣) وليد العريض، تاريخ الامتيازات في الدولة العثمانية وآثارها،(مجلة)،''دراسات''الأردن، المجلد ٢٤، العدد١، شباط١٩٩٧، ص١٥٩.

(١٤) هاشم صالح التكريتي، الإستعمار. أشكاله تطوراته أساليبه، بغداد، ١٩٨٩، ص٣٥.

(١٥) يلماز أوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة عدنان محمود سلمان، المجلد الثاني،مراجعة:محمود الانصاري،، اسطنبول، ١٩٩٠، ص٥٩٣.

(١٦) لۆرد ستراتفورد: بالوێزی بەریتانیا بوو لە ئەستانە کە بەبەهێزترین و چالاکترین بالوێز لەو سەردەمە هەژمار دەکرێت، بەتایبەتی لەسالی ١٨٤٨ بەشێوەیەك لەکۆشکی سولتانی و باب ئەلعالی زۆر گرنگیان پێداوەو بە سولتان ستراتفۆرد ناسرابوو، ئەم بالوێزە زۆر گرنگی داوە بە پارێزگاریکردن لەدەولەتی عوسمانی و رۆلی گێراوە لەراکێشانی بەریتانیاو فەرەنسا بۆ پالپشتی کردن لەدەولەتی عوسمانی دژ بە روسیای تەزاری. مستەفا محەمەد کەریم، جەنگی قەرم ١٨٥٣- ١٨٥٦ هۆکار و دەرئەنجامەکانی، گۆڤاری مێژوو، ژمارە (١٠)، سالی سێیەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٩ز، ل ١٥١.

(١٧) ن.أ.خالفين، المصدر السابق، ص٦٦.

(١٨) عباس اسماعيل صباغ، المصدر السابق،ص٥٥.

(١٩)المصدر نفسه، ص٥٦.

(٢٠)سعدى عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اربيل،٢٠٠٦م، ص٣٥٠.

(٢١) عباس اسماعيل صباغ، المصدر السابق،ص٢٣٢.

(٢٢) اكمل الدين احسان اوغلى، الدولة العثمانية تاريخ وحضارة، ترجمة: صالح سعداوى، المجلد الاول، استانبول، ١٩٩٩م، ص ص ٧٠٣-٧٠٤.

(٢٣) ز.ي.هرشلاغ، المصدر السابق، ص ص ٩٨-٩٩.

(٢٤) عباس اسماعيل صباغ، المصدر السابق،ص٣٧.

(٢٥)على حسون، تاريخ الدولة العثمانية و علاقاتها الخارجية، الطبعة الرابعة، المكتب الاسلامى،بيروت، ٢٠٠٢م،ص١٠٦.

(٢٦) عباس اسماعيل صباغ، المصدر السابق،ص٣٧.

(٢٧) ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربى الحديث والمعاصر، مكتبة دار العلم للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٧م،ص ص ١٦-١٧.

(٢٨) اكمل الدين احسان اوغلى، المصدر السابق،ص٧١٠.

(٢٩) المصدر نفسه، ص ٧١١.

(٣٠) اكمل الدين احسان اوغلى، المصدر السابق،ص٧١١.

(٣١)ستيفن همسلى لونكريك، اربعة قرون نت تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياطن الطبعة الرابعة،بغداد،١٩٦٨م،ص١٣٩.

([32])سعدی عثمان حسين، المصدر السابق, ص ص٣٥٣–٣٥٤.

([33]) سعدی عثمان حسين، المصدر السابق, ص٣٦٠.

([34]) ستيفن همسلي لونكريك، المصدر السابق، ص١٣٩.

([35]) هاملتون جيب و هارولد بوين، المصدر السابق، ص ٢٣٧.

([36]) ز.ي.هرشلاغ، المصدر السابق، ص٩٩.

([37]) شارل عيساوي، التاريخ الاقتصادي للشرق الأوسط وشمال أفريقيا، ترجمة سعد رحمي، بيروت، ١٩٨٥، ص ص٨٩–٩٠.

([38]) دونالد كواترت، الدولة العثمانية١٧٠٠–١٩٢٢، ترجمة: أيمن أرمنازي، الرياض، ٢٠٠٤، ص٢٢١.

([39]) شارل عيساوي،المصدر السابق،ص٩٢.

([40]) محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٧٦، ص٢٧٠.

([41])Charles Issawi, The Economic History of Turkey ١٨٠٠–١٨٥٣, Chicago, ١٩٨٠, P.١٤٨.

([42]) بوريس توبوليف، سكة حديد بغداد برلين وصراع النفوذ في الشرق الأوسط، ترجمة سعيد نفطجي،(مجلة)، ''آفاق عربية''بغداد،العدد١١، تشرين الثاني١٩٩٢م،ص ص٧٠ –٧٧.

([43]) W.S.Monroe, Turkey and the Turks an account of the Lands the, Peoples and the Institutions of the Ottoman Empire, New Impression, London, ١٩٨٥, P.١٥٩.

([44])Charles Issawi, Op. Cit., P.١٥١.

([45]) شارل عيساوي،المصدر السابق،ص ص ١٢٢–١٢٣.

([46]) الكسندر أداموف، ولاية البصرة في ماضيها وحاضرها، الجزء الأول، ترجمة الدكتور هاشم صالح التكريتي، البصرة، ١٩٨٢، ص ص٩٢–٩٥.

([47])خليل علي مراد، تغلغل الرأسمال الأجنبي في الدولة العثمانية ١٨٥٤–١٩١٤،(نشرة علمية) ''دراسات تركية''، الموصل، العدد٢، كانون الأول١٩٩١، ص١٥٥.

([48])Charles Issawi, Op. Cit., P.٢٠٢.

([49])H.Gerber, The Social Origins of the Modern Middle East, London, ١٩٨٢, P.١١٢.

([50]) عبدالله حنا، القضية الزراعية والحركات الفلاحية في سوريا ولبنان(١٨٢٠-١٩٢٠)، القسم الأول، بيروت، ١٩٧٥، ص٩٩.

([51])Charles Issawi, Op. Cit., P.٢٠٢.

([52])Roger Owen, The Middle East in the World Economy ١٨٠٠-١٩١٤, New York, ١٩٨١, P.١١٤.

([53]) عبدالله حنا،المصدر السابق، ص٤٣.

([54]) ل.ن.كتلوف، خصائص وأهمية الحركات الجماهيرية في المشرق العربي قبيل ثورة الاتحاديين، ترجمة الدكتور هاشم صالح التكريتي،(مجلة) ''المؤرخ العربي''، بغداد، العدد٨، ص١٥٤.

([55]) بدر الدين السباعي، أضواء على الرأسمال الأجنبي في سوريا ١٨٥٠-١٩٥٨، دمشق، ١٩٦٨، ص١٣.

([56]) هاملتون جيب و هارولد بوين، المصدر السابق، ص ٣٤٠.

([57]) المصدر نفسه، ص ص ٣٣٨-٣٣٩.

([58]) عبدالله حنا،المصدر السابق، ص٤٣.

# کۆنگرەی ڤیەننا

بارزان محمد علی

## تەوەرەی یەکەم

## ئەوروپاو کۆنگرەی ڤیەننا

### باسی یەکەم/ بارودۆخی ئەوروپا پێش کۆنگرەی ڤیەننا:

ڕووداوە مێژووییەکانی ئەوروپا لە دوای شۆڕشی فەرەنسیەوە پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو بە بەستنی کۆنگرەی ڤیەننا بۆیە پێویستە تیشکێکی خێرا بخەینە سەر فراوانخوازییەکانی ناپلیۆن لە ئەوروپا.

لە ماوەی نزیکەی چارەکە سەدەیەکدا(١٧٩٢-١٨١٥) فەرەنسا چەندین جەنگی کردو، لە سەردەمی ناپلیۆن دا فەرەنسا بەشێکی زۆری ئەورووپای داگیرکردو پاراسەنگی نێودەوڵەتی تێکدا ئەوەش مەترسیەکی زۆری خستە دڵی وولاتانی گەورەی وەك ڕوسیاو پروسیاو نەمساو بەریتانیاوە[١].

ناپلیۆن کاری لەسەر گۆڕینی نەخشەی سیاسی ئەوروپا کرد خاکی فەرەنسا لە سەردەمی ناپلیۆن بەرێژەیەك فراوان بوو کە پێشتر وای بە خۆوە نەدیبوو جگە لە خاکی خۆی بەلجیکاو هەموو زەوییەکانی نێوان فەرەنساو ڕووباری(راین)ی دەگرتەوە، دواتر کاری بۆ ئەوەکرد کەنارەکانی ئەڵمانیا تا دەریای بەلتیکی ڕۆژئاوا بخاتە ژێر دەستی جگە لەوەش دەستی بەسەر هەموو کەنارەکانی ئیتاڵیا داگرت لە سنوری فەرەنساوە تاوەکو ڕۆما[٢].

ناپلیۆن هەر بە فراوانکردنی سنوری فەرەنسا نەوەستا بەڵکو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی هەوڵی گۆڕینی سیماکانی ئەوروپای دا بۆ نموونە سویسرا هەر بە ناوی کۆمارێکی سەربەخۆ بوو بە ڕواڵەت سەر بە فەرەنسا بوو، جگە لەوەی هەڵسا بە دامەزراندنی میرنشینی فێرسۆفیا لە پۆلۆنیا کە بە مەلیکی سەکسۆنیای بەخشی کە دۆستی خۆی بوو بەبێ گوێدان بە بەرژەوەندی و مافەکانی بروسیاو نەمساو روسیا[٣].

لە نێوان سالآنی (١٨٠٥-١٨٠٧) ناپلیۆن زنجیرەیەك سەرکەوتنی سەرسوڕهێنەری بەدەست هێنا لە ناوچەکانی (ئۆلم-ئۆستەلیتز-یەننا-فرید لاند) ئەم سەرکەوتنانە سەرەتا نەمساو دواتریش برووسیایان ناچارکرد بۆ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەو ڕێکخستنی بارودۆخ لە (تلست) لە نێوان ناپلیۆن و ئەسکەندەری قەیسەری ڕووسیا ئەمەش گورزێکی ئیمپراتۆری فەرەنسی بوو بەسەر ئەورووپای ناوەڕاستدا[٤].

لە ئەڵمانیا لە نێوان ئەو خاکانەی بە فەرەنسای لکاندبوون لەگەڵ هەندێك لە خاکەکانی بروسیاو نەمسا دەوڵەتێکی لە چەند دەوڵەتۆکە دروست کردبوو ناوی نابوو(یەکیەتی راین) ئەم دەوڵەتەشی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی[٥].

لە ڕێگەی ئەم نەخشەیەوە دەبینین ئەورووپای سیاسی سەردەمی ناپلیۆن زۆر جیایە لە ئەورووپای بەر لە شۆڕش ناهاوسەنگی و خۆسەپاندنی فەرەنسای بە ڕوونی پێوە دیارە کە ئەمەش لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی وڵاتە زەبەلاحەکانی وەکو ئینگلتەراو ڕوسیا یەك ناگرێتەوە.

لەو کاتەدا کە جیهان بە چاوی گەشەسەندنەوە دەیڕوانیە ئیمپراتۆریەتەکەی ناپلیۆن بەڵام خۆری ناپلیۆن خێرا بەسەر ئاوابوون داکەوت ئەمەش لەبەر چەند

هۆکارێکی نابەرچاو کە هێزەکەیان داماڵی و بەرەو لێکهەڵوەشان و لەناوچوونیان برد.

گیانی نەتەوایەتی لە ئەوروپا کە دەیانوویست لە دەست ناپلیۆن ڕزگاریان بێت هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ لاوازبوونی دەسەڵاتی ناپلیۆن و پاشەکشەکردنی هێزەکانی کە دواتریش کاریگەری هەبوو لەسەر تێکچوونی پەیوەندی هاوڕێیەتی ناپلیۆن و ئەسکەندەری قەیسەری ڕووسیا، چەند هۆکارێك بوونە هۆی دوورکەوتنەوەی ئەو دوو هاوڕێیە لە یەکتر تا ئەوەی دواتر بڕیاریاندا شمشێر دادگاییان بکات، ئەو هۆکارانەی کە دەستێکی باڵایان هەبوو لە ڕووبەڕووبونەوەی ئەم دوو کەسایەتیە بریتی بوون لە[٦]:

١- گەمارۆدانی کیشەوەری کە زیانی بێ بەرامبەری بە بەرژەوەندییەکانی ڕووسی دەگەیاند.

٢- ترسی ڕووسیا لەوەی ناپلیۆن پۆڵەندا بکاتە دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەهێزی وا کە هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی ڕووسیا بکات.

٣- ناپلیۆن بە نهێنی کاری دەکرد بۆ ئەوەی پرۆژەکانی ئەسکەندەری قەیسەری ڕووسیا هەڵبوەشێنێتەوە کە بریتیی بوو لە گرتنەخۆی هەرێمەکانی دانوب و فنلندا بۆ لای ڕووسیا.

لە (١٢/نیسانی/١٨١٢) قەیسەری ڕووسیا هەموو ئامادەباشیەکی تەواوکردبوو ئەوسا نامەیەکی بۆ ناپلیۆن نارد کە دەست لە ڕێکخستنەکانی ئەڵمانیا هەڵگرێت و فەرمان بە لەشکرەکەی بدات لە بروسیا بکشێتەوە بەڵام ناپلیۆن لەو سەرکردانە نەبوو گوێ لەم فەرمانانە بگرێ بۆیە بە فەرماندایەتی خۆی لەشکرێکی مەزنی پێکهاتووە لە (٧٠٠,٠٠٠) حەوت سەد هەزار شەڕکەری لەفرە نەتەوەکان ئامادەکردو فەرەنسای جێهێشت بەڵام لاوازییەکی زۆر لە پێکهاتەی

ڕێـزی سـوپای نـاپلیۆن دەبینـرا ئـەویش بـەهۆی بـوونی سـەربازی فەڕەنـسی و ئـەڵمانی و پۆلـۆنی و تلیـانی و ئیـسپانیلی و سویـسری و پرتوگـالی كـە ئەمـەش وایكردبوو لە ڕووی زمان و شێوازی ژیانیان نەگونجێن و لـە یـەك تێنەگەیـشتنیان پێوە دیاربوو، لە بەرامبەردا سوپای ڕووسیا هەڵگری یەك بڕواو بۆچوون بوون بـە ئامانجی بەرگری لە خاك و نیشتمان هاتبوونە مەیدانی جەنگ[٧].

هێزەكانی ڕووسیا لەم شەڕەدا پیلانی كشانەوەی پێ بـەپێ بـەرەو ڕۆژهـەڵات جێبـەجێكرد تـا هێزەكـانی فەڕەنـسی لـە بنكـەكانیان دووركەونـەوەو ڕێگـەی هاتووچۆكردنیان بە ئاستەنگ بكەوێت لە مانگی ئـاب یەكـەم بەگژیەكداچـوون لـە شاری (سمولنسك)ی ڕووسی ڕوویدا لەم شەڕەدا فەڕەنیسەكان توانیـان شـارەكە داگیر بكەن و ڕووسەكانیش بەرەو ناوەوەی ڕووسـیا پاشەكشەیان كـرد نـاپلیۆن بەدوایاندا هێرشی برد تا لە (١٨١٢/٩/١٤) مۆسكۆشی داگیركـرد، بـەڵام شـارەكە تـەواو سـوتێنرابوو ئـەویش بـە فـەرمانی فـەرمانڕەوای شـار نـاپلیۆن هەوڵیـدا چـاوەڕوانبێت تـا ملكەچـی ڕووسـەكان ببێـت بـەڵام قەیـسەری ڕووسـیا بڕیـاری خـۆڕاگری و بـەرگریكاری دابـوو وە بـە هـەموو شـێوەیەك ڕێككـەوتنی لەگـەڵ فەڕەنسیەكان ڕەت دەكردەوە[٨].

ناپلیۆن بڕیاری كشانەوەی لەشكرەكەیدا ئەویش لە ترسی ئەوەی ڕووسـیا لـە لایەن وڵاتانی تری ئەوروپی هاوكاری پێ بگات هەروەها لە ترسی هەڵگەڕانـەوەی خەڵك و ترسی بەرپابوونی شـۆڕش لـە نـاوەوەی فەڕەنـسا، دواجـار خـەریك بـوو سوپا ئازووقەی نەمێنێت و وەرزی زستان نزیك بوویەوەو بـەفری زەوی داپۆشـی بوو، لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بە دەیان هەزار سەرباز لـە برسـان و لەسـەرمان ڕەق بوونـەوە هـەر لـەو گەڕانەوەشیاندا سـوپاكەیان بـە درێـژایی ڕێگـادا كەوتـە بـەر

هێرشی هۆزەکانی قەوقاز و زیانی زۆریان لێدان بەم شێوەیە ئەم لەشکرە تا گەیشتە سنوری پروسیا تەنها سەد هەزارێکی لێ مایەوە[٩].

بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکان لە ناوەوەی فەرەنسا ناپلیۆن سوپاکەی لە بروسیا بەجێهێشت و خۆی گەڕایەوە پاریس ئەمەش بۆ ئەوەی لە کاتی گەیشتنەوەی سوپاکەی هەواڵی زیانەکان لە ناو خەڵك کە بڵاودەبنەوە نەبنە هۆی نانەوەی ئاژاوەو گێرەشێوێنی، بوونی خۆی لە پاریس بەهۆی ناوبانگی باشی دەتوانێ کۆنترۆڵی دۆخەکان بکاو فەرامۆشی ئازارەکانی سەرنەکەوتنەکانیشیان بکات[١٠].

لە کانوونی دووەمی ١٨١٣ ڕووسەکان ڕاوی لەشکرە هێرشبەرەکەی فەرەنسایان دا توانیان بچنە ناو خاکی بروسیا و دۆقیەی (ڤێرسۆفیا) داگیر بکەن، بەم شێوەیە ڕووسەکان لە سەنگەری بەرگرییەوە چوونە سەنگەری هێرش بردن.

لە ئەنجامی ئەمەدا دەرگای ئومێد لەبەردەم ئەوروپیەکان والآکرا ئیتر ئەو کۆتە شکا کە پێشتر ئاستەم بوو شکست بە ناپلیۆن بهێنرێت بۆیە هێزی هاوپەیمانان کە پێکهاتبوون لە: (ڕووسیا، پروسیا، نەمسا) توانیان ببنە یەك و هەوڵ دەن ڕێ لە فەرەنسا بگرن کە دەیویست ڕووەو ئەڵمانیا هەڵکشێ ئەوە وای لە فەرەنسا کرد خێرا پاشەکشە بکات ئەم پاشەکشەیەش پاش جەنگێکی سێ ڕۆژە لە نزیك (لینریك) لە ڕێکەوتی (١٦-١٩) تشرینی یەکەم ١٨١٣ کە بە شکستێکی سەخت بۆ فەرەنسا کۆتایی هات ئەم جەنگەش پێی دەوترێت (جەنگی گەلان)[١١].

سەرەڕای ئەم شکستە ناپلیۆن ئامادەنەبوو ڕێککەوتن بکات ئەو ڕێککەوتنەی کە دەیوت فەرەنسا بە تەنها خاکی خۆی بۆ بمێنێتەوە بۆیە هاوپەیمانان بەرەو

پاریس چوون بە سوپایەكی (٤٠٠,٠٠٠) توانیان لە ٣١/ئاداری/١٨١٤ دەس بەسەر پاریس دابگرن و ناپلیۆنیش دەستی لە كاركێشایەوەو دەست بەرداری تەختی ئیمپراتۆریەت بوو ئەویش بەپێی بەڵێنامەی (فونتبلو) كە لەگەڵ سەركردەی هاوپەیمانییەكاندا بەستی لە بەرامبەردا هاوپەیمانان دوورگەی (ئەلب)یان بە ناپلیۆن بەخشی و دەرماڵەیەكی ساڵانەشی پێ دەدرا كە یەك ملیۆن فرانك بوو هەروەها ڕەزامەندی درا لەسەر مانەوەی نازناوی ئیمپراتۆر بۆ ناپلیۆن[١٢].

دوای سەركەوتنی هاوپەیمانان، پادشاو سەرۆكی وولاتان لە كۆشكی (تالیران) كۆبوونەوەو بانگەوازێكیان بۆ گەلی فەرەنسا بلاوكردەوە تیایدا داوایان لە فەرەنسیەكان كرد شێوازی حكومڕانی بۆ خۆیان دیاری بكەن وە پێشنیاریشیان بۆ كردن كە ڕژێمی پادشایەتی بگەڕێننەوە[١٣].

ئەنجوومەنی پیران كۆبوونەوەی خۆی لە ٢/نیسانی/١٨١٤ بەست بڕیاریدا بە پێكهێنانی حكومەتێكی نوێی كاتی بە سەرۆكایەتی تالیران، بەلام تالیران پێی وابوو كە پێویستە بنەماڵەی بۆربۆن حكومی فەرەنسا بكەن كە بە هاتنی ناپلیۆن ئەم بنەماڵەیە هەموو ماف و ئیمتیازاتێكیان لە فەرەنسا لێوەرگیرابوّوە بۆیە تالیران لەگەڵ ئەسكەندەر قەیسەری ڕووسیا ڕێكەوت لەسەر ئەوەی لویسی هەژدەهەم برای لویسی شازدەهەم دەسەلات بگرێتە دەست[١٤].

لە ٣٠/ئایاری/١٨١٤ پەیماننامەیەك بە ناوی (پەیماننامەی یەكەمی پاریس) لە نێوان فەرەنساو هاوپەیمانان بەسترا، بەپێی ئەم پەیماننامەیە فەرەنسایان بۆ سنوری (١٧٩٢ن) پێش شۆڕشی فەرەنسی گەڕاندەوەو كە هەندێك لە ناوچەكانی ئەلزاس و لایەكی ڕووباری ڕاین و زۆربەی خاكی سافۆای و ئەڤینون یان بۆ هێشتەوەو ڕێگەشیان پێدا كە موستەعمەرەكانی بگەڕێنێتەوە بەردەستی خۆی جگە لە دورگەی ئەنتیل و هەندێك دوورگەی تر لە زەریای هێمن وە هیچ

باجێکیان بەسەر فەرەنسا نەهێشتەوە، دیارە ئەم نەرم و نیانیە بۆ ئەوە کرا تا یارمەتی فەرەنسیەکان بدەن وە خەڵکی فەرەنساش هاوکاری پادشا بکات و بۆ قایمکردنی پێگەی حکومڕانی[١٥].

لە کاتێکدا سیاسەتمەدارانی دەوڵەتە سەرکەوتووەکان خەریکی بەستنی کۆنگرەیەك بوون بە مەبەستی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە ئەنجامی جەنگەکانی ناپلیۆنەوە هاتبوونە کایەوە هەروەها ئەو زەوییانەی کە ناپلیۆن داگیری کردبوون دابەشی بکەن، ناکۆکی و ململانێیەکی زۆر کەوتە نێوانیان بۆیە ناپلیۆن دوای ئەوەی لە لایەن میرانی پادشای ناپۆلی ئەم هەواڵەی پێگەیشت بڕیاری گەڕانەوەی بۆ پاریس دا لە ٢٦/شوباتی/١٨١٥ لە دورگەی ئەلبا ڕایکرد بە نهێنی لە کەنارەکانی فەرەنسا لە نزیك شارێك دابەزی بە سوپایەك کە لە ڕێگادا ڕاپەیوەستی بوون[١٦].

لە دوای ئەوەی نوێنەری وڵاتانی هاوپەیمان کە لە ڤیەننا خەریکی بەستنی کۆنگرەبوون بە هەواڵی گەڕانەوەی ناپلیۆنیان زانی و ڕایانگەیاند کارەکانی کۆنگرە بۆ ماوەی دوو هەفتە ڕابگرن و بەیاننامەیەکیان دەرکرد تێدا هاتبوو کە ناپلیۆن کەسێکی گوماناوی و لە دەرەوەی یاسایە تالیران بە ناوی فەرەنساوە واژووی لەسەر کردوو بەپێی ئەوە ناپلیۆنیان بە دوژمنی هەموو جیهانی شارستانی داناو تەواوی گەلانی ئەوروپایان بانگهێشتکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی و لەناوبردنی[١٧].

لە ١٧/حوزەیرانی/١٨١٥ لە جەنگێك بە ناوی جەنگی (واترلۆ) ناپلیۆن ڕووبەڕووی ئینگلیزەکان بۆوە و لە سەرەتای جەنگەکە ناپلیۆن زۆر بەهێزی دەرکەوت و بەڵام لە دوای ئەوەی (بلوفەر) سەرکردەی لەشکری بروسیەکان فریای ئینگلیزەکان کەوت و هاوسەنگی جەنگەکەی بەلای ئینگلیزەکان داداو و

سەركەوتن بەسەر سوپای ناپلیۆن و سەرەڕای تێكشكانی ناپلیۆن سی هەزار(٣٠,٠٠٠) كوژراویان لە مەیدانی جەنگدا بەجێهێشت و ناپلیۆنیش خۆی تەسلیمی سەركردەیەكی كەشتی دەریایی بەریتانی كرد بەڵام حكومەتی بەریتانیا قایل نەبوو كە مافی پەنابەری پێبدات و لە بری ئەوە بە كەشتیەكی جەنگی بەریتانی گوازرایەوە بۆ دوورگەی (سنت هیلانەی بەردی) لە باشوری زەریای ئەتڵەسی هەر لەوێ ژیانی بەسەر برد تاوەكو لە (٥/ئایاری/١٨٢٦) كۆچی دوایی كرد[١٨].

لە ٧/تەمووزی/١٨١٥ز نوێنەرانی هاوپەیمانەكان بۆ جاری دووەم چوونە پاریس و لویسی هەژدەهەمیان لەگەڵدا بوو لە پاشان لە ٢٠/تشرینی دووەمدا رێككەوتنامەی دووەمی پاریسیان واژوو كرد لەگەڵ فەرەنسادا، مەرجەكانی ئەم رێككەوتنامەیە زۆر توندتر بوو لە مەرجەكانی رێككەوتنامەی یەكەم بە شێوەیەك سەپاندنی بەسەر فەرەنسادا كە دەبێ زیانە جەنگییەكان قەرەبوو بكاتەوە كە دەگەیشتە (٧٠٠)ملیۆن فرەنكی زێرین و هەروەها دەبێ فەرەنسا رازی بێت بۆ ماوەی (٥)ساڵ سوپای داگیركەری هاوپەیمانان لە هەندێ هەرێمەكانی فەرەنسا بمێننەوەو ژمارەی ئەم هێزەش دەگەیشتە (١٥٠,٠٠٠) هەزار سەرباز وە دەبێ گەنجینەی فەرەنسایش خەرجییان لە ئەستۆدا بگرێت ئەمەش بە مەبەستی پاراستنی گەلی فەرەنسا، بەپێی ئەم رێككەوتنامەیە سنوری فەرەنسا گەڕایەوە بۆ سەردەمی لویسی شانزەهەم و رێگەشیان پێ نەدرا هیچ زەوییەكان لە دەست بمێنێتەوە كە لە سەرەدمی شۆڕش دەستیان بەسەرداگرتبوو جگە لە شاری (نیس) و هەندێك لە خاكی سافوای نەبێ[١٩].

## باسی دووەم/ ڕاگەیاندنی کۆنگرەی ڤیەننا:

کەم بەشی مێژووی سیاسی ئەوروپا هەیە لە گرنگیدا بگاتە باسی ئەو کۆنگرەیەی کە لە ڤیەننا بەسترا بە مەبەستی گێڕانەوەی ئەو نەخشەیەی ئەوروپا کە ناپلیۆن ماوەی چەندین ساڵ دەستکاری کردبوو، ئەو کۆنگرەیە زۆربەی سەرکردەو پاشاو سیاسەتمەدارە گەورەکانی لەخۆگرتبوو لە بنەڕەتیشدا مەبەستیشی گێڕانەوەی نەخشەی ئەوروپا نەبوو بۆ ئەو بارەی کە لە پێش ناپلیۆن لە سەری بوو چونکە ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو بەڵکو هەریەك لە دەوڵەتە گەورەکان بە خەیاڵی نەخشەیەکی تایبەت بۆ دابەشکردنی هاتبوونە پێشەوە کە بەو هۆیەوە گەورەترین پشکیان دەست بکەوێت.

لە دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن وڵاتە سەرکەوتووەکان دەبوایە کار بۆ گەڕاندنەوەی نەخشەی ئەوروپای سیاسی بکەن بۆ ئەوەی بیگێڕنەوە بۆ سەردەمی بەر لە شۆڕش یان هەر نەبێ لایەنی کەم لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیان بگونجێنن و بەسەر هەموو بزوتنەوە نەتەوایەتی و پێشکەوتن خوازەکانی ئەو وڵاتانەدا زاڵ بن.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە لە پەیمانی پاریسی یەکەم داهاتبوو کە بۆ پرۆسەی ئاشتەوایی لە سەرتاسەری ئەوروپاو چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان کۆنگرەیەك لە ڤیەننا ببەسترێت، دیارە هەڵبژاردنی شاری ڤیەننا بۆ ئەوە نەهاتبوو کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەوروپا، بەڵکو وەکو قەرەبوویەك بوو بۆ ئەو زیانانەی فەرەنسا لە نەمسای دابوون لە زیانی ماددی و سیاسی و دابڕاندنی خاك و سامانی، دواتر چوونە بن باری ئەو زیانانەی لە سەردەمی شۆڕشەوە کە لە هەموو وڵاتانی هاوپەیمان لێی کەوتبوو بۆیە هەموو لایەك ڕازی بوون شوێنی ئەو کۆنگرەیەی ڤیەننا بێ[٢٠].

لە سەرەتایی ڕاگەیاندنی کۆنگرەی ڤیـەننا وڵاتـانی هاوپـەیمان لەسـەر ئـەوە ڕێکەوتن کە نابێ فەڕەنسا هیچ ڕۆڵێـك ببینێـت لـەم کۆنگرەیـەدا، بـەڵام تـالیرانی وەزیری دەرەوەی فەڕەنسا ناکۆکی و ڕای جیـاوازی هاوپەیمانـەکانی قۆستـەوەو بە دیمەنێك خۆی دەرخست کە دەیـەوێت پارێزگـاری لـە هاوسـەنگی ڕاوبۆچـوونە جیاوازەکان دەکات بۆیە لە ئاکامدا فەڕەنساش بانگهێشت کرا بۆ کۆنگرەکە[٢١].

لـە مـانگی ئـەیلولی سـاڵی ١٨١٤ پادشـاو سـەرۆك و وەزیرەکـان ڕوویـان لـەم شارەکرد بە مەبەستی بەستنی ئەم کۆنگرەیە ژمارەی شاندەکان گەیشتە (١٤٠) شاند، ئەوەی ڕاستی بێت پایتەختی نەمسا لەم ساڵەدا لەخۆشترین کـات و سـات دا بوو وە بۆ نەمساییەکان شانازی بـوو کـە خـاوەن شـکۆیەکی وەکـو قەیسەری ڕوسـیا ئەسـکەندەری یەکـەم خـاوەن بـەهێزترین سـوپای دونیـاو باشـترین ئیمپراتۆریـەت و فریـدریك گلیـۆن ی سـێیەم پادشـای بروسـیاو بـەهێزترین فەرمانڕەوای ئەڵمانیەکان و کالیسریی وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا، لـەو کاتـەدا ئامادە دەبن[٢٢].

بە یەکگەیشتنی ئـەم ژمـارە کەسایەتیە پایـە بـەرزەی ئـەورووپا بـۆ وەزیـری دەرەوەی نەمسا مەترنیخ دەرفەتێکی باش بوو دبلۆماسیەتی خـۆی لـەم ڕۆژەدا دەربخا بە تایبـەت بـە حـوکمی ئـەوەی خـۆی وەزیـری دەرەوەی وڵاتـی خـاوەن میوانە مافی خۆیـەتی سەرپەرشـتی کـۆنگرە بکـاو بۆچـوونە پادشـا خوازیـەکانی خـۆی و بـیرە کۆنـە پەرسـتیەکەی وردکاتــەوە تەنانـەت بـۆ دوای کـۆنگرەش کاریگەریان هەبێ.

### تەوەری دووەم

## ئامانج و بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا

### باسی یەکەم/ ئامانجەکانی کۆنگرە:

سیاسەتمەدارانی ڤیەننا لەسەر نەخشەکە کەوتنە گفتوگۆ و قسەیان لەسەر ئاشتی و پێویستی گێڕانەوەی ئاشتی کرد پاش ئەوەی نزیکەی بیست و سێ ساڵ جەنگ درێژەی کێشابوو، بەڵام بەهۆی بۆچوونی جیاو بەرژەوەندی جیاوە ئەم شاندە زۆرانە نەیانتوانی بگەنە هیچ ڕێککەوتنێك بۆیە بڕیاریان دا چوار وڵاتە مەزنە سەرکەوتووەکە بەجیا (ڕوسیا، بەریتانیا، بروسیا، نەمسا) لە لێژنەیەکی چوار قۆڵیدا کۆببنەوەو لە هەموو کێشەکان بکۆڵنەوەو چارەسەریان بۆ دیاری بکەن و پێشکەشی خاوەنی پەیوەندیدار بکەن ئەمە لە ڕووی شێوەی کێشەکان بەڵام لە ڕووی جێبەجێکردنەوە وڵاتە مەزنەکان سووربوون لەسەر ئەوەی دەستکەوتەکان لە نێوان خۆیان دابەش بکەن و نەخشەیەکی نوێش بۆ ئەورووپا دابڕێژن کە لەگەڵ بەرژوەندییە بنەڕەتیەکان یەك بێ، دەوڵەتە بچووکەکانیش ئەوەندەیان لەسەر بوو گوێڕایەڵی بڕیارەکانی چوار وڵاتە مەزنەکە بن.

لە سەرەتادا فەڕەنساش لە وڵاتە بچووکەکان بوو بەڵام بۆ قایم کردنی پێگەی لویسی هەژدەهەم لە ڕووی ناحەزانیدا فەڕەنساش خرایە ناو لیستی وڵاتە مەزنەکان دەبێ ئەوە بڵێین زیرەکی و بلیمەتی تالیران بووە هۆی ئەوەی کار بکاتە سەر کۆنگرە تا فەڕەنساش لە وڵاتە مەزنەکان ئەژمار بکرێت[٢٣].

گفتوگۆی وڵاتانی هاوپەیمان ڕایکرد ئامانجەکان دابەش بکرێنە سەر دوو بەش(گشتی و تایبەتی) ئامانجە گشتیەکان هەموویان لە سەری ڕێك کەوتبوون کە لە سەرتاسەری ئەورووپا ئەنجام بدرێت، هەرچی تایبەتیش بوو هەر دەوڵەتە بەجیا دەبێ ئەمەیان ناکۆکی لێ کەوتەوە.

أ- ئامانجە گشتیەکان:

١- پارسەنگی جیهانی:

مەبەست لە پارسەنگی جیهانی دەستکەوتنەوەی ئەو زەویانە بوو بۆ هەر وڵاتێکی زلهێز کە لە ساڵی (١٨٠٥) لە ژێر دەستی دابووە، وڵاتانی دوژمنی فەرەنساو ناپلیۆن هەستیان کرد کە ناپلیۆن پارسەنگی جیهانی تێکداوە بۆیە پێویستە فەرەنسا بگەڕێتەوە بۆ سنوورە کۆنەکانی و بە وڵاتانی بەهێز دەورە بدرێت و ڕێگە بە فەرەنسا بگیرێت ئەمەش لە ترسی پێشڕەوی لە داهاتوودا، نەوەکو جارێکی تر پارسەنگی جیهانی تێکبدات، بەمەش کۆنگرەی ڤیەننا تا ئەندازەیەك پارسەنگی جیهانی گەڕاندەوە[٢٤].

٢- شەرعیەت:

شەرعیەت ئەو بنەمایە بوو کە فەرەنسا پێداگری لەسەر دەکردو قۆستیەوە بۆ گەڕاندنەوەی پێگەی خۆی کە بریتی بوو لە گەڕاندنەوەی بنەماڵەکانی پادشایەتی کۆن بۆ ولاتەکانیان لەگەڵ تەواوی ئیمتیازاتەکانیان و گەڕاندنەوەی حوکمی ڕەها بەپێی توانا لە فەرەنسادا بنەماڵەی (بۆربۆن) گەڕاندنەوە بۆ دەسەڵات هەروەها بنەماڵەی بۆربۆن گەڕانەوە بۆ (ناپۆلی و سقلیە)و موڵکەکانیان وەرگرتەوە، بنەماڵەی (سافۆ)یش گەڕانەوە بۆ (سەردینیا)، بنەماڵەی (ئۆرانج)یش گەڕانەوە بۆ هۆڵەنداو بەلجیکاش خرایە سەر، پاپاش گەڕایەوە بۆ سەر مومتەلەکاتە زەمینەکانی لە ئیتاڵیا[٢٥].

٣- قەرەبووکردنەوە[٢٦]:

ئەمەش تایبەت بوو بە وڵاتە بچووکەکان کە لە لایەن وڵاتە گەورەکان قەرەبوو دەکرانەوە لە بری بەشداریکردنیان لە ڕووخانی ناپلیۆن، سزای هەندێ وڵاتیشیان

دا کە لەگەڵ ناپلیۆندا وەستابوون وەك سەکسۆنیاو دانیمارك و دۆقی وارشۆی گەورە.

ئەمسا بەوازهێنانی لە مافەکانی لە زەوییە نزمەکانی باشوری (بەلجیکا) بە مەرکەزێکی سەرکردایەتی لە ئیتاڵیا قەرەبوو کرایەوە، جگە لەوەش کۆماری بوندوقیەی درایە پاڵ.

دۆقیەی میلانۆ (لۆمباردیا) بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ درا بە ئیمپراتۆریەتی هایسبۆرگ و ئەندامانی بنەماڵەی هایسبۆرگ لەسەر عەرشی دەوڵەتۆکەکانی ئیتاڵیای ناوەڕاست (توسکانیا، پارما، مۆدنیا) دانران، سەرکردایەتی ئەم بنەماڵەیەش لەژێر قەڵەمڕەوی ئەمسابوو.

پروسیاش هەموو ئەو زەوییانەی بۆ گەڕایەوە کە ناپلیۆن لێی دابڕاندبوو سەرەڕای ئەوەش بومیرانیای سویتو بەشێکی زۆری زەوییەکانی سەکسۆنیا و هەموو (پاستڤالیا)و زۆربەی زەویەکانی (ڕاین)ی دەستکەوت، بەمەش لەبەر دەرگای فەڕەنسا وەستاو بوو بە هەڕەشە بۆی و لە پارێزگاریکردنی ئەڵمانیای ڕۆژئاوایدا شوێنی ئەمسای گرتەوە.

پۆڵەنداو فلندا ڕاستەوخۆ درایە ڕووسیا لەبەر ڕۆڵی گرنگی لە ڕووخاندنی ناپلیۆن دا، هەروەها ناوچەی (ساربیا)ی تورکیای بەدەست هێنا.

کۆنگرە بڕیاری گەورەکردنەوەی و بەهێزکردنی سەردینیادا بۆیە (سافۆی و بیدمۆنت)ی بۆ گەڕێنرایەوەو(جەنەواش)ی خرایە سەر.

هەرچی سەبارەت بە بەریتانیایە لە ئاهەنگی دابەشکردنی زەوییە ئەوروپیەکاندا بەشداری نەکرد، بەڵام هەولی خۆی بەرتەسك کردەوە لە فراوانکردنی داگیرگە دەریاییەکانی خۆیدا توانی ماڵتەو دوورگەکانی ئایۆنیاو

هلیکۆلندو داگیرگەی ئالکاب و مۆرتینۆس و گیناو تۆباکۆ و ترنداد بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی.

ئەو دابەشکردنەی دەستکەوتەکان کە ئاماژەمان پێکرد بەلگەی ئەوەیە کە ئەو گیانەی ئەو کۆنگرەیە لە خۆی دەگرت چۆن بووە سەرەڕای ئەو ژمارە زۆرەی ئامادەبوانی نوێنەران لە کۆنگرەکەدا کەچی خێرا ئەوە ڕوون بووەوە کە هەموو کارەکان بەدەست دەولەتە گەورەکانەو دەولەتە بچووکەکان هیچ بەدەستن.

**ب- ئامانجە تایبەتیەکان:**

لە تەك ئامانجە گشتیەکان هەر ولاتەو ئەجنداو مەبەستی تایبەتی خۆی هەبوو دەیویست بە ئەنجامی بگەیەنێ کە ئەمەش بووە هۆی لەیەك هەلقۆزینەوەو بەیەك نەگەیشتن و هەڕەشەی جیابوونەوەی لە ئامادەبوانی کۆنگرە دەکرد، لە خوارەوە بە کورتی باس لە بنەماکانی سیاسەتی هەریەك لە ولاتە مەزنەکان لە کۆنگرەی ڤیەننا دەکەین.

**١- ئامانجەکانی نەمسا:**

مەتربیخ وتووێژکاری نەمسایی و سەرۆکی کۆنگرە ئەوەی لەلا ڕوون و ئاشکرابوو ئەو گورزو زیانانەی کە ولاتەکەی تووشی هاتبوو لەسەر دەستی ناپلیۆن بە میوانداری کردنی ولاتەکەی بۆ کۆنگرە قەرەبوو ناکرێتەوە، بۆیە مەترنیخ ئەو ئومێدانەی کە چاوی لێ بوون بریتی بوون لە[٢٧]:

١- گەڕاندنەوەی خاك و هەرێمە داگیرکراوەکان لە لایەن فەرەنساوە.

٢- پاراستنی بەرژەوەندییە کۆنەکانی لە ئیتالیا.

٣- ڕووسیاش لە چارەنووسی پۆلۆنیاو دەستێوەردان لە کاروباری ئەلمانیا سەرفراز نەکەن.

٢- ئامانجەکانی بەریتانیا:

ئینگلیزەکان داواکاری سەرەکیان لە کیشوەری ئەوروپا بریتی بوو لە پاراستنی پارسەنگی هێزەکانی لە نێوان وڵاتە ئەوروپییەکاندا بە شێوەیەك هیچ لایەنێك نەتوانێ ئەویتریان پەراوێز بکا هەروەها لە ڕێگەی ئەم هاوسەنگیەش دەتوانێ ئارامی و ئاشتیەکی تەبا لە ئەوروپا بەرقەرابێ، ئەمە جگە لەوەی لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێ چاودێری فەرەنسا بکرێت بۆ ئەوەی جارێکی تر ئارامی و ئاسایشی وڵاتەکان نەشێوێنێ و وە سنور دانانیشە بۆ چاوتێبڕینەکانی ڕوسیا لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە لایەن دەریایشەوە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (کاسلریە) لەسەر قۆرخکردنی دەریا پێی داگرت و سەروەری دەریایی بە مافی خۆیانی دەزانێ[٢٨].

٣- ئامانجەکانی ڕوسیا:

ڕوسیا ئەو کات بەهێزترین وڵات بوو لە ڕووی سوپاییەوە هەر بۆیە بە مافی خۆی دەزانێ ڕۆڵێکی سەرەکی لە سیاسەتەکانی کیشوەر هەبێ بەتایبەتی کە ڕوسیا بەشداریەکی کارایی هەبووە لە لەناوبردنی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا، بۆ ئەم مەبەستەش لە پێناو پاراستنی باری ئارامی کیشوەر داوای هاوپەیمانێتیەکی لە نێوان وڵاتە مەزنەکان کرد بە سەرۆکایەی خۆی[٢٩].

جگە لەمە ڕووسیا چاوی لە پۆلۆنیاش بوو کەچی پێشتر ئەسکەندەری قەیسەری ڕووسیا بەڵێنی بە پروسیادابوو کە دۆقیەی وارشۆی گەورە کە ناپلیۆن دروستی کردبوو لە ناوبیات و نەمسای بداتێ بەڵام بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی نەتەوەکاندا لە ساڵی (١٨١٣) قەیسەری ڕووسیا لەبەر بەرژەوەندییە تایبەتەکانی بۆچوونی گۆڕی لە بەرامبەر ئەمەدا سەکسۆنیای بە پروسیای بەخشی، بەڵام (مەترنیخ) لە بوونی ڕوسیا لە ئەوروپای ناوەند بە شێوەیەکی

هەمیشەیی دەترسا بۆیە لە دژی پێشنیارەکانی وەستا، (کاسلێری) وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بە شێوەیەکی گشتی بڕوای بە ڕووسیاو بە شێوەیەکی تایبەتی بڕوای بە قەیسەر نەبوو بۆیە چووە پاڵ(مەترنیخ) بەم جۆرە کێشە لە نێوان (روسیاو پروسیا) لە لایەك و(نەمساو بەریتانیا) لە لایەکی ترەوە دروست بوو[٣٠].

### ٤- ئامانجەکانی پروسیا:

ئامانجی سەرەکی پروسیا بریتی بوو لە دەست بەسەرداگرتنی خاکەکانی سەکسۆنیا ئەمەش لەبەر ئەوەی لە سەردەمی ناپلیۆن پادشای سەکسۆنیا لایەنگری فەرەنسا بووە و زیانی زۆری بە پروسیا گەیاندووە لە بەرامبەر ئەمەشدا نایەوێ فردریکی سێیەم سزابدات تەنها ئەوەنەبێ لەسەر تەختی پادشایەتی دابەزێنێ و دەست بە خاکیەوە بگرێ.

لە پاڵ ئەم داواکارییە شاندی بروسی لەسەر ئاستی فەرمی دەوڵەت هەندێك داواکاری تری قورسی هەبوون کە بریتی بوون لە دەستگرتنی بەسەر هەرێمی ئەلزاس و لۆرینی فەرەنسی، هەروەها پروسیا داوای یەکخستنی هەموو دەوڵەتۆکەکانی ئەڵمانیایان لە ناویەك دەوڵەتی مەزنی بەهێزدا دەکرد[٣١].

### ٥- ئامانجەکانی فەرەنسا:

فەرەنسا تاکە وڵاتی دۆڕاو بوو کە بەشداربوو لەو کۆنگرەیە بۆیە داواکاریەکانیش زۆر سادە بوو ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ (تالیران) کە سەرۆکی شاندی فەرەنسا بوو کە زۆر بە نیانی و دبلۆماسیانە ڕەفتاری دەکرد بۆ ئەوەی لەم کۆنگرەیە فەرەنسا لە نامۆیی بەدەربنێ چونکە وڵاتانی هاوپەیمان دەیانویست فەرەنسا وەکو وڵاتێکی بێ هێز بمێنێتەوە لە ترسی ئەوەی جارێکی تر ئاژاوەو سەریەشە بنێتەوە، داواکارییەکانی بریتی بوون لە[٣٢]:

١- گەڕاندنەوەی پێگەی سیاسی فەڕەنسا وەکو وڵاتێکی مەزن.

٢- دەست هەڵگرتن لەو شوێنانەی کە ناپلیۆن داگیری کردبوون کە ئەمەش زیاتر لە پێناو بەدەست هێنانی متمانەی وڵاتانی هاوپەیمان بوو.

٣- پشتگیرکردنی سیستەمی بۆماوەیی پاشایەتی.

٤- تەنها داوایەکی کە زۆر بە کارامەیی و شاراوەیی دەربڕی بریتی بوو لەوەی کە پێویستە چاوتێبڕینەکانی نەمساو هەوڵەکانی بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئیتاڵیا بەپێی توانا سنوردار بکرێت.

## باسی دووەم/ بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا[٣٢]:

١- کۆنگرە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی بازرگانیکردن بە بەندەو کۆیلە دەکرد بەو پێیەی لەگەڵ بنەما مرۆڤایەتیەکاندا ناگونجێت و لەگەڵ ئاکارە گشتیەکاندا یەکناگرێتەوە بۆیە هەریەك لە فەڕەنساو ئیسپانیاو هۆڵەنداو سوید قەدەغەیان کرد.

٢- بە چاوی دادپەروەرییەوە سەیری ئەو کەسانە بکات کە لە جەنگدا زیانیان لێکەوتووە.

٣- ڕێککەوتن لەسەر بنەمای ڕێکخستنی بەڕێوەبردنی کاروباری ڕووبارە نێو دەوڵەتیەکان.

٤- چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێوان وڵاتان لە ڕێگەی دبلۆماسی.

## باسی سێیەم/ گرنگترین ئەو ڕەخنانەی لە کۆنگرەی ڤیەننا گیرا:

سەرکردەکانی کۆنگرەی ڤیەننا بەدواکەوتوو و داخراو وەسف کران کە گوایە لە پیاوانی سەردەمی کۆنن ئەوانن کە تا ئەندازەیەکی زۆر بیرو بۆچوونی نوێ کاریان لێ ناکات، سەرەڕای ئەو چارەسەرەی کە دایانبوو بۆ ماوەی نزیکەی چل ساڵ پارێزگاری لە ئاشتی کرد، چەند ڕەخنەیەك لەو چارەسەرەگیرا.

١- چارەسەرەکە هەوڵیدا پارسەنگە نێو دەوڵەتیە تێکچوەی کە ناپلیۆن دروستی کردبوو بگەڕێنێتەوە بەڵام پارسەنگی نێودەوڵەتی نوێش ڕوسیا زەوتکردنی پۆڵەنداو فنلەنداو نزیك بوونەوەی لە ئەوروپای ناوەڕاست بەتایبەتی ترسی خستبووە نێو دڵی نەمساو بەریتانیاوە تێکدا[٣٤].

٢- بڕیارەکانی کۆنگرە جەنگ بوون بۆ سەر بیروبۆچوونە ئازادو دیموکراتیەکان، چونکە مافە شەرعیەکان گەڕانەوە بۆ پاشاو گەلیش بێ بەش کرا لە بەشداریکردن لە فەرمانڕەواییدا[٣٥].

٣- جێبەجێکردنی بنەمای شەرعیەت هەندێك لە حاکمە دیکتاتۆرەکانی گەڕاندەوە سەر دەسەڵاتی وڵاتەکەیان سەرەڕای ناڕەزایی گەلەکانیان وەك ئەوەی لە نەمسا ڕوویدا بەبێ ڕەزامەندی گەلەکەی (تیرون) گەڕێنرایەوە بۆ سەر دەسەڵات[٣٦].

٤- کۆنگرە هەندێك لە داخوازیەکانی دەوڵەتە بچووکەکانی پشتگوێ خست و گرنگی پێنەدا وە هەندێك مافەکانیانی کردە قوربانی لە پێناو بەرژەوەندی دەوڵەتە گەورەکاندا[٣٧].

## دەرئەنجامی توێژینەوە:

١- كۆنگرەی ڤیەننا هەوڵیدا ئەوروپا بگێڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم بەوەی سەردەمی سەركردەو بنەماڵە و پاشاكان بگێڕێتەوە.

٢- چارەسەریەكی سیاسیانەی بۆ كێشەی پۆڵۆنیا دۆزیەوە كە بە درێژایی سەدەی هەژدەهەم جێی مشتو مڕی نێوان ڕوسیاو نەمساو بروسیا بوو.

٣- كۆنگرە هیچ بایەخ و گرنگیەكی نەدا بەو گیانە نەتەوایەتیەی كە لە كاتی شۆڕش و جەنگەكانی ناپلیۆندا بە ناو گەلانی ئەوروپادا بڵاوببۆوە و پشتگوێیان خست.

٤- كۆنگرەی ڤیەننا دەستی بروسیای لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا والاكرد.

٥- بەپێی بڕیارەكانی كۆنگرە دەریاو زەریاكان و هاتووچۆی نێوان وڵاتان بۆ ئینگلتەرا قۆرخ كران.

٦- كۆنگرە دەستێكی بالای هەبوو لە دابینكردنی سەقامگیری و ئارامی بۆ ئەوروپا.

## پەراوێزەکان

١- فازل حسین، کازم هاشم نعمە: مێژووی نوێی ئەورووپا(١٨١٥-١٩٣٩)، و: مستەفا سەعید عەلی، چ١، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل٥.

٢- عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: مێژووی هاوچەرخ ئەورووپا لە شۆڕشی فەڕەنسییەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی، و: خالید هەرکی، چ١، (هەولێر: ٢٠٠٩)، ل١٥٧. جفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەورووپا، و: نهاد جلال حبیب الله، چ١، ٢٠٠٩، ل٤٤٠.

٣- عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، ل١٥٧.

٤- هـ. ا.ل.منیشەر: مێژووی نوێی ئەورووپا(١٧٨٩-١٩٥٠)، و: شوکر سلێمان و سەروین ئەرجان، (هەولێر: ٢٠٠٩)، ل٧٩. زین العابدین بن شمس الدین نجم، تاریخ اوروبا الحدیث والمعاصر، ط١، (عمان: ٢٠١٢)، ص٣٣١.

٥- عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، ل١٥٤.

٦- جفری برۆن: س.پ، ل٤٥١-٤٥٢. علي حیدر سلیمان: تاریخ الحضارة الاوروبیة الحدیثة، ط١، (بغداد: ١٩٩٠)، ص٢١٢.

٧- عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، ل١٤٠.

٨- علي حیدر سلیمان: م.س، ص٢١٢. جفری برۆن: س.پ، ل٤٥٢. علي الجوهري: أحداث تاریخیة غیرت مجری العالم، بدون مكان الطبع، ٢٠٠٤، ص١٤٦. عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.ث، ل١٤٠.

٩- عبدالعزیز سلیمان، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، ل١٤٠-١٤١. جفری برۆن: س.پ، ل٤٥٢-٤٥٣. خضر خضر: تطور العلاقات الدولیة من الثورة الفرنسیة وحتی بدایة الحرب العالمیة الأولی(١٧٨٩-١٩١٤)، لبنان، ص٩٠.

١٠- علی حیدر سلیمان: م.س، ص٢٠٣. عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، ل١٤١.

١١- محمود شاكر: پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان، و: موسی محمد عبدالرحمن، بەرگی دووەم، ل٨٢٤. جفری برۆن: س.پ، ل٤٥٤.

١٢- علی حیدر سلیمان: م.س، ص٢١٤. هـ.ا.ل.فیشەر: س.پ، ل١٠٤. محمود شاكر: س.پ، ل٨٢٦-٨٢٧. صالح حسن العكیلي: فرنسا بین ثورتین(١٧٨٩-١٨٣٠)، ط١، (د.م: ٢٠٠٠)، ص٧٨.

* تالیران(١٧٥٤-١٨٣٨)، لە بنەڕەتدا قەشە بووە لە سەردەمی ناپلیۆن وەزیری دەرەوەی فەڕەنسا بووە، دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر ناپلیۆن لەسەر داوای تالیران هاوپەیمانان بڕیاریاندا

لویسی هەژدەهەمی برای لویسی شازدەهەم دەسەڵات بگرێتە دەست لە فەرەنسا. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: مێژووی نوێی ئەوروپا(١٧٨٩–١٩٥٠)، فیشەر، لا١٥٥.

١٣– عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، لا١٤٥.

١٤– محمود شاكر: س.پ، لا٨٢٧. فیشەر: س.پ، لا١٠٥.

١٥– خضر خضر: تطور العلاقات الدولية من الثورة الفرنسية وحتى بداية الحرب العالمية الأولى(١٧٨٩–١٩١٤)، طرابلس–لبنان، ص٩٤. علي حيدر سليمان: م.س، ص٢١٤. عبدالعزيز سليمان نوار، عبدالمجيد نعنعي: س.ث، لا١٤٦.

١٦– عصام عبدالفتاح: ناثليۆن بين الطموح والجنوح، ط١، (قاهرة: د.س)، ص١٣٩. جفری برۆن: س.پ، لا٤٥٥.

١٧– هـ.ا.ل.فیشەر: س.پ، لا١٠٨. محمود شاكر: س.پ، لا٨٢٩.

١٨– عصام عبدالفتاح: م.س، ص١٤٦. على الجوهرى: م.س، ص١٤٦. محمود شاكر: س.پ، لا٨٣٠. جفری برۆن: س.پ، لا٤٥٦.

١٩– عبدالعزیز سلیمان نەوار: عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، لا١٥٠. محمود شاكر: س.پ، لا٨٣٠.

٢٠– جفری برۆن: س.پ، لا٤٥٨. عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، لا١٥٦.

٢١– صالح حسن العكيلي: م.س، ص٨٠. محمود شاكر، س.پ، ل٨٣٣.

٢٢– فازل حسین، كازم هاشم نعمة: س.ث، لا١١. الان بالمر: موسوعة التاريخ الحديث، ت: سوسن فيصل السامر، يوسف محمدامين، ج٢، (بغداد: ١٩٩٢)، ص٣٧٢.

٢٣– عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، لا١٥٨.

٢٤– عبدالعظيم رمضان: تاريخ اوروبا والعالم في العصر الحديث، ج٢، .

٢٥– فازل حسین، كازم هاشم نعمە: س.پ، لا١٦. محمود شاكر: س.پ، لا٨٣٤.

٢٦– خضر خضر: م.س، ص١٠٠. علي حيدر سليمان: م.س، ص ص٢١٨–٢١٩. عبدالعظيم رمضان: م.س، ص ص٢٠–٢٣. جفری برۆن: س.پ، لا٤٦٠–٤٦١. رولان موسنية، ارنست لابروس، تاريخ الحضارات العام، ترجمة: يوسف أسعد، فريندم داغر، ج٥، بيروت، (لبنا: ٢٠٠٦)، ص٥٦٤–٥٦٦.

٢٧– عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، لا١٥٩–١٦٠. خضر خضر: م.س، ص٩٨.

٢٨– فازل حسین، كازم هاشم نعمە: س.پ، ل١٨–١٩. عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، لا١٦٠.

٢٩– عبدالعزیز سلیمان نەوار، عبدالمجید نەعنەعی: هـ.س، لا١٦٠.

٣٠– فازل حسین، كازم هاشم نعمە: س.پ، لا١٨–١٩.

٣١- محمود شاكر: س.پ، ل٨٢٤. عبدالعظيم رمضان: م.س، ص٢١.

٣٢- عبدالعزيز سليمان نەوار، عبدالمجيد نەعنەعی: س.پ، ل١٦٢.

٣٣- فازل حسين، كازم هاشم نعمە: س.پ، ل٢٠. محمود شاكر: س.پ، ل٨٣٦.

٣٤- فازل حسين، كازم هاشم نعمە: هـ.س، ل٢١.

٣٥- محمود شاكر: س.پ:، ل٨٣٧.

٣٦- فازل حسين، كازم هاشم نعمە: س.پ، ل٢١.

٣٧- محمود شاكر: س.پ، ل٨٣٨.

## سەرچاوەكان

- فازل حسين، كازم هاشم نعمە: مێژووی نوێی ئەوروپا(١٨١٥-١٩٣٩)، و: مستەفا سەعيد عەلی، چ١، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل٥.

- عبدالعزيز سليمان نەوار، عبدالمجيد نەعنەعی: مێژووی هاوچەرخ ئەوروپا لە شۆڕشی فەرەنسييەوە تا جەنگی دووەمی جيهانی، و: خاليد هەركی، چ١، (هەولێر: ٢٠٠٩)، ل١٥٧.

- جفری برۆن، پوختەی مێژووی ئەوروپا، و: نهاد جلال حبيب الله، چ١، ٢٠٠٩، ل٤٤٠.

- هـ. ا.ل.منيشەر: مێژووی نوێی ئەوروپا(١٧٨٩-١٩٥٠)، و: شوكر سلێمان و سەروين ئەرجان، (هەولێر: ٢٠٠٩)، ل٧٩.

- زين العابدين بن شمس الدين نجم، تاريخ اوروبا الحديث والمعاصر، ط١، (عمان: ٢٠١٢)، ص٣٣١.

- علي حيدر سليمان: تاريخ الحضارة الاوروبية الحديثة، ط١، (بغداد: ١٩٩٠)، ص٢١٢.

- علي الجوهري: أحداث تاريخية غيرت مجرى العالم، بدون مكان الطبع، ٢٠٠٤، ص١٤٦.

- خضر خضر: تطور العلاقات الدولية من الثورة الفرنسية وحتى بداية الحرب العالمية الأولى(١٧٨٩-١٩١٤)، لبنان، ص٩٠.

- محمود شاكر: پوختەی مێژووی شارستانيەتەكان، و: موسى محمد عبدالرحمن، بەرگی دووەم، ل٨٢٤.

- صالح حسن العكيلي: فرنسا بين ثورتين(١٧٨٩-١٨٣٠)، ط١، (د.م: ٢٠٠٠)، ص٧٨.

- عصام عبدالفتاح: ناثليۆن بين الطموح والجنوح، ط١، (قاهرة: د.س)، ص١٣٩.

- عبدالعظيم رمضان: تاريخ اوروبا والعالم في العصر الحديث، ج٢، .

- رولان موسنية، ارنست لابروس، تاريخ الحضارات العام، ترجمة: يوسف أسعد، فريندم داغر، ج٥، بيروت، (لبنا: ٢٠٠٦)، ص٥٦٤-٥٦٦.

# ئەمریكا و شەڕی یەكەمی جیهان

ئومید خطاب وهاب

## بەشی یەكەم

## ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پێش چونە شەڕی یەكەمی جیهان

### تەوەرەی یەكەم

### دەروازەیەك بۆ شەڕی یەكەمی جیهان:

لە ١٩١٤/٧/٣٠ شەری یەكەمی جیهانی هەلگیرسا، لەسەرەتادا حەوت ولاتی ئەوروپی بە شداربوون، ئەوانیش (ولاتانی تەوەرە)، ئەلمانیا و ئیمپراتۆریتی نەمساو مەجەر لە لایەك و ولاتانی هاوپەیمان (فەرەنسا، ڕووسیا، بەریتانیا، سربیا، و بەلجیكا) لەلایەكی ترەوە، دەولەتی عوسمانی لە تشرینی یەكەمی ١٩١٤، بولگاریا لە ئەیلولی ١٩١٥ چوونە پال ولاتانی تەوەرە، هەریەك لە ئیتالیا لە ئاداری (١٩١٥)، رۆمانیا (١٩١٦)، ولایەتە یەككرتووەكانی ئەمریكا لە ١٩١٧/٤/٦، یۆنان حوزەیرانی (١٩١٧) چوونە پال ولاتانی هاوپەیمان، هەریەك لەم ولاتانە پالنەری تایبەتی خۆی هەبوو بۆ بەشداربوون لەم شەرەدا، لە ئۆكتۆبەری (١٩١٧) روسیا لەشەر كشایەوە و پەیماننامەی ئاشتی (بریست لینۆفیسكی) لە ئاداری ١٩١٨ لەگەل ئەلمانیا گرێدا [1]، شەڕی یەكەمی جیهانی ماوەی چوار سال و چوار مانگ بەردەوام بوو بەسەركەوتنی ولاتانی هاوپەیمان و شكستی ولاتانی تەوەرە كۆتای هات و یەك لەدوای یەك خۆیان بەدەستەوە دا، بولگاریا (١٩١٨/٩/٢٩) دەولەتی عوسمانی (٣٠تشرینی یەكەمی ١٩١٨)

ئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر (٣تشرینی دووەمی ١٩١٨) لە کۆتایشدا ئەڵمانیا (١١ی تشرینی دووەم) لەهەمان ساڵدا خۆی بە دەستەوە دا [٢]، شەری جیهانی یەکەم لە چەند بەرەیەکەوە شەڕبوو، بەرەی ئیتالیا، بەرەی ڕوسیا، بەرەی یۆنان، بەرەی عێراق [٣]، پاش کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی (١٠) ملیۆن کەس کوژران و (٧) ملیۆن کەسی کەم ئەندام، جگە لەوەی (٢٢) ملیۆن کەس توانای کاریان نەمابوو، جگە لەوەی (١٠٠) ملیار دۆلار لە ئابوری ئەم وڵاتانە بە هەدەرچوو [٤].

## تەوەرەی دووەم

### بنەمایی مۆنرۆ و کاریگەری لەسەر رامیاری دەرەوەی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا :

(جیمس مۆنرۆ)* (١٨١٧_١٨٢٥) سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای جیمس مادیسۆن (١٨٠٩ –١٨١٧) دووجار لەسەر یەك بوەتە سەرۆك، لەسەردەمی ئەمدا بنەمای مۆنرۆ دەرچووە کە ناسراوە بە کەنارگیری ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (ئەمریکا بۆ ئەمریکیەکانە) [٥]، بنەمای مۆنرۆ،بنەمایەکی نەتەوەیی بوو، کە(پارتی دیموکرات) (**)کاری پێ دەکرد،کاتێك مۆنرۆ هەڵبژێرا بۆ سەرۆك کۆماری ئەمەریکا تەنها یەك کەسی دەنگ پێ نەدا بەبیانوی ئەوەی کۆی دەنگ تەنها بۆ جۆرج واشنتۆنە [٦]، لە ٢ ی دیسەمبەری ساڵی ١٨٢٢جێمس مۆنرۆ نامەیەکی ئاراستەی کۆنگریس کرد کە تیایدا، سیاسەتی خۆی بەرامبەر ئەوروپا و ولاتانی ئەمریکا ی لاتینی ڕوونکردەوە ناوی نا (بنەمای مۆنرۆ) [٧]، داوای گەرانەوەی ئازادی دەکرد بۆ

کیشوەری ئەمریکا ی باشور ئەوکات ئیسپانیا لە ڕۆژانی ناپلیۆن ڕایگەیاندبوو داگیرکەکانی پابەندبن بە پادشای شەرعی (فریناندی حەوتەم) [8].

مۆنرۆ ڕایگەیاند شێوازی سیاسەتی ئەوروپا بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جیاوازە، فراوان بوونی دەسەڵاتی ئەوروپا لەم کیشوەرەدا دەبێتە هۆی لە ناوبردنی ئاشتی و ئارامی ناوچەکە، هەر جۆرە دەستێوەردانێك دژ بەسەربەخۆیی ولاٌتانی ئەمریکای باشور لە ڕوانگەی ولایەتە یەکگرتووەکانەوە بە هەڵوێستێکی نادروستانە لە قەڵەم دەدرێت بەم جۆرە هەر جۆرە خۆهەڵقورتاندنێکی ولاٌتانی ئەوروپا لەم کیشوەرە قەدەغە کرد[9].

ئەو بابەتانەی بنەمای مۆنرۆ جەختیان لەسەر کردەوە ئەمانەن :

١- جیهانی نوێ (هەر دوو ئەمریکا) لە ڕووی سیستمی سیاسی و داب و نەریتەوە جیاوازە لە جیهانی کۆنی ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقا.

٢- بنەمای مۆنرۆ جەختی دەکردەوە، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوورە لە ململانێکان، لەکاتی شەڕەکان و شۆرشی فەرەنسا و ناپلیۆن، دەست لە کاروباری ئەوروپا وەرنادات.

٣- داوای لە فەرەنسا کرد، واز لە داگیرکەکانی بهێنێت، چونکە لە کاتی دەستێوەرنەدانی ئەوروپا بە تەنیا ناتوانێت، شۆرشە هەڵگیرساوەکان کۆنترۆڵ بکات [10].

٤- ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەست وەرنادات لە کاروباری داگیرکەکانی، موڵکەکانی ولاٌتانی ئەوروپا لە جیهانی نوێ.

٥- وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داواکارە بۆ دورکەوتنەوەی لە ڕامیاری و کارو باری جیهانی نوێ [11].

## هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بنەماکانی مۆنرۆ :

ئەم ڕاگەیاندنە دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٨٢٢، لە ڕۆژگاری ناپلیۆن، داگیرکا ئیسپانیەکان لە کیشوەری ئەمریکایی باشور، دەبوو پابەندبن بێ پادشا (فێردیناندی حەوتەم) ڕەتکردنەوەی ملکەچی بۆ حکومەتی مەدرید بۆ دامەزراوەی سەربازی فەڕەنسا کە لە ئەمریکای لاتین دایمەزراندبوو لە(ئەرجەنتین، شیلی، پیرۆ، فەرەنسا، فەنزویلا)، حکومەتی ناوچەکانی ئەم وڵاتانە، دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد بە ناوی پادشای ئیسپانیا، کە دایدەنان ولاشی دەبردن، بە تێپەڕبوونی کات و بڵاو بوونەوەی هێزی سەربەستی، پابەند بوونی ڕۆشنبیران، بەڵێندانیان بەوەی کە داگیرگەکان دەتوانن دەسەڵاتی خۆیان بەڕێوە بەرن، پێویست بەگەڕانەوە ناکات و بۆ مەهانەو بەردەوام بوونی پابەند بوونیان بۆ ئیسپانیا و پادشاکەی فێردیناندی حەوتەم [١٢]، یەکەم کەس لە ئەمریکای لاتین یاخی بوو لەدەسەڵاتی ئیسپانیا، داوای سەربەخۆیی بۆ ئەمریکای باشور کرد، (سیمۆن پۆلیڤار) بوو لە فەنزویلا کە یەکەم داگیرکە بوو بە سەرۆکایەتی سیمۆن پۆلیڤار سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند لە ئیسپانیا، لەگەڵ ڕاگەیاندنی سیستەمێکی کۆماری دەستووری، (سان مارتان) یش لەئەجەنتین هەوڵی بۆ سەربە خۆی دا [١٣]، گەڕاندنەوەی فێردیناندی حەوتەم بۆ دەسەڵات، دوای نەمانی مەترسی ناپلیون، هاوپەیمانی چواری (پەیمانی پیرۆز)[*] بۆ سەرکووتکردنی داگیرگەکان ئەوانەی سەربەخۆ بوون لە دەسەڵاتی ئیسپانیا، لە ڕاستیدا هیچیان بۆ نەکرا بە هۆی گرنگی ئابووری وستراتیژی و زاڵبوونی هێزی دەریایی ئینگلیزی، وەزیری دەرەوەی ئینگلیز ڕایگەیاند لە ئەنجومەنی [١٤]

گشتی ساڵی ١٨٢٣، بەریتانیا دەیەوێت دان بە سەربەخۆی وڵاتانی ئەمریکای لاتین بنێت [١٥]،بەمەش ئەمریکا بە بنەمایی مۆنرۆ دەستی ئەورووپای لە ئەمریکای لاتین دورخستەوە توانای دەستێوەردانی چەکداری بۆ خۆی مسۆگەر کردووە، بەمەش دەریای کاریبی دەکاتە ناوچەی باڵا دەستی خۆی [١٦] .

## تەوەرەی سێ یەم

## هۆکارەکانی شەڕی یەکەمی جیهان

### أ/ هۆکاری ناڕاستەوخۆ :

١- نەتەوایەتی و دوژمن کاری : لە ساڵی (١٩١٤) نزیکەی (٢٥) دەوڵەتی سەربەخۆ لە ئەوروپادا هەبوون، هیچیان قایل نەبووە بۆ ئەوی تریان ملکەچ بکا، یان دەسەڵاتێك لە سەروی بەرژەوەندی خۆیانەوە قبوڵ بکەن.

٢- ئیمپریالیزم (داگیرکەر): هۆی سەرەکی دروست بوونی داگیرکەر لە دوای (١٨٧٠ن) بلاوبوونەوەی شۆڕشی پیشەسازی بوو، تا سەردەمێکی زۆر بەریتانیا یەکەمین دەوڵەتی بازرگانی پیشەسازی بوو لە جیهاندا، بەلام دوای ساڵی (١٨٧٠ن) ولاتانی تری پیشەسازی دروست بوون هیزی کێبرکێ ی داواکاری لەسەر کانتۆنەکان زۆر بوو.

٣- هاوپەیمانیە نێودەوڵەتیەکان : لە ساڵی (١٩١٤) ئەوروپا بە گشتی دابەشبوو بە دوو بەشەوە (دوو گروپی رکابەر)، ساڵی (١٨٧٩) هاوپەیمانی دوو قۆڵی (نەمسا و مەجەر)، سالی (١٨٨٢) هاوپەیمانی سێ قۆڵی (ئیتالیا، نەمسا، مەجەر) ساڵی (١٨٩١) (ڕوسیا و فەرەنسا) ڕێکەوتنیان واژۆ کرد [(١٧)].

٤- هەندێك لە فەیلەسوف و سەرکردە سەربازییەکان بە تایبەتی (شیلیفین موڵتکە) لە ئەڵمانیا، (جوفر) فوش، لە فەرەنسا باوەریان وابوو هێرشکردن چاکترە لە بەرگری کردن [(١٨)].

٥- جگە لە هۆی تر وەك (خۆپرچەك کردن)[(*)] و گەشەکردنی ڕووحی سەربازی، ڕامیاری پاوانخوازی.

### ب/ هۆکاری ڕاستەوخۆ :

لـە ٢٨ی یۆنـۆی سـاڵی ١٩١٤ ز (گـافریلۆ برنـسیب) قوتابیـەکی تونـدرەوی خەڵکی بۆسنە ئەندامی ڕێـــکخراوی (دەستی ڕەش) بوو تەقە لـە (ئەرشـیدۆق فرانتز فردینـاد) کـرد، جێنیـشینی تـەختی پاشـایەتی بـــــوو، لـە(سـەرایڤۆ) پایتـەختی بۆســـنە، خـۆی و ژنەکـەی کوشـت [١٩]، پـاش پێـنج هەفتـە شـەری جیهانی یەکەم دەستی پێکرد تا ئەو کاتـە جیهـان شـەری وای بـە خـۆ یـەوە نـە بینیبوو.

## بەشی دووەم

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەکاتی چونە ناوەوەی شەڕی یەکەمی جیهان

### تەوەرەی یەکەم

### هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهان

.سەرۆکی ولایەتە یەککگرتووەکانی ئـەمریکا (تۆمـاس ودرۆ وڵـسن ١٨٥٦-١٩٢٤)[*] هەر لە سەرەتای شەڕەکە ڕایگەیاند کە وڵاتەکەی بـێ لایەنـە نایـەوێ ڕاستەوخۆ دەستبخاتە کاروبـاری سیاسـیەوە یـا هـەر پابەندییـەك لـە کاروبـاری کیشوەری ئەوروپی، کە ئاراستەی گەلی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایی کرد لـە (١٩١٤/٨/١٤) ووتـی (ویلایەتـە یـەککگرتووەکانی ئـەمریکا لـە ئاسـتی ئـەم شەڕە دەبێ لایـەنی دەمێنێتـەوە، بـە وتـە و کـرداریش ئەمریکیـەکان دەبێـت لـە بیرکردنەوەیانـدا بـێ لایـەن بـن، هـەروەك چـۆن بـە کـرداریش بـێ لایـەنن) [٢٠]، لەوکاتە دا ئەمریکایەکان تووشی سەرسوڕمان هاتن، بڕیاریاندا بە هیچ شێوەیەك بەشداری شەڕ نەکەن ئەم بێ لایەنیە پشگیری لێکرا، داواکـرا لـە گـەلی ویلایەتـە یەککگرتووەکانی ئـەمریکا پابەنـد بـن بـە بەنـدەکانی ئـەو بلاَوکرایـەوە، بـەڵام بـە

تێپەربوونی کات (ڕۆژانی شەڕ) پابەندبوون بەبێ لایەنییەوە کارێکی سەخت بوو، چونکە هەریەك لەو دولایەنە چەندین جار ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان بانگێشت کرد بۆ شەڕ[21] لەکاتی شەڕیشدا، ولسن لە وتارەکانیدا قینی خۆی بەرامبەر بەو جۆرە شەڕانە دەردەبڕی، لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا، بەرامبەر (تشارلز ئیڤانز هیوگز) ی رکابەری وەستایەوە، لە دژی بانگەشەی شەڕ، خۆشی بە بانگەشەکەری یەکەم دادەنا بۆ ئاشتی لە جیهاندا، ئاماژەی بۆ دەکرد لە ناو گەلانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو شەڕە هیچ نییە، جگە لە شەڕێکی دژ بەشارستانیەت، ولسن مەبەستی دورخستنەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبوو لە شەر بەڵکو دەیویست شەرەف و سەروەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بپارێزێت، لە شەڕی ئەو ولأتانەی شەڕخواز بوون بێلایەنی لەسەرەتای شەری جیهانی یەکەم بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تووشی ڕوبەڕوی بارو دۆخێکی ئالۆز کردەوە، کەشتیە بارهەڵگرەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەورەترین باری خواردەمەنی و کەرەستەی شەریان بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان دەگواستەوە، ئەم هەنگاوەش کەشتییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ڕوبەڕوی چەندین هێرش و دەست درێژی هیزە دەریایەکانی ئەڵمانیا کردەوە [22]، بەپێی پەیمانی (ساسکس) لەمەی ١٩١٦، ئەڵمانیا پەیمانی دا کە پەلاماری کەشتیە بازرگانی و نەفەبەرەکان نەدات، بەلأم پێش ئەم مێژووە لە مانگی مەی ١٩١٥ کەشتیەکی نەفەرهەڵگر ئینگلیزی بەناوی (لوسیتانا) ڕوبەڕوی هێرشی موشەکی دەریایی ئەڵمانیا بووەوە، (٢٤) کەسی ئەمریکی خنکان، ئەم ڕووداوە بیروڕای ئەمریکی دژ بە ئەڵمانیا بەرزکردەوە (ولسن) ئەم کارەی بە دەستدرێژی کردنە سەر مافەکانی مرۆڤ وەسفکرد، بەلأم هێشتا بیروڕای گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا،

لەگەڵ شەر کردن لەگەڵ ئەڵمانیا نەبوون [٢٣]، ولّسن لە سەربابەتی ئاشتی بە بابەتی هەڵبژاردن سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەستەوە، کە لە تشرینی دووەمی ١٩١٦ ئەنجام درا، هەرچەندە لایەنێکی بەربلاّو کاریگەر لە کۆمپانیا سەرمایەدارەکان زۆر بە گەرمەوە هانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان دەدا پشتگیری هاوپەیمانان بکات لەم شەڕەدا زۆرترین سۆزیان بەلای هاوپەیماناندا دەڕۆیشت وەك لە ئەڵمانیا، سەرەڕای ئەوەش لایەنگیری ڕاستەقینەی ئاشتیان دەکرد [٢٤].

بۆیە ولّسن گرنگی بەم لایەنە دا بۆ هەڵبژاردنی بۆ خولێکی دیکە هەڵبژێرا بەسەر پالێوراوی پارتی کۆماری (تشارلز ئیڤانز هیوگز) بوو، بەلاّم لە هەمووی گەورەتر ئەو دەسکەوتە گەورانە بوو کە لە ئەنجامی سیاسەتی بێ لایەنی لە سالاّنی سەرەتای شەڕ پەیرەوی کرد، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سڵی لەوە نەکردەوە بازرگانی بە دژوارترین چەکی کۆکوژ بکات لە پیناوی دەسکەوتی مادیدا [٢٥] .

## تەوەرەی دووەم

## چوونە ناوەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ شەڕی یەکەمی جیهانی

لە (تەنگ و چەڵەمەی ١٩١٧)[*] لە کانونی دووەمی ١٩١٧ سەرکردایەتی بالاّی ئەڵمانیا بڕیاری دا بە خاپور کردنی کەشتی بازرگانیەکانی بەریتانیا [٢٦] لە شەڕی ژێر دەریایی، تەنانەت بێ جیاوازی کردن نێوان کەشتی وڵاتانی شەڕ کەر و وڵاتانی بێ لایەن، پاش ماوەیەکی کەم هەستان بە وێرانکاری مەزن بە خاپور کردن و نقوم کردنی چەند کەشتیەکی بەریتانی و ئەمریکی، ئەمەش وەك دەستبردنێك وابوو بۆ هەیبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا [٢٧] ، پاش

ئەوەی ئەڵمانیا پاپۆڕی ئامریکا (فیجیلانسیا)ی لە ئازاری (١٩١٧) نقومی ناو دەریا کرد، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆی لە پێش بڕیاردانێکی قورس بینییەوە، لە (١٩١٧/٤/٢) نامەیەك ئاراستەی کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، تیایدا رایگەیاند (هیچ چارەیەك لە پێش ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نەماوە، لەوە زیاتر بەشداری شەر نەکات، ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمریکا بۆ تۆڵە سەندن ناچێتە ناو شەڕەکەوە، یان بۆ ئەوەی بەشداری ناکات تا هێز و توانای مادی خۆی دەربخات، بەڵکو بۆ پارێزگاریکردن لە مافەکانی مرۆڤایەتی دەچێتە شەرەوە) دەنگی لەسەر درا بەزۆرینەی (٣٧٣) دەنگ پەسەند کرا، (٥٠) نوێنەر دژی بوو (٨٢) دەنگی پیران پەسەند کرا (٦) پیران دژی بو بۆیە بڕیاری لە سەردرا [٢٨]، لە رۆژی جومعە (١٩١٧/٤/٦) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چووە شەڕەوە دژی ئەلمانیا، ولسن پەیامێکی بە هێزی بەرزکردەوە، هێز بۆ دوورترین شوێن و بێ ژمارە و بێ حەد [٢٩]، ترسی گەلانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەوە بوو، ئەگەر ئەلمانیا سەربکەوێ دەبێتە سەرچاوەی مەترسی بۆ سەر هەموو بەرژەوەندییەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چونکە ئەڵمانیا باوەڕی بە دەسەلاتی تاك جەمسەری رەها هەبوو، لە نیسانی ساڵی (١٩١٧) ویڵسن چووە نێو کۆنگرێس و وتارێکی مێژووی خوێندەوە و ووتی (ئێمە لەگەڵ گەلی ئەڵمانیا شەڕناکەین، بەڵکو تەنها ڕووبەرووی دیکتاتۆریەتی سەربازی دەوڵەتی ئەڵمانیا دەبینەوە، دەبێت دونیایەك دروست بکەین دیموکراسی تیایدا بپارێزیت، ئێمە ئێستا لە پێناو ئەو بنەمایەدا تێ دەکۆشین کە بە مافی مرۆڤ ناو دەبرێت بۆ پاراستنی (پاسەوانی) مافە ڕاستیەکانی نەتەوە بچوکەکان و سەربەستییان بۆ بەرقەرارکردنی لێکەیشتنی نێوان نەتەوە شەڕ دەکەین ئاشتی ئارامی هەموو ولاتان لە پێناو دابینکردنی

سەربەستی جیهان دەستەبەر دەکەین)[٣٠]، ڕۆژێك لە ڕۆژان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە دەوڵەتێکی سەربازی نەناسراوە لەو کاتەدا ئەو کاتە سوپاکەی (١٥٠,٠٠٠) سەربازی نیزامی پێکهاتبوو، دواجار ناوەندەکانی ئەڵمانیا پشت قایم بوو بە غەواسەکان ئەم بڕیارە کاریگەری ئەو تۆی نابێت، سیاسەتمەدارانی ئەڵمانیا بە تەواوی توانا و هێزی ئەمریکی شارەزا نەبوون نەیان دەزانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو توانایەی هەیەتی بیکاتە هێزێکی کاریگەر لە ماوەیەکی کورتدا[٣١].

کۆنگرێسی ئەمریکا(١٨/ ٥/ ١٩١٧) یاسایەکی دەرکرد، ڕێگا دەدات و داوا لە گەنجەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات بینە ڕیزی سوپاوە بەر لەوەی ساڵی (١٩١٧) کۆتایی پێبێت، (٢٥٠ ٠٠٠) هاتنە ریزی سوپاوە (١٠٠,٠٠٠) ئەفسەر بوون، لەسەر نوێترین شێواز لە (١٧) بنکە مەشق پێکردندا ڕاهێنراو بوون، لە باشوری وڵات لە سەر دەستی شارەزایانی بەریتانی و فەرەنسی[٣٢].

## تەوەرەی سێیەم

## هۆکارەکانی بەشداری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە شەڕی یەکەمی جیهاندا

١- هەست و سۆزی ئەمریکیەکان لەگەڵ بەریتانیا بوو، لە ئەنجامی سیاسەتی ئەڵمانیا لە زەریای هادیو سین، دەرکەوتنی مەترسی ئەلمانیا دژی گەلانی غەیری خۆی بوو.

٢- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەترسا لە ئەنجامی سەرکەوتنی بەرەی (ناوەند) شکانی هاوپەیمانان، جگە لە دوو دڵی شەڕ سەربکەوێ، بە واتای سەرکەوتنی دەسەڵاتی تاك ڕەوی لە سەر دیموکراسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا[٣٣].

٣- ئەڵمانیا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٧هەوڵیدا بۆ ئەوەی مەكسیك قایل بكات، هێرش بكاتە سەر ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەڵێنی پێدا بەوەی (تێكساس , مەكسیكی نوێ، ئەریزۆنای) بداتێ بەلام ئەدمیراڵی بەریتانیی ئەو هەواڵەی پێگەیشت به واشنتۆنی ڕاگەیاند، ئەوەش لە كۆتایی پرسەكەدا وای لێكرد شەڕ دژی ئەڵمانیا رابگەیەنێ (٣٤).

٤- كشانەوەی ڕوسیا لە شەڕ، بە هۆی شۆرشی (بەلشەویەكان) لە ئۆكتۆبەری ١٩١٧ پەیماننامەی ئاشتی برێست لینۆ ڤیسكی لە ئازاری ١٩١٨ لەگەڵ ئەڵمانیا گرێدا (٣٥).

٥- بازرگانێتی بەربڵاو لە ماوەی سێ ساڵی بێ لایەنی، لەگەڵ قەرزێكی یەكجار زۆری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، بەرژەوەندی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ی بەبەرەی هاوپەیمانانەوە بەستەوە، بەرادەیەك چاوەروان دەكرا ئابوری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا تووشی داروخان بێت بۆیە خۆی بەو ئاراستەوە گرێدا كە نەهێڵێ ئەڵمانیا و هاوپەیمانان بەسەر هاوپەیمانان سەركەون (٣٦).

٦- هەر لە سەرەتای شەرەكەوە ئەمریكیەكان هیوای سەركەوتنیان بۆ بەریتانیا و فەرەنساو بەلجیكا دەخواست، چونكە پەیوەندی كلتوری داب و نەریت و یەكێتی سیستەم ویەكێتی بیرو ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئینگلیزی بەیەكەوە دەبەستەوە، ئەم پەیوەندییەش هیچی لەو هاوكاریانە كەمتر نەبوو، كە فەرەنسا لە سەردەمی شۆرش پێشكەشی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكای كردبوو (٣٧).

٧- هۆی ڕاستەو خۆی بەشداری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە شەڕ، دەگەرایەوە بۆ بەردەوام بوونی ئەڵمانیا لە جەنگی ژێر دەریایی، نغرۆ كردنی

کەشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نقومکردنی کەشتی بازرگانی بێ لایەن، لە سەرووی هەموویانەوە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێ ئەوەی بایەخ بدات بە رزگار کردنی گیانی سەرنشینەکانی، ئەمەش بێزاری گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لێکەوتەوە، بووە هۆی ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بچێتە شەڕەوە لە پاڵ هاوپەیمانان بێت.

٨- هەندێك بۆ چوونی مێژووی هەیە گوایە گەورە جولەکەکانی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەوانەی ناو کۆنگریس ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان بردە جەنگەوە لە پاڵ بەریتانیا، لە پێناو (بەڵێنی بلفۆر)(*) بەتایبەتی ئەم ڕاگەیاندنە، قایلبوونی ولآتانی هاوپەیمانا ن و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکی لێکەوتەوە، ئەوانەی نفوزی گەورەیان بوو لە سەر بڕیاری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (٢٨).

## بەشی سێ یەم

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای چونە شەڕی یەکەمی جیهانی

### تەوەرەی یەکەم

### ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای چوونە ناو شەڕەوە :

ولسن دەسەلآتی تەواوی پێدرا لە هەموو لایەکەوە ئامادەباشی بکات، خاوەن کارگەکان هاوکارییان دەکردبەو سنورانەی ولسن دایناوبوو قایل بوون هەر وەك چۆن زۆر کاتیان دەستنیشان کرد، یەکێتی کرێکاران دەستی لەو مافەی خۆی هەڵگرت کە نابێ مانبگرن، هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکمانی ئەمریکا دەیتوانی بە ملێونەها دۆلار قەرز بە هاوپەیمانان بدات و پاپۆری پڕ لە چەك و خواردەمەنییان بۆ بنێریت، بەلآم سوپای ئەمریکا سوپایەکی بچوك بوو، زیادیان

کرد لە ماوەی ساڵێکدا هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ فەرەنسا نێردرا بە فەرمانی جەنەڕاڵی ئەمریکی (جۆن .ج. بێرسنگ) گەیشتە (٧٠٠,٠٠٠) سەرباز دوای شەش مانگی تر، بووە جێی سەرسوڕمانی ئەڵمانیا و هاوپەیمانانی چۆن لە ماوەیەکی کورتدا ئەو ژمارە زۆرەی پێکەوە ناوە [٣٩]، جگە لەوەی حکومەتی ئەمریکا ئامادە بوو بۆ کارکردن لە پیشەسازی کشتوکاڵی و لە کەنارەکانی گەشتیگەلی گەورە هەبوون، تاوەکو تشرینی یەکەمی ١٩١٨ ژمارەی سەربازانی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە فەرەنسا گەیشتە (١,٧٥٠،٠٠) سەرباز [٤٠]، سەبارەت بە خۆ ڕێکخستن (نیوتن د.بیکر) وەزیری شەڕ بوو بە گیانێکی ڕاستگۆیانەوە هاوکاری وڵسنی دەکرد هەروەها (ماك ئدۆ) وەزیری کۆگاکان، (برنارد بارودۆخ) سەرۆکی ئەنجومەنی پیشەسازی لە هاوکاری کردندا هاوشێوەی وەزیری شەڕ بوو [٤١]، گرنگترین پاڵپشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداری کردنی هێزە دەریاکانی بوو لە شەڕ دا، زیاتر لە (٢،٥) ملێون ونیو سەربازی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕەوانی فەرەنسا کران، (٣٥) ملێون دۆلار وەکو یارمەتی درا بە هاوپەیمانان لەبەرئەوەی فەڕەنسا هێزە دەریاییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زەرەرو زیانێکی گەورەیان بە گەشتی گەلی ئەڵمانیا گەیاند، ناچار بە پاشەکشەیان کرد.

## تەوەرەی دووەم

## قازانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەشەڕی یەکەمی جیهان:

١- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا دەستکەوتی زۆری بوو لە کاتێکدا زیانەکانی شەڕەکە گەیشتە (٣٢٨) ملیارد دۆلار، قازانجی وڵاتە یەکگرتووەکان لە هەمان ماوەدا گەیشتە (٢٦) ملیار

دۆلاری جگە لە (١٤) ملیار دۆلاری دیکە، جگە لەوەی کۆی ئەو پارەی دابووی بە قەرز بە ولآتانی دیکە قازانجەکەی (٥٠٠) ملێۆن دۆلار بوو.

٢- ئامارە فەرمییەکان ئەوە نیشان دەدەن شەڕی یەکەمی جیهانی بووە هۆی کوشتنی ٨،٧ ملیۆن سەرباز، ڕێژەی سەربانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ٢٠٪، (٢١) ملیۆن کەس زامدار بوو، ڕێژەی زامدارانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ١٠٪ [٤٢]

٣- ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا وەکو نەریتێکی هەمیشەیی، بەبێ هیچ جۆرە کۆسپێك لە ڕووی کاروباری ولآتانی ئەوروپی ئازادی بازرگانی نێودەوڵەتی خۆی بە دەست هێنا [٤٣].

٤- گەلان مافی چارەی خۆنوسینیان بێت [٤٤]، ئەوانەی ژێر چەپۆکی دەوڵەتی عوسمانی، ئازادی گەشتیوانی لە دەرەوەش کردنەوەی لە بەرامبەر هەموو گەشتی بازرگانی بە پێی یاسا نێودەوڵەتییەکان.

٥- دەرکەوتنی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا وەکو هێزێکی بە هێزی هاوشانی ولآتانی وەك (فەرەنسا، بەریتانیا ، ئەڵمانیا ).

کاتێك ویلایەتە یەکرتووەکانی ئەمریکا نەیتوانی (فەرەنسا، بەریتانیا) قایل بکات بۆ ڕاگەیاندنی پەیمانێکی هاوبەش وڵسن لە (٨) کانونی دووەمی ١٩١٨ لە بەردەم کۆنگرێسی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دا (١٤) بەندەکەی ڕاگەیاند، کە ئەمانەن :

١- سیاسەتێکی ئاشکرا بۆ بەستنی کۆنگرەی ئاشتی.

٢- ڕێزگرتن لە ئازادی دەریاوانی لە کاتی ئاشتی و شەڕدا.

٣- لابردنی بەربەستی ئابوری لە نێوان گەلاندا بە پێی توانا [٤٥].

٤- کارکردن بۆ کەمکردنەوەی چەك و دورکەوتنەوە لە پێشبڕکێی خۆ پڕ چەك کردن.

٥- داگیرگەکان مافیان هەیە بۆهەڵبژارنی حکومەتەکانیان، کارکردن بۆ نەهێشتنی پێشبڕکێی أستعماری، بە پێی بۆ چوون داواکاری داگیرگەکان.

٦- وازهێنانی ئەڵمانیا لە زەوییەکانی ڕوسیا، بۆیارمەتی ڕوسیا لە پێناو گەشەکردنی ئابوری گشتی [٤٦].

٧- پاراستنی سەروەری بەلجیکا.

٨- هەموارکردنی نیمچە دورگەی (بەلقان) بۆگەنجان لەگەڵ بارودۆخی مێژووی دابەشکردنی نەتەوەکان.

٩- گەرانەوەی تەواوی فەرەنسا و پارێزگاری کردنی تەواو لە خاکەکەی گەرانەوەی ئەلزاس و لۆرێن بۆ فەرنسا

١٠- پێدانی مافی چارەی خۆنووسین بە نەمسا و مەجەرییەکان، کارکردن بۆ پێدانی بە سەرجەم نەتەوەکانی نەمساو مەجەر.

١١- وازهێنانی هێزی بیانی لە ڕۆمانیا و سربیا و چیای ڕەش [٤٧].

١٢- لە بواری پیشەسازی و دارایی دا، ئامارەکان ئاماژە بە زیاد کردنی دارایی نەتەوەیی دەدەن، وەك ١٩١٤، (١٩٢) ملیار بوو بەلاّم سالّی ١٩٢٠ گەیشتە (٤٨٩) ملیار دۆلار واتا دووجار و نیو زیادی کرد [٤٨].

١٣- دامەزراندنی ڕێکخراوێکی گشتی نەتەوەکان.

١٤- ڕاستکردنەوەی سنوری ئیتالیا (سنوری ولاّتی نەتەوە بێت) [٤٩].

لە ٣ ئۆکتۆبەری ١٩١٨ز ئەڵمانیا وەکو گفتۆگۆکانی ئاشتی ڕەزامەندی لەسەر (١٤) بەندەکەی ولّسن دەربڕی [٥٠]، بەلاّم کلمەنسۆ بە گاڵتە جاریەوە ووتی پەروەردگاریش تەنها (١٠) ڕاسپاردەی هەیە و هیچی تر، بەلاّم لۆید جۆرج

توانجێکی ئاشکرای نەخستەڕوو، هێندە نەبێ وتبووی هەر دەبێت ڕەوا بەسەر هێزدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن [٥١]، چواردە بەندەکەی ولسن لە لایەن هاوپەیمانانەوە ڕەتکرایەوە بۆیە ڕاگەیاندنێکی یەکلایەنەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیاتی ئەوە بیتە ڕامیاری فەرمی هاوپەیمانان [٥٢].

## تەوەرەی سێیەم

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆنگرەی ئاشتی پاریس:

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهان، وولاتە سەرکەوتووەکانی شەڕلە پاریس کۆبونەوە، ئەڵمانیایان کێش کرد بۆ کۆبونەوەکە، ئاما نجیان ئەوە بوو ئەو کێشە و گیر و گرفتانە چارەسەر بکەن، کە بونەتە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ ئەگەر نەتوانن چارەسەری بکەن، ئەوا خوێنی ئەوانەی لە ماوەی نێوان (١٩١٤–١٩١٨) کوژران بە فیڕۆ دەچێت، بۆیە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩١٨) هاوپەیمانان خۆیانیان بەرامبەر ئەرکێکی گران بینییەوە چونکە ئەم شەڕە تەنها ئەورووپای نەهەژاند بوو، بەڵکو دەوروبەری ئەورووپاشی هەژاند بوو، زۆربەی وولاتانی بە شەڕ هاتووی دەرەوەی ئەورووپا بەشدارییان لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس کرد [٥٣].

بە دانپیانان و ڕێزگرتن لە ڕۆڵی گەورەی فەڕەنسا، لە سەر شەڕی یەکەمی جیهان، شاری پاریسیان هەڵبژارد، تاببێتە بارەگای (کۆنگرەی ئاشتی) *لەسەرەتای ساڵی ١٩١٩شاندی ولاتان، گەیشتنە پاریس، ژمارەیەکی زۆر دیبلۆمات و ئەفسەرانی سوپا و یاسا زان و کەسانی ئیداری و ئابوری و پیاوانی کاری نوێنەری کرێکاران، وەزیر وئەندامانی پەرلەمان، ڕۆژنامە نووسیشیان لەگەڵ بوو [٥٤]،

لـە ڕۆژی هـەینی، سـەرۆك ولّسن بـە سـواری كەشـتییەك گەیـشتە فەڕەنـسا بەمـەش تەحـەدای هـەموو ئـەو ئەمریكیانـەی كـرد، كـە باوەڕیـان وابـوو، نابێـت سەرۆك خاكی وولآت بە جێبهێڵێت ، لە كۆنگرەی ئاشتی پاریس ناوی ولّسن وەك ئەستێرەیەكی پرشنگدار، لـە ئاسمـانی كـۆنگرە دەركـەوت، وەك چـۆن مەسـیح دابەزێتە سەر زەوی خێرو خۆشـی پیشانی خـەڵك بـدات [٥٥]، سـەرۆكی ویلایەتـە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ولّسن سەرۆكی شاندی ئەمریكی دەركـرد، كـە ئامـادەی كۆنگرەكە بوو، [٥٦] بەلآم زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئـەمریكا لە دژی ئەو بڕیارەی سەرۆك ولّسن وەستان، چونكە پێیـان وابـوو نابێـت سـەرۆك وولآت جێبهێڵێـت، تەنانـەت كاتێـك ولّـسن بـەرەو پـاریس بەرێكـەوت، ڕۆزفێڵـد، ڕایگەیاند ولّسن هیچ دەسەلآتێكی نیـە بـە نـاوی گـەلی ویلایەتـە یـەكگرتووەكانی ئەمریكاوە قسە بكات [٥٧] جگـە لـە (ولّـسن) نوێنـەری ویلایەتـە یـەكگرتووەكانی ئەمریكا بوو، هەریەكە لە (كلیمنسۆ) سەرۆك وەزیری فەرەنسا كە ناسـرا بـوو بـە (شێرە پیرەكە)، (لویج جـۆرج) سـەرۆك وەزیـری بـەریتانیا (ئـۆر لانـدو) سـەرۆك وەزیری ئیتالیـا ئامـادە بـوون [٥٨]، جگـە لـە نوێنـەری سـەرجەم وولآتـە بەشـدار بووەكان كـە نوێنـەری ٣٢ وولآت بـوون تەنانـەت نوێنـەری كـورد شـەریف پاشـا ئامادە بوو، كۆنگرەی ئاشتی پاریس بەسەر دوو خولدا دابەش بوو ئەوانیش:

خولی یەكـەم : لـە (١٢ كـانوونی دووەم ١٩١٩) بـۆ (١٩١٩/٥/٢) لـەم خولـە دا ئەنجومەنێكی دە كەسی پێكهات ئەوانیش هەریەكە لە سەرۆك وەزیـران وەزیـری دەرەوەی وولآتـانی (بـەریتانیا، فەرەنـسا، ویلایەتـە یـەكگرتووەكانی ئـەمریكا، ئیتالیا) دوو نوێنەری ژاپۆنیش لە ئاستی باڵوێزدا بەشدار بوون.

خـــولی دووەم : لـــە (٢٤/ ٥/ ١٩١٩) بـــۆ (٢٨/ ٦/ ١٩١٩) خایانـــد، تیایـــدا سەرۆكانی هەر چوار دەوڵەتە زلهێزەكە دانیشتن بۆ چارەسـەركردنی كێـشەكان و

تاوتوێ کردنیان، لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس دا، ئەڵمانیا بە بەرپرسیار دانرا لە هەڵگیرساندنی شەڕ، ویستیان ئەڵمانیا ناچار بکەن قەرەبووی زیانەکان بدات بە وڵاتانی کە لە شەڕدا زیانیان لێ کەوتووە، ئەمەیان بۆ لیژنەیەك بە جێهێشت بە ناوی لیژنەی قەرەبووەکان، ئەویش قەرەبووی بەسەر ئەڵمانیادا سەپاند کە دەخەملێندرا بە (١٣٢) ملیار مارکی زێڕ، هەروەها دەبوو سوپای ئەڵمانیا لە سەد هەزار سەرباز تێنە پەڕێت، جگە لە سنور دانان بۆ هێزی دەریایی ئەڵمانیا، هەروەها ئەڵمانیا بۆی نەبوو ژێردەریایی دروست بکات، دەبوو خزمەتی سەربازی زۆرەملێ هەڵبگرێ،جگە زۆر خاڵی تریش، ڤێرسایی بۆیە مایەیی دەربڕینی نارەزایی لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، چونکە ئەم رێککەوتنە درایە کۆنگرێس تا رەزامەندی لە سەری دەربڕێت، بەلاّم زۆربەی ئەندامانی کۆنگرێس لە پارتی کۆماری بوون، نارەزاییان دەربڕی دژی ڤێرسای، مەبەستیان بوو گورزێك لە پارتی دیموکرات بدەن، جگە لەمانە ولسن لە پاریس لە سەر حیسابی چواردە بەندەکە بە بەرژەوەندی بەریتانیا و فەرەنسا زۆر لە پلە و پایەیی کەم کردەوە، ئەمەش ئۆپۆزسیۆنی چالاك کرد بە تایبەتی دۆستانی ئەڵمانیا، دۆستانی ئیتالیاش وایان دەبینی هاوپەیمانان لە بەڵێنەکانی خۆیان پەشیمان بوونەتەوە سەبارەت بە ئیتالیا، هاورێیانی ئیرلەنداش لەوە تورە بوون کە ئیرلەندا لە ژێر دەسەلاّتی بەریتانیا مایەوە، هەر بۆیە لە ئازاری ١٩٢٠ کۆنگرێس بریارێکی دەرکرد کە ئاماژە بەوە دەدات پەیمانی ڤێرسایی لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە قبوڵ ناکرێت [٥٩].

پەراوێزەکانی ئەم توێژینەوەیە

١- بەبێ نووسەر، ئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی و ڕێکەوتنی ئاشتی، و: لقمان باپیر، گۆڤاری مێژوو، ژمارە(٧)، هاوینی ٢٠٠٨، ل ١١٣

* بەڵام د. عەونی عبدالرحمن سەبعاوی دەڵێت ٧،٨ ملیۆن کەس کوژران، ل ٢١٥.

٢- بە بێ نووسەر ئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی و ڕێکەوتنی ئاشتی، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣دواتری.

٣- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە د. فاضل حسین - د. کاظم هاشم نعمە، تاریخ الاوربي الحدیث، مطبعة الوزارە ص٤- د. عبدالوهاب عباس - د. عبدالجبار عطوم جاسم، تاریخ العام الثالث ١٩١٤- ١٩٤٥، ط١، مطبع وزارە تعلیم عالی، ١٩٨٣، ص ٤٢.

* لە نیسانی ساڵی ١٧٥٨ لە فێرجینا لە دایك بووە، باوکی سنبرۆ مۆنرۆیە ساڵی ١٧٨٢ تا ساڵی ١٧٩٤ ئەندامی کۆنگرێس بووە ساڵی ١٧٩٤ بۆتە باڵوێزی ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا لە فەرەنسا، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای وەرگرتووە (١٨١٧-١٨٢٥)، ئەندامی پارتی دیموکرات بووە ساڵی ١٨٣١ کۆچی دوای کردووە، دیب علی حسین، الولایات المتحدة الامریکیة من الخیمة الی الإمبراطوریة، ط٢، الاوائل للنشر والتوزیع، دمشق، ٢٠٠٤، ص ص٢١٥-٢١٦. سەلیم حوسنی و سەردار عزیز، ڕێبازی سەرۆکەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا،و: سەردار محمد چ.١، سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٩، ل ١٣.

٥- الدکتۆرأسماعیل أحمد یاغی، معالم تاریخ الحدیث نشأە الولایات المتحدە الامریکیە، ط١، مکتبە العبیکان، الریاض، ٢٠٠٥،ل ل٦٠-٦١.

** کۆنترین پارتی ویلایەتە یەکرتووەکانی ئەمریکایە، لە ساڵی ١٨٢٩ سەرکردە ئەندرۆ جاکسۆن دایمەزراند کە ئەوکاتە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، هیچ جۆرە جیاوازییەکی لەگەڵ پارتی کۆماریدا نیە بەڵام جیاوازی لە نێوانیاندا،تەنها بۆچونیانە سەبارەت بە ڕامیاری ناوخۆ و دەرەکی جگەل لەم دوو پارتە دوو پارتی دیکەش هەن کە ئەوانیش پارتی سۆسیالیست و پارتی شوعین، د.مستەفا رافعی، ئێمەو ئەمەریکا (گەشت نامە) و : د. محمد عبدالله کاکە سور،چ.١، چوار چرا، سلیمانی، ٢٠٠٦، ل ل ٦٠-٦١.

٦- ئومێد خطاب وهاب، سەرکەوتنی ئۆباماو ئایندەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و جیهان، (ڕۆژنامەیچەرموو) ژمارە (١٩) ٢٠٠٩/١/١٥، ل ٧ .

٧- د. ئاراس فریق زەینل، مێژووی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە کۆنەوە تا ئەمرۆ،چ١، چاپخانەی پەیوەند، ٢٠١٠ سلیمانی، ل ٢١٠.

٨- د. صلاح هریدی، تاریخ اوروپا الحدیث و المعاصر ١٧٨٩-١٩١٤،ط١، دارالوفا، ٢٠٠٣، الاسکندریه،٢٠٠٣، ص ص ٣٥٠ -٣٥١.

٩- فریشتە نورانی، مێژووی گۆرانکاری کۆمەلآیەتی و سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، و : هەورامان فریق کریم، چ١، خانی،دهۆك، ٢٠٠٧، ل ٧١.

١٠- د. ئاراس فریق زەینل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٢.

١١- الدکتۆر اسماعیل احمد یاغی، مصدر السابق، ص ١٧٦.

١٢- د. محمد **مظفر** الادهمی، تاریخ اوروپا فی قرن التاسع عشر،ط١، وزاره تعلیم عالی والبحث العلمی، بغداد، ص٧٩.

١٣- د. محمد **مظفر** الادهمی، مصدر نفسه، ص٧٩.

* ئەو هاوپەیمانێتیە بوو لە پایزی ١٨٨٢لە نێوان ڕوسیا و نەمسا بەسترا بەمەبەستی گەرانەوەی مولکەکانی شاهانەی ئەوروپا کە لەکاتی شەرەکانی ناپلیۆن لە دەستیان چوو بوو، فەرەنساش چووە پالیان، لویسی هەژدە سوپایەکی نارد بۆ یارمەتی دانی شایی ئیسپانیا تا دەسەلآتی بۆبگەرێتەوە، م.د. عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٣٦- ١٣٧.

١٤- عبدالعزیز سلیمان و عبدالمجید نعیمی، تاریخ المعاصر اوروپا من ثورة الفرنسیه حتی حرب العالمیه **ثانیة**، ص١٧٢ ; د.اسماعیل احمد یاغی، المعالم تاریخ الامریکی الحدیث (نشأ الولایات المتحده امریکیه) ص ١٧٦.

١٥- عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧ .

١٦- د.فازل حسێن - د. کازم هاشم نعمه، مێژووی نوێی ئەوروپا ١٨١٥-١٨٣٩، و :مستەفا سەید عەلی،چ١، چوارچرا، سلیمانی،٢٠١٠، ل ل ١٤٩--١٥٣.

١٧-د.ئاراس فریق زەینل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٨.

* سوپای سەربازی ئەلمانیا لە ٦٢٣ هەزار سەرباز زیادی کرد بۆ ٨٢٠ هەزار لەگەل ئەندانمانی تری ئالآی ئەلمانی یەك ملێون و نیو سەرباز بوون، نەمسا و فەرەنساش بە هەمان شێوە ژمارەی سەربازیان زیادی کرد بەلآم بە ئەندامی ئەلمانیا نە بوون، فەرەنساش بە

خواستی سەرۆك كۆمار (ریمۆ بون كارا) خزمەتی سەربازی لە دوسال بۆ سێ ساڵ زیادی كرد، ڕوسیاش بە هەمان شێوە ژمارەی سەربازی بۆ ملیۆنێك و هەش سەدهەزار سەرباز زیادی كرد،د. ئەحمەدی نەقیب زادە، مێژووی دیبلۆماسی و پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەكان لە پەیمانی ڤیستیڤالیەوە تا ئەمڕۆ،و: فەردین ئەشدیانن، چ١، چوار چرا،سلیمانی، ٢٠١١،، ل ٢٠٢ .

* ڕێكخراوی نهێنی دەستی ڕەش بەشێك بوو لە بزوتنەوەی پان سلاڤیزم، كە دیمیریڤیچ سەرۆكی ڕێكخراوی زانیاری ئاسایشی سربستان بەڕێوەی دەبرد، د. احمد نەقیب زادە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٤.

١٨- هـ.١٠. ل. فیشەر،تاریخ الحدیث اوروپا، ١٧٨٩-١٩٥٠، ترجمە : احمد نجیب هاشم و دیع زەبەع، وەرگێرانی بۆ كوردی :شوكر سلیمان، سەروین ئەرجان،چ١، ڕۆژهەلات، هەولێر،٢٠٠٩، ل ٢٥٣; لوقمان خەیاڵی، پوختەیەك لە مێژووی گەورە زلهێزی جیهان، چاپی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٥، سلیمانی، ل ٤٨.

* بیست و حەوتەمین سەرۆكی ویلایەتە یەكرتووەكانی ئەمریكایە لە ویلایەتی فیرجینا لە دایك بووە، لە زانكۆی پرستۆن دەرچووە، لە زانكۆی هویكنس پلەی زانستی دكتۆرای لە سیاسەتدا وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٠٢-١٩٠٤ سەرۆكی زانكۆی پرنستۆن خاوەنی پەرتوكی (حكومەتی كۆنگریسی ویلایەتە یەكگرتووەكان ئەمریكا و ساڵی ١٩٠٨ مێژووی گەلی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە كە لە ساڵی ١٩٠٢ بەرهەمی هێناوە)، ساڵی ١٩٢٤ كۆچی دوای كردوە، یاسین صابر صالح،ئینسكلۆ پیدیای گشتی،چ١، سەردەم، ٢٠٠٥، سلیمانی، ل ل١١٦٦-١١٦٧.

١٩- م.د. عەونی عبدالرحمن سبعاوی،میژووی نوێ و هاوچەرخی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا،و: د. محمد عبدالله كاكە سور، چ١، ڕۆژهەلات، ٢٠١٠، هەولێر، ل ٢٠٣.

٢٠- د. ئاراس فریق زەینەل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٩.

٢١- فریشتە نورائی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٤.

* كۆی گشتی ١٢٠٠كەس خنكان ١٠٠ یان ئەمریكی بوون جگە لەوەی، ٣٥ كەشتی تری ئەمریكی كەوتنە بەر هێرشی ژێر دەریایی ئەڵمانیا (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە لوقمان خەیاڵی

کورتەیەك لە مێژووی گەورە زلهێزی جیهان ل ٤٨،بەڵام د.ئاراس دەڵێت ١٢ کەسیان ئەمریکی بوون.

٢٢- سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٤.

٢٣- د. عەنی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٥.

٢٤-هەمان سەرچاوە، ل ٢٠٥.

٢٥- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٥. ٢

*- دەستپێکردنی شۆڕشی ڕوسی لە سەرەتای مارسی ١٩١٧.

- چوونە ناوەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ شەر ٦/٤/ ١٩١٧.

-تێکشکاندنی سەنگەری ناوخۆی ئەڵمانیا لە دوای هەرەسهێنانی هێزێکی سەدە، د. صلاح هەریدی، دراسات فی التاریخ الامریکی، دار الوفاء ، الاسکندریە، ٢٠٠٠، ل٣٥١.

٢٦-بهیج بلحیس، احداث قرن عشرین (موسوعە العالم بین الحربین العالمیتین)، ط١، دار نوبلس، لبنان، ٢٠٠٤، ص٩٨.

٢٧-م.د. عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١١.

٢٨- د. صلاح احمد هریدی، مصدرالسابق، ص٢٤١.

٢٩- فرشتە نورائی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٦.

٣٠- م.د. عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٢.

٣١- هە مان سەرچاوە، ل ٢١٢.

٣٢- د. اسماعیل أحمد یاغی، مصدر السابق، ص ١٨٥.

٣٣- فیشەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩٠.

٣٤- بێ نووسەر، ئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی و ڕێکەوتنی ئاشتی، سەرچاوەی پێشوو، ١١٥.

٣٥- م.د. عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٦- ٢٠٧.

٣٦- د. ئاراس فریق زەبنەڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٢.

* ئەو بەڵێنە بوو کە لە لایەن بلفۆری وەزیری دەرەوەی بەریتانیا درا لە (١٩١٧/١١/٢) بە دامەزراندنی کیانێکی جولەکە لە فەلەستین. (توێژەر)

٣٧– د. اسماعيل احمد ياغي، مصدر السابق، ص ١٨٧.

٣٨– م.د. عونى عبدالرحمن بيعاوى، سەرچاوەى پێشوو، ل٢١٢.

٣٩– د. مفيد الزيدى، موسوعه تاريخ اوروپا الحديث والمعاصر، مجلد٣–٤، دار اسامه، عمان،٢٠٠٤، ص ٩٣٦.

٤٠– د. ئاراس فريق زەينەڵ، سەرچاوەى پێشوو، ل٢٧٣.

٤١– م.د. عونى عبدالرحمن سبعاوى، سەرچاوەى پێشوو، ل ٢١٥.

٤٢– فريشته نورائى، سەرچاوەى پێشوو، ل ١٦٨.

٤٣– م.د. عونى عبدالرحمن سبعاوى، سەرچاوەى پێشوو، ٢١٢

٤٤– د. ئاراس فريق زەينەڵ، سەرچاوەى پێشوو، ل ٢٧٦.

٤٥– د.اسماعيل احمد ياغي، مصدر السابق، ص ١٩٠.

٤٦– د. ئاراس فريق زەينەڵ، سەرچاوەى پێشوو،ل٢٧٧.

٤٧– بهيج بلحيس، مصدر السابق، ص ٩٨.

* بەشی توركيا لە ئیمپراتۆری عوسمانی ئێستادا پێویستە دلنیا بیت لە مسۆگە ر كردنی سەروەری خۆی بەلام ئەو نەتەوانەی تر كە ئێستا لە ژێر كۆنترۆڵی حكومەتی توركیان دەبێ دوور لە هەموو گومانێك ژیانیان مسۆگەر بكرێت هەلی پێشكەوتنی بە دڵنیاییەوە مسۆگەر بكرێت، هێربەت مونتكومری، كوردی سوریا بونیكی نكۆڵی لیكراوە،و: مینەو پێشەوا، چاپخانەی ڕەنج، سلیمانی، ٢٠٠٩، ل ١٨.

٤٨– د. اسماعيل احمد ياغي، مصدر السابق، ص ص ١٩٠ – ١٩١.

٤٩–د. ئاراس فريق زەينەڵ، سەرچاوەى پێشوو، ل٢٧٦.

٥٠– عمر الديراوى، جەنگی یەكەمی جیهانی، و : سەفین لاو چاك، چ١، چوارچرا، سلیمانی، ٢٠٠٩، ل ٣٨٦.

٥١– هێربەرت مونتكومری، سەرچاوەى پێشوو، ل١٨.

٥٢– د. فازڵ حسن، د. كاظم هاشم نعمه، مصدرالسابق،ص٧٩.

* نوێنەری فەرەنسا سەرۆك وەزیری كلیمانسۆ بوو، بەریتانیا لوید جۆرج بوو، ئیتالیا ئۆرلاندو بوو، بەلام نەیان هێشت نوێنەری ڕوسیا بەشداربێت، چونكە لە ئازاری ١٩١٨ لەگەڵ

ئەڵمانیا واتا پێش خۆبە دەستەوەدانی ئەڵمانیا رێکەوتننامەی ئاشتی مۆر کردبوو، د. مفید الزیدی، مصدر السابق، ص ص٩٤٥-٩٤٦

٥٣- بەبێ نووسە، ئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی رێکەوتنی ئاشتی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٠.

٥٤- د. ئاراس فریق زەینەل، سەرچاوەکانی پێشوو، ل ٢٨١.

٥٥- د. مفید الزیدی، مصدر السابق، ص٩٤٦.

٥٦- د. ئاراس فریق زەینەل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٠.

٥٧- هەمان سەرچاوە، ل ٢٨١

٥٨- م.د. عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٨.

٥٩- م.د. عونی عبدالرحمن سبعاوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٨-٢١٩.

# دامەزراوەی شێخی ئیسـلام لە دەوڵەتی عوسمانی

ئامادەکردنی قوتابی: قـارەمان حەیـدەر رەحمان

## پێشەکـی

### گرنگی بـابـەتەکـە :

سەبارەت بە مێژووی گشـتی دەولـەتی عوسمـانی ، واتـە نوسـینەوەی مێژووی رووداوەکان، زۆر نووسراوە لەهەمان کاتدا زۆر باس لە مـەڕ کەسـایەتی و فـەرمانرەواکانی کـراوە ، بـەڵام زۆرکـەم بـاس لەلایـەنی کـارگێڕیی و دام و دەزگاکانی ئەو دەولەتە کراوە بە تایبەتش دەزگای شێخی ئیسلام، تەنها لەچەند توێژینەوەیەکی کەم نەبێت کە هەستاون بە چارەسـەرکردنی ئـەم کـەم وکورتیـە بەپێی تواناو بـە شـێوازێکی ئـەکادیمی ، هۆکارەکەشـی بـۆ کـەمی سەرچاوەی پێویست دەگەڕێتەوە کەباس لـە چـینی پیـاوانی ئـاینی بکـات کـە گوزارشـت لـە پێکهاتەی رۆشنبیریی و ئاینی و دادوەری دەولەتی عوسمانی دەکەن.

### هۆکـــاری هەلبژاردنی بـــابـەتەکە :

لایەنی شارستانی لە دەولەتی عوسمانی یەکێکە لـە لایەنـە زینـدووەکانی ئـەو مێـژووەی تۆمـارکراوە، چـونکە فاکتـەرێکی سـەرەکی گەشـەکردنی دەولـەتی عوسمانی بووە ، بەتایبەتیش دەزگای شێخی ئیسلام کـە توانیویـەتی بنـەماکانی دەولەت بۆ عوسمانیەکان جێگیربکات لەرێگای ئـەو (فـەتوا)یانـەی بوونـە یاسـا و

سولتان و حکومەت کاریان لەسەر دەکرد ، جگە لە کاریگەریەکانی ئەو دەزگایە لە بواری سیاسی، لە هەمان کاتدا کاریگەری زۆرگەورەی هەبووە لە بواری کۆمەلایەتی.

بۆیە من لەئەنجامی هەستکردنم بە گرنگی وبایەخی ئەم دەزگایە لە بوارەکانی دادوەری و پەروەردە و لایەنەکانی تریش بە پێویستم زانی تۆزیك بە ووردی تیشك بخەمە سەر ئەم دەزگایە ، هەرچەندە سنوورو ماوەی توێژینەوەکەم کورت و کەمە کەبیگومان دەبێتە هۆی ئەوەی کەم و کورتی زۆر تێدابیت ، بەلاَم بە پشتیوانی خوا بەپێی توانا ئەوەندەی لەتوانام هەبووە لەو کات و سنوورە کەمە ئەنجامم داوە بە باسکردنی هێلە گشتیەکانی دەزگای شێخی ئیسلام لە دەولەتی عوسمانی.

## سنووری توێژینەوەکەم :

ئەم توێژینەوەیە پێکهاتووە لە پێشەکی و چواربەش و دەرەنجام ، لە بەشی یەکەم باسی مێژووی دروست بوونی دەزگای شێخی ئیسلام دەکەم لەگەڵ چەند تەوەرەیەکی پەیوەندیدار بەو باسە کە فاکتەر بوونە بۆ دروست بوونی ئەودەزگایە وەکو فاکتەری ئاینی و سیاسی و دواتریش باس لە گەشەکردنی ئەم دەزگایە دەکەم بەپێی ئەوگۆرانکاریانەی بەسەر دەزگاکەداهاتووە. بەلاَم بەشی دووەمی توێژینەوەکەم تەرخانکردووە بۆ باسکردنی کاروچالاکیەکانی شێخی ئیسلام لە لایەنەکانی (کۆمەلایەتی – سیاسی)و (یاسایی – شەرعی)، جگە لە تیشك خستنە سەر پێگەی شێخی ئیسلام لەناو دەولەتی عوسمانی و کاریگەریەکانی لە سەر بریاری سیاسی ، ئەمیش بە دوو تەوەری جیا جیا لەیەکتری.لەهەمان کاتدا لەبەشی سێیەمی توێژینەوەکەم هەولمداوە باسی

بارودۆخی کارگێری دەزگای شێخی ئیسلام بکەم، لە قۆناغی دامەزراندن (١٤٢٥-١٥٢٠) و قۆناغی دروستکردنی دەزگاکان (١٥٢٠-١٥٩٥)،ماوەی جێگیربوون و لاوازی دەزگایەکە لە نێوان (١٥٩٥ - ١٨٢٦). لە کۆتایشدا لە بەشی چوارەم تیشك دەخەمە سەرلاوازبوون و هەلوەشاندنەوەی دەزگای شێخی ئیسلام لە ئەنجامی ئەو گۆرانکاریانەی لە پرۆسەی سیاسی هاتنە ئاراوە بەهۆی کودەتای کۆمەلەی ئیتحادوتەرەقی لە سالی ١٩٠٨و دوورکەوتنەوەی شێخەکانی ئیسلام لە بنەماسەرەکیەکانی ئیسلام ,

دەرەنجامیش پوختەی تێبینی و دەرهاویشتەکانی لەسەر ئەم بابەتە کۆم کردنەوە بیروڕای خۆمم لەسەریان دەربریوە.

## کیشەو گیرو گرفتەکان :

ئەو کێشانەی کەوا لە ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە رووبەرووم بونەوە، بریتی بوو لە کەمی سەرچاوەی پێویست لە سەر بابەتەکە ، ئەو سەرچاوە گرنگەی کە زۆر لە مێژونوسان پشتی پێدەبەستن تەنها یەك سەرچاوەیە کە ئەمیش (ئەکرەم کیدو)یە خاوەنی کتێبی (مؤسسة شیخ ألاسلام ). لە کاتیکدا خودی ئەم سەرچاوەش لە کتیبخانەکانی ئیمەش دەست ناکەویت ، بەلام سەرباری ئەمەش بەیارمەتی چەند هاورێەکی بەرێز توانیم هەندێك سەرچاوە بەگوێرەی پێویست کۆبکەمەوە و ئەم سەرچاوەی کە مێژونوسانیش زۆر جەختیان لەسەر دەکردەوە کە کتیبی (مؤسسة شیخ ألاسلام) لەرێگای ئینتەرنێت لە کتێبخانەی مستەفا بەدەستم کەوت ، لەگەڵ ئەمانەش وەرگێرانی سەرچاوەکان بۆ زمانی کوردی کاتیکی زۆریان لێ سەرف کردم. بەلام گەورەترین

کێشە کە لەو توێژینەوە رووبەرووم بۆتەوە بریتی بووە لە کورتکردنەوەی زانیاریەکان بەهۆی کەمی سنووری توێژینەوەکە.

## ئەم سەرچاوانەی کەوا لەتوێژینەوەکەم سوودم لێوەرگرتووە :

لەرێزی پێشەوە زۆر سوودم لە دوو سەرچاوە بینیوە کە بەتایبەتی باسیان لە (شێخی ئیسلام)کردووە بە دوورودرێژی ،یەکەمیان (مؤسسة شیخ ألاسلام في الدولة العثمانیة)کە نوسەرەکەی (ئەکرەم کیدۆ )یە ، لە گەڵ بەرگی یەکەمی کتیبی (تأریخ مؤسسة شیوخ الآسلام في ألعهد العثماني ١٤٢٥-١٩٢٢) کە نوسەرەکەی (ئەحمەد سدقی علی شقیرات)و هەردوو بەرگی کتیبی (تأریخ ألدولة ألعثمانیة)کە نوسەرەکەی (یلماز ئوزتونا )یە.لە هەمان کاتدا بەمەبەستی دەولەمەندکردنی بابەتەکە سوودم لەچەند سەرچاوەیەکی تر وەرگرتووە بە تایبەتی ئەوانەی زانیاری زیاتریان ئەبەخشی لە سەر کەسایەتی و هەندێك دەستەواژەیان روونده‌کردەوە.

بیگومان توێژینەوەکەم کەمو کورتی تێدایە ، بەڵام دەبێت ئەو بارودۆخە لەبەرچاوبگیرێت کە ئەم توێژینەوەی تێدا ئەنجام دراوە ئەمیش لە ئەنجامی سەرقالبوونی زۆرمان بەو ئەرکانەی کەوا لەسەرشانمە رۆژانە وایکردووە کات و ماوەی کەمان لەبەردەست بیت بۆ دەولەمەندکردنی بابەتەکە ،خوای گەورە لە گوناهەکانمان و ئیوەی بەرێزیش لە کەم و کورتیەکان دەمانبوورن أنشاءالله.

## تەوەری یەکەم:

## مێژووی دروست بوونی دەزگای شێخی ئیسلام

مێژووی دروست بوونی دەزگای شێخی ئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانی عوسمانیەکان بە ئاینی ئیسلام و زانایانی ئاینی. سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە عوسمانیەکان هەر لەسەرەتای دروست بونیانەوە وەکو میرنشینێك لە ئەنادۆل ئاشنایەتیان لەگەڵ ئاینی ئیسلام دروستکردو ئاینەکەیان قبوڵ کرد ، بۆیە کۆمەڵگای عوسمانی هەمان داب و نەریتی کۆمەڵگا موسلمانەکانی تریان پەیرەو دەکرد لە جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینیەکاندا[1].

ئاینی ئیسلام پێگەیەکی بەهێزی لە نێوەندی سیاسی دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو ، چونکە سوڵتان و میرەکانی خۆیان جیا نەدەکردەوە لە بەشەکانی تری جیهانی ئیسلامی ، یاساکانیان هەموو لە شەریعەتی ئیسلامیەوە وەرگیرابون ، عوسمانیەکان خۆیان بە پارێزەری ئەو ئاینەو خزمەتکاری دەزانی ، چونکە ئەمان دەیانگووت ئەو ئاینە پارێزەری دەوڵەت و ڕژێمەکەمانە ،هەروەها پیاوانی ئاینی بەشێوەیەکی گشتی بەشی سەرەکی کیانی دەوڵەتیان پێك دەهێنا و زۆربەی هەرە زۆری کاروبارەکانی دەوڵەت بەپێی شەریعەتی ئیسلامیەوە بەڕێوەدەچوو[2].

کاتێك کە میرنشینی عوسمانی لە سەدەی ١٤هـەم لە ڕۆژئاوای ئەنادۆل لە سەر سنووروتوخبی دەوڵەتی بێزەنتی دروست بوو ، تورکمانە کۆچەرەکان زۆر چالاك بوون لەبەرئەوەی شەڕکەری چاکیان هەبوو و کە لەسەر بنەمای جیهادو غەزاکردن ئەوپەری تواناکانی خۆیان بەکاردەهێنا، هەریەکێك لەو عەشیرەتە تورکانەی کەوا هاتبوونە ناوچەکە بۆ یەکێك لە شێخەکانی خاوەن تەریقەت

دەگەڕانەوە، لەئەنجامی هەلوەشاندنەوە و لەناوچوونی دەوڵەتی سەلجوقی لەسەر دەستی مەغۆلە ئیلیخانیەکان و فشاری بەردەوامی ئەو هێزانەی مەغۆل بۆسەر میرنشینەکانی ئەو ناوچانە ، میرنشینی عوسمانی دەرفەتی زێتری بۆ رەخسا بۆ جیهادکردن و فراوانخوازی لە ناوچەکەدا، لەبەرئەوەی کەوتبوە سەرسنووری(دارالکفر)، ئەمەش لەئەنجامی دروست بوونی بۆشاییەکی سیاسی و ئیداری لە ناوچەکە دوای روخانی سەلجوقیەکان، لەنێو ئەو عەشائیرانە چەندان شێخ و دەروێش هەبوون کە لە سەدەی ١٢ و ١٣ ز رۆلی گەورەیان گێڕاوە لە ئامۆژگاریکردنی عەشیرەتە تورکمانەکان و کاریان دەکرد بۆ پەروەردەکردنی ئەو تورکمانانەی کە ئاشنایەتیان لە گەڵ ئاینی ئیسلامدا نەبوو ، بە پەروەردەیەکی ئاینی رێکو پێك پڕ لە ئیمانیان دەکردن لە پێناو بەرفراوانکردنی سنووری مالّی ئیسلام [٣]، لەگەڵ نیشتەجێبوونی تورکەکان لە ئەنادۆڵ ژمارەو رێژەی ئەم شێخ و دەروێشانە لە ناوچەکەدا زیاتربوون [٤].چەندان تەکیە و زاوییەیان بۆ ئەم مەبەستە دروست کردبوو ، بەم جۆرە توانیان ئایدیای (الفتوە )* بگۆڕن بۆ (جیهاد)کە ئاینی ئیسلام هەمیشە جەختی لەسەر کردۆتەوە لە دژی خوانەناسان[٥].

ئەو زانایانەی کە لە پایتەختە ئیسلامیەکانی ئێران و میسرو قرم خوێندبویان لەگەڵ چەندان کەسی بیروقراتی سەلجوقی و ئیلیخانی کۆچەر کە لەناوەراستی ئەنادۆلەوە هاتبوون پێکەوە ووردە ووردە دەستیان کرد بە دانانی بناغەی میکانیزمی بەرێوەبردن لە میرنشینە سنووریەکان ،لە هەمان کاتیشدا چەند دەزگایەکی رۆشنبیریشیان دامەزراند. میرنشینی عوسمانی لە کاتو ساتێکی زۆر هەستیاردا گەشەی کردو دروست بوو ، لەو کاتەدا کە ناوچەکە کەوتبووە بەر

هەرەشەو پەلامارەکانی مەغۆل بەتایبەتی عەرەبە موسلمانەکان لە رۆژهەلاتدا چەندین دەولەت وشاریان لەبەرامبەر پەلاماری مەغۆلەکان لەدەست دابوو[٦].

هەر لەو سۆنگەشەوە دەزگای شێخی ئیسلام لە دەولەتی عوسمانیدا بەهۆی پێویستیەکی زۆربە کارەکانی ئەم دەزگایە دامەزرا ، دامەزراندنی ئەم دەزگایەش دەگەرێتەوە بۆ رۆلی سولتان موورادی دووەم کە کاریگەری تەریقەتی سۆفیگەری لەسەربووە ، کاتێك هەردوو دەسەلاتی ئایینی و دونیایی بەیەکتری کۆکردنەوە. سەرچاوە مێژوییەکان ئاماژە بە دوو فاکتەری سەرەکی دەکەن بۆ دروستکردنی دەستەی شێخی ئیسلام (ئـایینی و سـیاسی )،کە لەو کاتەدا پەیوەندیان بە کاروباری ناوخۆ و دەرەوە هەبووە [٧].

دەرکەوتنی پۆستی شێخی ئیسلام بۆ سەرپەرشتی کردنی کەرتی ئاینی – ئیسلامی بوو لە دەولەت، کە رەنگە هۆکاری دامەزراندی جگە لە هۆکارە سەرەکیەکان بگەرێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی لاوەکی وەك:

بەشێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کەرەنگە عوسمانیەکان هەولیان دابێت هاوشێوەی دەولەتەکانی تری ئیسـلامی پێش خۆیان کاروباری وولات بەرێوە ببەن ، چونکە کاریگەربوینە بە سیستەمی ئەوان کە پۆستی (قـازی)یان هەبووە وەکو دەولەتی عەباسی.

هەندێکی تر لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کە لەئەنجامی ئەم پێشکەوتنەی لە پۆستی (موفتی )یدا هاتەپێشەوە ، بە تایبەتی دوای ئەوەی عوسمانی یەکەم شێخ (ئەدەبالی )* بە موفتی دامەزراند دواتر (تۆرسۆن– ی زاوای)** لە پاش مردنی شێخ ئەدبالی دامەزراند کە کارەکەی بریتی بوو لە فەتوا دەرکردن ،ئیتر ئەم پۆستە وورده وورده گەشەی کرد تاکو گەیشتە ئاستی (شێخی ئیسـلام). لەگەلّ ئەمانەشدا هەندێکی تر لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ

ئەوە دەکەن کەوا عوسمانیەکان تەنها لە سۆنگەی دوو هۆکار ەوە گرنگیان بە شێخی ئیسلام داوە لەبەرئەوەی کە دەولەتێکی ئیسلامی بوینە ، و هەروەها لەبەرئەوەی لەدوای عەباسیەکان ئالای خەلافەتیان وەرگرتووە [٨].

لەلایەکی دیکەوە بەشێك لە مێژوونوسە ئەوروپیەکان پێیان وایە دامەزراندنی دەزگای شێخی ئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانی و رێکخستنی چینی پیاوانی ئاینی وەکو چاولێکەریەك هاتووە بەهەمان شێوەی رێکخستنەکانی کەنیسەی مەسیحی کە لەژێر دەسەلآتی (بەتریك –ئەرسەدۆکسی )دابوو،بەلآم ئەم بۆ چوونە پشتی پێنابەستریٚ چونکە هەروەك ئاماژەمان پێکرد پۆستی قازی لەسەردەمی عەباسیەکانیشدا هەبووە[٩] جگە لەمەش ئەمانەکە بریتی بوون لە چینی مامۆستاو قازی و موفتی و ووتاربێژی مزگەوتەکان چینێکی ئابینیان لە دەولەتی عوسمانی دا پێك دەهێنا ، بەلآم وەك فەرمانبەر مامەلەیان لەگەڵ دەکرا ، هیچ جۆرە دەستکەوت و پلەیەکی ئاینیان نەبووە ، لەبەرئەوەی هیچ یەکێك لەمانە دەسەلآتێکی رۆحانیان نەبووە ، بەڵکو ئەمانە هەر لەسەرەتای دروست بوونیان دا کاری پەروەردەیی و دادوەری و راوێژکاریان کردووە [١٠].

سەبارەت بەدامەزراندنی دەزگای شێخی ئیسلام کۆمەڵێ هۆکاری (ئاینی و سیاسی)هەبوون ، ئەو هۆکارانەش دەرهاوێشتەی بارودۆخی ناوخۆیی و دەرەکی بوون.

**یەکەم : هۆکاری ناوخۆیی (ئاینی):**

دوای شکست هێنانی عوسمانیەکان ساڵی ١٤٠٢ز لە شەڕی ئەنقەرە لە بەرامبەر هێزەکانی مەغۆل بە سەرکردایەتی تەیمور لەنگ لە سەردەمی سوڵتان بایەزیدی یەکەم ١٨٣٩–١٤٠٢ز ، قۆناغێکی پر لە ئاژاوە لەناو دەولەتی عوسمانی دروستبوو ، ووڵات لەلایەنەکانی (کۆمەلایەتی و سیاسی)توشی قەیرانی گەورە

بـۆوە ، لــەم کێــشانەش ســەرهەڵدانی جولانــەوەی (شــێخ بدرالــدین)* کــە جولانەوەیەکی ئاینی بوو ، هەڵگری ئایدیای نـوێی روخێنـەربوو. جولانەوەکە لـە ناوچەی دوبریجە لە سالی ١٤١٦ز دروست بوو ، کە کاریگەری زۆری لەسەر لایەنی کۆمەلایەتی و سیاسی و رۆشنبیری دروستکرد (١١).

شـێخ بدرالـدین بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە دەگەرێتـەوە بـۆ بنەماڵـەی سەلجوقیەکان، لەو کاتەدا زۆر لە عەشیرەتە تورکمانـەکانی ناوچـەی سارۆخان و ئەزمیر و دوبروجان دوای کەوتن، زۆربەی ئەوانەی بەشـداری ڕاپەرینەکـەی شـێخ بدرالدین یان کرد لـەو کەسـانەبوون کـە بەرژەوەنـدی و دەسـتکەوتەکانیان لـەناو دەوڵـەتی عوسمـانی لـە دەسـت دابـوو ، جگـە لـە چـینی قوتابیـان و جوتیـارە مەسیحیەکانیش.شێخ بدرالدین بروای بەرۆژی ئـاخیرەت نـەبوو ،گومـانی لـەرۆژی حەشروقیامەت هـەبوو ،سـەبارەت بـە حـەزرەتی مەسـیحیش بـیروورای وابـوو کـە حەزرەتی مەسیح بە جەستە مردووە بەڵام بەرۆح زیندووە (١٢).

شیاوی باسکردنە ئەم بیروورایانەی کەوا شێخ بدرالدین هـەلی گرتبـوو زیـاتر لـە ئایـدۆلۆژیای ئیـشتراکیەتی ئـەمرۆ نزیـك بـوو ، داوای نەهێـشتنی مولکایـەتی تاکەکەسـی دەکـرد و بیروراکـانی لـە هەرسـێ ئـاینی ئاسمـانی وەرگیرابـوو، ئـەم بیرورایانە بوونە هۆکارێك کە لەساڵی ١٤٢٠ز شـێخ بدرالـدین لـە گـەڵ ژمارەیـەکی زۆر لە لایەنگرانی،پاش دەستگیرکردنیان لە هەمان ساڵدا لە سێدارەبدرێت (١٣).

جێگای ئاماژە پێکردنە کاتێك سوڵتان موراد ی دووەم دەسەلاتی گرتەدەست بـۆ زالبـوون بەسـەر ئـەو کێـشانە بـەدوای چارەسـەرێك گـەرا بۆیـە بـیری لـە دامەزراندنی دەزگایەك کردەوە بۆ رێکخستنی کاروبـاری ئـاینی ، بـەو ئامانجـەی لەو هـەموو بیرورایانـەی لـە ئـەنجامی زۆربـوونی موفتیەکانـدا دروسـت بـون کـە

بەهەموو دەولـەتی عوسمانیـدا بلاوببونـەوە رزگـاری بێـت ، بۆیـە بەچـاکی زانـی هەموو فەتوا یەك بخات لەناو دەزگایەك لەناو پایتەختدا(١٤).

**دووەم : هۆکـــاری دەرەکی (ســــیاسی):**

لەسـەردەمی فـەرمانرەوایی سـوڵتانی عوسمـانی بایەزیـدی یەکـەم (١٣٨٩-١٤٠٢) کە دەبێتە بـاپیرە گـەورەی سـوڵتان مـورادی دووەم ** چـەندان سـەربازی مەسـیحی لـەناو سـوپاکەیدا لـە شـەر دژی میرنـشینە ئیـسلامیە تورکمانـەکان بەکاردەهێنا بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت و غنائیم و زەوی‌وزار ، ئـەم کـارەش تـەنها سـوڵتان بایەزیـد کردبووی،چـونکە لـە پێـشتر سـوڵتانەکانی تـر شـەری میرنـشینە ئیـسلامیەکانیان بـە سـەربازە موسـلمانەکان دەکـرد ، ئـەم کـارەش تێروانینێکـی ناشـرین و ناپەسـەندی لـەناو جیهـانی ئیـسلامی دا دروسـتکرد ، نەیارەکانی سـوڵتان بایەزیـد لەوکاتـەدا سـودیان لـەو ناوبانگـە خراپـەی سـوڵتان بایەزیـد وەرگـرت، بۆیـە سـەیردەکەین شکـستی بایەزیـد بەرامبـەر تەیمورلـەنگ لەشەری ئەنقەرە *** ١٤٠٢ زنەو پەری بێدەنگی پێوە دیاربوو.

شیاوی باسکردنە ئـەو هۆکـارە کاریگـەری راسـتەوخۆی لەسـەر شکستەکەی بایەزیدی یەکـەم هـەبووە، چـونکە میرنـشینە دراوسـێکانی دەوڵـەتی عوسمـانی بەهیچ جۆرێك لەو شەرەدا هاوکاری عوسمانیـەکانیان نـەکرد لەبەرئـەوەی بـەپێی شـەریعەتی ئیـســلامی نـەدەبوو سـەربازی غـەیرە موسـڵمان لـەناو لەشـکری ئیسـلامی بونیـان هـەبێت ، جگـە لەمـەش میرنـشینە ئیـسلامیەکان تـەنها لـەژێر ئاڵای جیهادو غەزاکردنـەوە دەهاتنـە تـەك عوسمانیـەکان لـەدژی دار الکفـر نـەك لەدژی میرنشینی ئیسلامی و لـەپێناو زەوت کردنـی زەوی و زارو بەدەسـتهێنانی دەستکەوت و غنائیم ، هەربۆیە سوڵتان مورادی دووەم لە ئەنجامی هەسـتکردنی بـەو حالەتـە نێگەتیڤـە و دواترکـە هەسـتی بـەوەکرد کـە بـاوکی لـە کـاتی

فەرمانڕەواییدا توشی زۆر نارەحەتی بۆتەوە ، بۆیە بڕیاری دا کەوا لەگەڵ دراوسێکانی ڕێك بکەوێت و هەمیشە لە کاروبارەکانی پشتی بە پیاوانی ئاینی دەبەست و بە فتوا کارەکانی خۆی ڕایی دەکرد(١٥).

### تەوەری دووەم :

## پێگەو دەسەلاتی شێخی ئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانیدا

کاتێك عوسمانیەکان تەنها میرنشینێك بوون لە سەر سنووری بیزەنتین ، هەموو کاروبارە کارگێری و یاساییەکان لەدەست زانایانی ئاینی بوو ،دواتریش زۆربەی وەزیرەکانیان لەنێو چینی پیاوانی ئاینیەوە هەڵدەبژارد(١٦)،لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتانە عوسمانیەکان هەمیشە بۆ ئەنجامدانی کاری گرنگ و هەستیار ڕاوێژیان بە شێخی ئیسلامەوە کردووە ، لەبەرئەوەی زۆر بەراشکاوانە بیروراکانی خۆیان دەردەبری (١٧).شێخی ئیسلام لە سەرەتادا زۆر بەسادەیی کاری کردووە ، بەڵام دواتر بووە جێگەی ڕێزو تەقدیر، لەسەدەی ١٦ لەگەڵ دەرکەوتنی شێخەکانی وەکو زنبیللی علی ئەفەندی و ئەبی سعود ئەفەندی گرنگیەکەی زیاتربوو (١٨).

لەدوای سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢–١٥٢٠ز)هەموو دەسەلاتەکانی ئاینی و دادوەری خرانە ژێردەسەلاتی شێخی ئیسلام ، بەڵام ئەم دەسەلاتە لەو قۆناغەدا تەنها دەسەلاتێکی رووکەش بووە ،بەجۆرێك شێخی ئیسلام تەنها بۆی هەبوو فەتوا لەسەر ئەم بابەتانە بدات کەوا لەلایەن دەسەلاتەوە بۆی بەرزدەکرانەوە ، توانای ئەوەی نەبوو فەرمان بە جێبەجێکردنی فەتواکەی بدات ، ئەگەرچی هیچ یەکێك لە دادوەرەکان توانای ئەوەیان نەبوو فەتوای شێخ جێبەجێ نەکەن.

دواتر هەریەك لە سوڵتان مەحەمەدی دووەم و سلیمان قانوونی پێگەو مەرکەزی موفتیان جێگیرکرد لەسەرووی دەستەی کارگێڕی لە دەوڵەت[19].

سوڵتانەکان هەندێك جار بەوچاوە سەیری شێخی ئیسلامیان کردووە کە خاوەنی چاکەو خێرو بەرەکەتن بۆ دەوڵەت ، بۆیە لەمەسەلە زۆربایەخدارەکان راوێژیان پێکردوون[20]، بەڵام لەهەندێك کاتی تر لێیان ترساون بەهۆی ئەو پێگە بەهێزەی کەوا لەناو خەلکیدا هەیانبووە ، بۆیە هەوڵیان داوە بەهەررێگایەك بێت لەخۆیانیان نزیك بکەنەوە ، چونکە شێخەکانی ئیسلام دەیانتوانی خەلك هانبدەن لەدژی دەسەڵات بۆ ئەوەی هەلبگەڕێنەوە ، لە سەدەی ١٦مەوە شێخی ئیسلام بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەستی لە کاروباری دەوڵەتەوە وەرئەدا ، لەزۆربەی ئەو کاتانەی کە دەوڵەتی عوسمانی بە بارودۆخێکی خراپ و ناهەموار تێپەردەبوو شێخی ئیسلام زۆرترین دەستوەردانی لە کاروباری دەوڵەت کردووە [21].

سەبارەت بەهەندێك لە سوڵتانەکان پەیوەندی خزمایەتیان لەگەڵ شێخی ئیسلام دروستکردووە بۆ نمونەش سوڵتان عوسمانی دووەم (١٥١٨-١٦٢٢ز) پەیوەندی خێزانی لەگەڵ شێخ ئەسعەد ئەفەندی * دروستکرد لەرێگای خواستنی کچەکەی شێخ کەناوی خاتون بووە[22]، هەرچەندە شێخی ئیسلام لە سەرووی دەزگای ئاینی بووە بەلاّم ئەندام نەبووە لەناو حکومەتدا ،بەلاّم کاریگەری هەبووە لەسەر حکومەت ، بەجۆرێك دەسەلاّتی هەبووە پێشنیاربکات بۆ سەدری ئەعزەم بەمەبەستی دامەزراندن و لابردن و بەرزکردنەوەی پلەی مامۆستایانی قوتابخانەکان[23].

لەسەدەی ١٦هەمی زاینی دا کاتێك ئەنجومەنی شورا دامەزرێنرا شێخی ئیسلام وەك ئەندامێکی ئەنجومەن بەشداری کۆبونەوەکانی دەکرد لەبریارە چارەنوسازەکانی تایبەت بە دەوڵەت بیروڕای خۆی هەبوو ، جگە لەمەش

پێویست بوو لە مەسەلەی راگەیاندنی شەر بکۆڵێتەوە و بەگوێرەی فقهی ئیسلامی[٢٤].

زۆربەی مێژونوسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە (شمس الدین فناری )** یەکەم شێخی ئیسلام بووە لە دەوڵەتی عوسمانیدا ،وە پۆستی شێخی ئیسلامیش یەکێك بووە لە پۆستە گرنگەکانی دەستەی زانستی لە رژێمی دەوڵەتی عوسمانیدا، لەدوای ١٢٥ ساڵ لە پاش دروستبوونی دەوڵەت ساڵی ١٤٢٥زلەسەردەمی سوڵتان مورادی دووەم شمس الدین فناریان دامەزراندووە وەکو موفتی ، لەگەڵ کۆتایی کارەکانی دوا وەزارەتی عوسمانی ساڵی ١٩٢٢ز شێخ محمد نوری ئەفەندی دوا شێخی ئیسلام بووە لە دەوڵەت ، واتە شێخی ئیسلام لەساڵی ١٤٢٥ز وەکو پێگەیەکی ئاینی بەهێز تاکوو ١٩٢٢ز بەردەوام بووە [٢٥].شێخی ئیسلام فەرمانی دامەزراندنی لەلایەن سوڵتانەوە دەردەچوو ،بە جیاواز لەگەڵ هەموو فەرمانبەرانی تری دەوڵەت[٢٦]،بەشێك لە شێخەکان لە هەندێك حالەتدا لە شەرەکاندا یاوەری سوڵتانی عوسمانیان کردووە هەرچەندە ئەرکی ئەوانیش نەبووە کەوا بچنە مەیدانی شەر وەك شێخ (یحیی ئەفەندی زەکەریا زادە)*** لەساڵی ١٦٣٤ لە هەلمەتێکی سەربازی سوڵتان مورادی چوارەم بۆ سەر پۆلۆنیا بەشداری کردووە[٢٧].

سوڵتانی عوسمانی بەمانا گشتی و تایبەتیەکەی سەرۆکی دەستەی ئیسلامی بوو ، لەهەمانکاتدا شێخی ئیسلام سەرۆکی دەستەی ئاینی بوو ، وە خاوەنی پلەو پێگەی بەرزبوو بەلکو لەرووی گرنگیەوە لەدوای سوڵتان دەهات و یەکێك بووە لە سێ پیاوە گەورەکەی دەوڵەتی عوسمانی ، یاخود سێ کەسایەتیە گرنگەکەی دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری عوسمانی لەدوای سوڵتان و سەدری ئەعزەم، سوڵتانەکانی عوسمانی لە هەندێك کاتدا پێگەی شێخی ئیسلامیان پێش

سەدری ئەعزەم خستووە[28].بە جۆرێك پێگەی شێخی ئیسلام هاوسەنگ بووە لەگەڵ پێگەی سەدری ئەعزەم، بەڵام سەرباری ئەم هەموو پلەو پایە بەرزەی شێخی ئیسلام هەیبووە لەناو دام و دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ، بەڵام شێخی ئیسلام ئەندام نەبووە لە دیوانی هەمایۆن ، بەلکو هەریەك لە قازی عەسکەروقازی و رۆمیلی و ئەنادۆل ئەندام بوینە بە نوێنەرایەتی پیاوانی ئاینی بەشداری کۆبونەوەکانیان کردووە ، زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەمە تەنها وەك رێزلێنانێك بووە بۆ پێگەی شێخی ئیسلام نەوەك لە شوێنێك دابنیشێ کەسێك سەرپەرشتی بکات ، چونکە کۆبونەوەکان بە سەرپەرشتی سەدری ئەعزەم بەرێوە دەچوون [29].

سەرەتای گۆرینی ناوی موفتی بۆ شێخی ئیسلام دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی سولتان سلیمانی قانونی لەکاتێکدا موفتی شێخ ئەبو سعود ئەفەندی** (١٤٩١-١٥٧٤) بەهۆی ئەو رۆلە بەرزەی نواندی لە نزیك کردنەوەی ئەو یاسایانەی لەلایەن سولتان سلێمانەوە دەرچوون لە شەریعەتی ئیسلامی، دواتر بە فەرمی موفتی بووە شێخی ئیسلام، هەروەها سولتانەکان بە هەموو توانایان هەولیانداوە کەوا پشتگیری لە دەسەلاتەکانی شێخی ئیسلام بکەن ، هەمیشە سولتانەکان هەولیان داوە پاریزگاری لەو مەسەلانە بکەن کە دەبنە هۆی کەم کردنەوەی پێگەو مەقامی شێخی ئیسلام، تاوەکو پێگەی شێخی ئیسلام ئەوەندە بەهێزو فراوان بوو گەیشتە ئەو ئاستەی بتوانێت فەتوا دەربکات بۆ لابردنی خودی سولتان لەسەر تەختەکەی[30] .

زۆربەی ئەم سولتانانەی لەسەدەی ١٧هەم دەسەلاتیان وەرگرت لە تەمەن بچووك بوون و زۆربەیان لێهاتوو نەبوون بۆ بەرێوەبردنی وولات ، زیاتر لەمەش دوای فەرمانرەوایی سولتان مەحەمەد پادشا (١٥٦٥-١٥٧٩ز) هیچ سەدری

ئـەعزەمێکی بـەهێز نـەهاتووە جگـە لـە کـوبریلی محمـد پاشـا* نـەبێت ، بۆیـە هەمیشە سوڵتانەکان بەمەبەستی بەڕێوەبردنی وڵات راوێژیان بە شێخی ئیسلام کردووە ، زۆر کاتیش سوڵتان خۆشەویستی خۆی بۆ شـێخی ئیـسلام دەردەبـڕی لـەڕێگای نـاردنی دیـاری جـۆراو جـۆر بـۆی، بـەجۆرێك سـوڵتان هەنـدێك جـار لـە جەژنەکاندا زێڕو فەروشی پێشکەش دەکرد ، لەمانگی رەمەزانیش چەپکێك گوڵی بۆ دەنارد(٣١).

شـێخی ئیـسـلام رۆڵێکـی کاریگـەرو ئـەکتیڤی هـەبووە لـەناو دەوڵەتـدا ، بـە جۆرێك جگە لـە دامەزرانـدنی پیـاوانی ئـاینی لـە هـەمان کاتـدا کاریگـەری هـەبوو لەسـەر لایـەنی سیاسـی و کاروبـاری فـەرمانڕەوایی و کارگێڕیـدا(٣٢) ،بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لـە یاسـاکەی سـوڵتان محمـد فـاتح دا هـاتبوو کـە شـێخی ئیـسلام سەرۆکی زانایان و مامۆستای سوڵتانە ، پلەی لە وەزیرەکـان بـەرزترە ، ئەمـەش بەلگەیەکی ترمان دەخاتە دەست لەرووی تێڕوانینی دەسەلات بۆ پێگـەی شـێخی ئیسلام(٣٣) .

لەلایەکی دیکەوە سوڵتانەکانی عوسمانی زۆر بە پەرۆشەوە هـەوڵیان دەدا بـۆ جێگیرکردنـی دەسـەلاتەکانی شـێخی ئیـسلام و پـشتگیری کردنـی، لەبەرئـەوەی هەمیـشە لـە کاتـە زۆر ئالۆزوشـپرزەکاندا ئەگـەر بـارودۆخی وڵات لـە رووی سیاسیەوە خراپ بوایە ئەوە پەنایان بۆ دەبرد (٣٤).

**تەوەری سێیەم :**

## ئەرك و بەرپرسیاریەتی شێخی ئیسلام

شێخی ئیسلام لە سەرەتادا تەنها یەك ئەركی هەبووە ئەویش بریتی بوو لە دەركردنی فەتوا، ئەو فەتوایانەش بریتی بوو لە شیكردنەوەی مافی گشتی و تایبەتیەكان، ئەوبابەتانەی كە گشتی بوون لەلایەن حكومەت و دەسەلاتەوە بۆی بەرزدەكرانەوە، وەكو كاروبارەكانی پەیوەست بەڕێوەبردن و شتی تری وەكو رێكەوتنامەی ئاشتی و بریارەكانی سزای لەسێدارەدان و یاخود رووداوەكانی ئاژاوەگێری و هەڵگەرانەوەی دژی دەسەلات لەلایەن چینێكەوە كە لە ژێردەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیەوە دروست دەبوون [٣٥].

سەبارەت بەفەتوا تایبەتیەكانیش كەلەلایەن هەندێك خەڵك داوادەكرا ،دەیانویست تێروانینی ئاین بزانن لە مەسەلەیەك لە مەسەلەكاندا ، لەبەرامبەریشدا كاتێك كەسە داخوازیكەرەكە فەتواكەی وەردەگرت هەندێك پارەی دەبەخشی [٣٦]،بەشێوەیەكی گشتی شێخی ئیسلام لە بوارەكانی شەرعی ویاسایی و كۆمەلایەتی وسیاسی ئەو فەتوایانەی شرۆڤەدەكردن بە پشت بەستن بە قورئان و فەرمودەكان [٣٧].

زۆرێك لەو نوسراوە شەرعیانەی كە شێخەكانی ئیسلام بە جێیان هێشتن لەبواری تەفسیرو فقهی وعیبادەت بوونە ، بەلام گرنگترین دەستكەوتەكانی شێخی ئیسلام لەبواری شەرعی و یاسایی بریتی بوو لە گۆڤاری ئەحكامی عەدلی*، ئەم گۆڤارە بە ئینسكلۆپیدیایەكی یاسایی گرنگی ئیسلامی دادەنرێت كەپشتی بە فقهی حەنەفی بەستوە [٣٨].

لەوبارەیەوە ئەو سەرچاوانەی كەدواتر دادگاكانی عوسمانی پشتیان پێدەبەست هەر ئەم بەرهەمانەبوون كە لە ئەنجامی كۆكردنەوەی فەتوای

شێخەکانی ئیسلام رێکخرابوون و لەبەرگی چەند کتێبێك چاپکرابوون کە بریتی بوون لە کتێبەکانی فقهی کەزۆربەیان لە قوتابخانەکانیش دەخوێنران، لەسەرووی ئەم کتێبانەش کە لەسەردەمی سولتان مەحەمەدی فاتح هەبوونە بریتی بوون لە (الهدایة)و(کنز الدقائق)و(دور الحکام في شرح عزر الأحکام)و (ملتقی ألابحر )[٣٩].

دوابەدوای ئەوەی سوڵتان بایەزیدی دووەم (١٤٨١-١٥١٢ز) لەساڵی ١٥٠٥ز قوتابخانەیەکی لەستەمبۆل دامەزراند ، شێخی ئیسلامی راسپارد کەوا پێویستە ببێتە مامۆستا ولە قوتابخانەکەیدا وانەبلێتەوە ، لەبەرئەوەی پێیوابوو کە قوتابخانەکەی ئەو لەسەرووی هەموو قوتابخانەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دێت ، بۆیە پێویستە مامۆستای ئاست بەرز تیایدا وانە بلێنەوە ، بەم جۆرەش سوڵتان ئەرکێکی تری زیادکرد بۆ شێخی ئیسلام، هەرکاتێکیش ئەگەر قوتابخانەیەکی تازە لە پایتەخت بکرابایەوە پێویست بوو کەوا شێخی ئیسلام لەمەراسیمی کردنەوەی قوتابخانەکە ئامادەبێت کۆریشی بۆ مامۆستایانی قوتابخانەکە سازبکردبایە بە مەبەستی ئاشناکردنیان بە رێنمایی و ئامۆژگاریەکانی خۆی، دواتر ئەرکی بەرێوەبردنی قوتابخانەکەی دەخستە سەر شانی ئەم مامۆستایانەی کەوا لەلایەن میری دامەزرێنرابوون[٤٠].

کاتێك سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠ز) هاتە سەردەسەڵات ئەمیش ئەرکێکی تری بۆ شێخی ئیسلام زیادکرد کە ئەرکی قازی عەسکەربوو ، لەو کاتیدا کە شێخ زنبلی علی جمالی * شێخی ئیسلام بوو ، بەلام شێخ زنبلی ئەم ئەرکەی رەتکردەوە بەو بیانووەی کەناتوانێ حوکمی قەزائی دەربکات ، بەهەمان شێوە کاتێك سوڵتان سولەیمان قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦ز) هاتە سەرتەخت دەسەلاتی زیاتری دایە شێخی ئیسلام بە جۆرێك دامەزراندن و لابردنی پیاوانی ئاینی خستە ژێردەستی شێخی ئیسلام کە لەو کاتەدا ئەبو سعود بوو ،

بەڵام ئەمیش ئەم بەرپرسیارەتیەی قبوڵ نەکرد لەبەرئەوەی نەوەك نەتوانێ دادپەروەری بکات لە کارەکەیدا ، بەڵام لەماوەکانی دواتردا ئەم ئەرکە بووە ئەرکی سێیەمی شێخی ئیسلام [41].

شیاوی باسکردنە خودی شێخی ئیسلام پالێوراوەکانی بۆ پۆستە ئاینیەکان کاندید دەکرد و بەشێوەی پێشنیار بەرزی دەکردەوە بۆ سەدری ئەعزەم ئەمیش رەزامەندی لەسەر پێشان ئەدا بێئەوەی دەست لەکاروبارو دەسەلاتەکانی شێخی ئیسلام وەربدات ، وەهیچ جارێکیش وارێك نەکەوتوە ئەم جۆرە پێشنیارانەی شێخی ئیسلام لەلای سەدری ئەعزەم رەتبکرێتەوە.دواتریش دامەزراندنی شێخەکانی هەردوو تەریقەتی مەولەوی و بەکتاشی خرانە ئەستۆی شێخی ئیسلام[42].

لەلایەکی دیکەوە لە سەردەمی سوڵتان عوسمانی دووەم (١٦١٨-١٦٢٢ز) سەرجەم دەزگاکانی ئاینی و دادوەری کەوتبونە ژێردەسەلاتی موفتی ئەستەمبۆل بەناوی ئەوەی شێخی ئیسلامە[43]. موفتی بۆیە پێدەگوترا شێخی ئیسلام بەهۆی ئەو رۆلە سەرکەوتوەی لە نزیکردنەوەی ئەو یاسایانەی کەلەلایەن سوڵتانەوە دەردەچوو گێرای کە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی دەیگونجاندن ، دواتریش موفتی بە فەرمی کرایە شێخی ئیسلام[44]، زۆربەی کاتیش سوڵتانەکان بۆ بەرێوەبردنی دادگایەکی عادیلانە بۆ مەسەلەیەکی تایبەت و دیاریکراوی گرنگ ئەرکی سەرپەرشتی کردنی دادگایان بە شێخی ئیسلام رادەسپارد تاوەکو دادوەری تێدا پیادە بکات[45].

لەساڵی ١٨٦٩ ز لێژنەیەکی تایبەت لەلایەن دەزگای شێخی ئیسلام بە سەرۆکایەتی جەودەت پاشا پێکهات لەچوارچێوەی پرۆسەی چاکسازیەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیز بۆ دانانی یەکەم یاسای

شـــارستانی عوسمـانی کـە پـشت ببەسـتێ بـە شـەریعەتی ئیـسلامی ، ئـەوەبوو لێژنەکە توانی ئەم یاسایە دەربکات ، دواتریش چەندان ئەحکام و یاسـای  تریـان دەرکرد لە بواری باج و کاروباری سیاسیدا[٤٦].

شـــیاوی باســـکردنە شـــێخی ئیـــسلام لەبۆنـــە تایبەتیـــەکانی ســـولّتان و پیاوەگـــەورەکانی دەولّـــەت کـــاری ئیمامـــەتی کـــردووە ، هەرچـــەندە بـــە مانـــا تایبەتیەکـەی خـۆی وەك ئیمـام کـاری ئیمامـەتی نـەکردووە ، بـەلاّم تـەنها لـەم بۆنانەی وەکو مارەبرینی شازادەکانی کۆشك و هەروەها لەوکاتانەی کە سولّتانێك کۆچی دوایی بکردبوایە ئەوا بەشداری لە رێورەسمی بە خـاك سـپاردنی دەکـرد و نوێژی مردووی لەسەر دەکـرد، لـە رێـورەسمی دانـانی سـولّتانی نـوێ  بەشـداری دەکرد، بۆ گـەورە پیـاوانی دەولّـەتیش بەهـەمان شـێوە بەشـداری لـەم بۆنانـەدا دەکرد[٤٧].

شێخی ئیسلام خزمەتێکی زۆری بەدەولّەتی عوسمانی کرد بە شێوەیەك توانی بنـەما سـەرەکیەکانی دەولّـەتی لەسـەر بناغەیـەکی پتـەو دەسـتەبەربکات و هاوکاربێت لە ئامانج و ویست و ئـارەزووی سـولّتانەکانی عوسمـانی لـە پرۆسـەی بەدەولّـەت بوونیانـدا ، بـەجۆرێك ئـاین وەك میکانیزمێـك بـۆ سـەقامگیرکردنی ئاسـایش و بـەرێوەبردنی ولاّت لـەناوخۆ و لـەدەرەوە بەشـێوەیەکی ئـەکتیف و تەندروست بەکاربهێنن، لە رێگای پیادەکردنی شـەریعەتی ئیـسلامی[٤٨]، زۆرکـات شێخی ئیسلام بە نوێنەری شەرعی سولّتان هەژماردەکرێ ، لەبەرئەوەی دەبـووە راوێژکاری سولّتان و راوێژکاری پێدەکرد، بەلاّم لەلایەنی ئیداری سـەرۆکی چـینی زانـــستی بـــووە کـــە سەرپەرشـــتی لایـــەنی ئیـــداری و شـــەرعی و دادوەری و پەروەردەیی دەکرد[٤٩].

زۆرێك لە مێژوونوسان پێیان وایە کە عوسمانیەکان خزمەتێکی گەورەی ئاینی ئیسلامیان کردووە لەدوای هاوەڵانی پێغەمبەرو (د.خ )و ئیمام و گەورە پیاوانی دەوڵەتانی ئیسلامی.بە جۆرێك دەڵێن دەوڵەتی عوسمانی تەنها دەوڵەتی ئیسلامیە کە یاسا شەرعیەکانی بەبێ کەم و کورتی پەیرەو کردووە لە کاتێکدا ئەم دەوڵەتە پێکهاتبوو لە دەیان نەتەوەی جیاواز جیاواز لەیەکتری(٥٠).

## دەرەنجـــام

ئەم توێژینەوەیە لە چەند قۆناغێکی مێژوویی دا باس لە رۆڵ و پێگەو ئەرك و بەرپرسیاریەتی شێخی ئیسلام دەکات لە دەوڵەتی عوسمانیدا ، منیش لەئەنجامی تێرامانم بۆ بابەتەکە گەیشتمە چەند دەرەنجامێك کە لەم چەند خاڵەی خوارەوە دەیان خەمە روو:

١- سولّتانەکانی عوسمانی بۆ بەردەوامی دان بە سیاسەتی فراوانخوازی و لەرێگای چەسپاندنی ئایدۆلۆژیای جیهاد و غەزاکردن ، پێویستی زۆریان بە دروستکردنی دەزگایەکی ئاینی هەبووە بۆ پەرەدان بەو سیاسەتەیان کە فاکتەری سەرەکی سەرکەوتن و جێگیربوونی دەسەلاَت بووە.

٢- بەکارهێنانی پیاوانی ئاینی بۆ سەرکوتکردنی هەموو هەڵگەرانەوە و جولانەوەیەکی یاخیبوون لە ناوخۆی دەربارو لە دەرەوەی لە رێگای دەرکردنی تەنها فەتوایەك، کە کاریگەری تەواوی بەسەر دانیشتوانانی عوسمانی هەبوو.

٣- لە پێناو بەدەستهێنانی خەلافەت ، دەوڵەت ناکرێ بانگەواز بۆ خەلافەت بکات بەبێ بوونی بنەما سەرەکیەکان بۆ ئەم مەبەستە ، کە خۆی لەسیستەمێکی بەڕێوەبردن و سیاسی و کۆمەلایەتی ئیسلامی دەدۆزێتەوە.

٤= شێخی ئیسلام جگە لەوەی میکانیزمێك بووە بۆ پیادەکردنی سیاسەتی سەرکوتکاری عوسمانی لە بەرامبەر بانگەوازخوازەکانی ئازادی و سەربەخۆیی ، لە میللەتانی غەیرە تورك ، لەهەمان کاتدا میکانیزمێك بووە بۆ لەناوبردنی رکابەرانی سوڵتانیش لەسەر دەسەڵات لەرێگای دەرکردنی فەتوای حەلال کردنی کوشتن و لەسێدارەدانیان.

٥- شێخی ئیسلام بۆ دەولەتی عوسمانی بنەما سەرەکیەکانی دەولەتی دامەزراند لەرێگای دەرکردنی چەندان فەتوا بە پشت بەستن بە شەریعەتی ئیسلامی کە دواتر بوونە یاسا و لە بوارە جیا جیاکان کاریان لەسەر کرا.

٦- بوارەکانی پەروەردە و دادوەری و ئەوپەری گەشەسەندنی بە خۆیەوە بینیوە لەسەردەستی پیاوانی ئاینی بە تایبەتیش شێخەکانی ئیسلام ، کە ئەمەشیان بووە هۆی گواستنەوەی قۆناغێکی هەستیار لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی.

٧- سەرەرای ئەو خالانەی سەرەوەش دەزگای ئاینی لەدەوڵەتی عوسمانی بەیەکێك لەهۆکارەکانی لاواز بوون و روخانی دەوڵەتی عوسمانی دادەنرێت ،چونکە لەناوەراستی سەدەی ١٨ بەتایبەت لەسەردەمی چاکسازیەکان بوونە لەمپەر لەبەردەم پێشکەوتنەکان بەتایبەت وەرگرتنی هەر زانیاری و پێشکەوتنی رۆژئاوای بەکوفر لەقەلەم دەدرا.

# لیستی سەرچاوەکان

سەرچاوە عەرەبیەکان :

١- أحمد صدقي علي شقيرات ، تأريخ موسسة شيوخ الأسلام في العهد العثماني ١٤٢٥-١٩٢٢م، ،ط ١ ،أربد ،ألاردن ، مج٢٠٠٢،١.

٢- أكرم كيدو ، مؤسسة شيخ الاسلام في الدولة العثمانية ، ت هاشم الأيوبي ، منشورات جروس برس ،طرابلس ، ط ١ ،لبنان، ١٩٩٢.

٣- اكمل الدين أحسان أوغلي ، ألدولة العثمانية تأريخ و حضارة. نقله ألى العربية صالح سعداوى ، منظمةألمؤتمر ألاسلامي، مركز ألابحاث للتأريخ والفنون والثقافة ألاسلامية ، ، مكتبة الشروق ،القاهرة ،مج ١، ٢٠١٠.

٤ - اكمال الدين احسان اوغلى ، الدولة العثمانية تاريخ و حضارة ، ت : صالح سعداوى ،ط ٢،مكتبة الشروق الدولية ،القاهرة ، مج ٢٠١٠،٢.

٥- أبي الفلاح عبدالحي بن العماد الحنبلي ، شدرات الدهب في أخبار من دهب ، دار الكتب العلمية ، بيروت ، لبنان ،ج٨.د.س.

٦- حسن ضيقة : الدولة العثمانية الثقافة المجتمع و السلطة ،دار المنتخب العربي،ط ١،بيروت ،لبنان ،١٩٩٧.

٧- خليل اينالجيك ، تاريخ الدولة العثمانية من النشوء الى الانحدار، ت محمد.م.الأرناؤوط ،دارالمدى الاسلامي،ط ١،بيروت ، لبنان،٢٠٠٢.

٨- محمود السيد ، تأريخ الدولة العثمانية و حضارتها ، مؤسسة باب الجامعة ، ٢٠٠٠.

٩- محمد فؤاد كوپريلى ، قيام الدولة العثمانية ،ت أحمد السعيد سليمان ،تقديم أحمدعزت عبدالكريم،المؤسسة المصرية العامة للتأليف والنشر ،دار الكاتب العربي للطباعة والنشر ،ج. م. ع،١٩٦٧.

١٠- شكيب أرسلان ، تاريخ الدولة العثمانية ،دار التربية ،دمشق ، ٢٠٠١.

١١- زين العابدين شمس الدين نجم ، تأريخ الدولة العثمانية ،دار المسيرة للنشر و التوزيع ،ط ١،عمان،الاردن ، ٢٠١٠.

١٢- وديع أبو زيدون ، تأريخ ألامبراطورية العثمانية من التأسيس الى ألسقوط. عمان، ألاردن ،٢٠٠٣.

١٣- صلاح أحمد هريدي ، دراسات في تاريخ العرب الحديث ، عين للدراسات والبحوث الانسانية و الاجتماعية ، الهرم ،ج. م. ع ،٢٠٠٨.

١٤- يلماز أوزتونا ، تأريخ الدولة ألعثمانية ، ت عدنان محمودسلمان، م. محمود ألانـصاري ، ،طبـع في شركة الهلال المساهمة للطباعة والنشروالسياحةوالصحافةوالدعاية ، ، مج ٢، أسطنبول ،تركيا،١٩٩٠.
١٥- يلماز أوزتونا، تأريخ ألدولة ألعثمانية، مج١٩٩٠،١.

[1] - يلماز أوزتونا، تـأريخ الدولـة ألعثمانيـة، ت : عـدنان محمودسـلمان،م محمـود ألانـصاري،،طبع في شركة الهلال المساهمة للطباعة والنشروالسياحةوالصحافةوالدعاية، أسطنبول،١٩٩٠، مج ٢،ص٤٦٣ ؛ زيـــن العلبـــدين شمـــس الـــدين نجـــم، تـــأريخ الدولـــة العثمانيـــة،دار المـــسيرة للنـــشر و التوزيع،عمان،٢٠٠٩،ص٢٢.

[2] - أحمـد صـدقي علـي شـقيرات، تـأريخ موسـسة شـيوخ الآسـلام في العهـد العثمـاني ١٤٢٥-١٩٢٢،ط١،أربد ،٢٠٠٢، مج١،ص٨٣.

٣- خليل اينالجيك، تاريخ الدولة العثمانية من النشوء الى الانحـدار، ت :محمـد.م.الأرناؤوط،دارالمـدى الاسلامي،ط١،بيروت،٢٠٠٢،ص٢٨٦.

٤- أكمل الدين أحسان أوغلى، ألدولة العثمانية تأريخ و حضارة،ت: صالح سـعداوى ،مكتبـة الـشروق الدولية، القاهرة، ٢٠١١،مج ٢،ص ١٦٩.

[*] - الفتوة : به ماناى ئازايەتی و سوارچاكی دێت، بۆ زیاتر زانیاری لە سەر ئـەم زارەوەیـە بگـەڕێوە بۆ: أحمد صدقى على شقيرات، م.س، ص ٨٤.

٥- يلماز أوزتونا، تأريخ ألدولة ألعثمانية، مج١،ص٨٨.

٦- محمد فؤاد كوبريلى، قيام الدولة العثمانية،ت :أحمد السعيد سليمان، دار الكاتب العربـي للطباعـة والنشر، ج. م. ع،١٩٦٧،ص١٣٦.

٧- أحمد صدقي علي شقيرات، م.س، ص ٨٩.

[*] شێخ ئەدەبالی (١٢٠٩-١٣٢٦ز)،لە گەورە زانایانی دەوڵەتی عوسمانی بووە،لە سـەردەمی سـوڵتان عوسمانی یەكەم، لە میرنشینی (قرمان)لەدایك بووە،و خوێندنی لەوێ تەواوكردووە،دواتلر چۆتە شام و تەفسیروحەدیس و ئوسول ی خوێندووە لەسەر دەستی شێخەكانی شام، دواتر گەراوەتەوە وچۆتە خزمـەتی سـوڵتان عوسمـان و لـەلای ئـەو خزمـەتی كردووە،دەسـەتدارو فـەرمانڕەوانكان بـۆی دەگەڕانەوە لەكاروباری شەرعی، بە پێشەنگی زانایانی ئاینی دادەنرێت لـە دەوڵـەتی عوسمـانی.بـۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: أحمد صدقى على شقيرات، م.س، ص ٨٥ ؛ محمد فؤاد كـوپريلى، م.س، ص ص ١٣-٢٣.

[**] تۆرسۆن، فەقێ و زانایەكی ئایینی بووە، لەدوای شێخ ئەدەبالی هاتووە بۆ راپەڕاندنی كاروباری شەرعی، یەكێك بووە لەو زانایانی كەوا لەسەردەمی سوڵتان عوسمانی یەكەم و سوڵتان ئۆرخان

کاری کردووە. أکرم کیدو، مؤسسة شیخ الاسلام في الدولة العثمانیة، ت :هاشم الأیوبي، منشورات جروس برس،طرابلس، ١٩٩٢، ص ٢٧.

٨ - أحمد صدقی علی شقیرات،م.س، ص ٨٦؛ أکرم کیدو، م.س، ص ٢٦.

٩- أکرم کیدو، م.ن، ص ٣٢.

١٠- أکمل الدین أحسان أوغلی، ألدولة العثمانیة تأریخ و حضارة،ت: صالح سعداوی ،مکتبة الشروق الدولیة، القاهرة، ٢٠١٠،مج١، ١٦٧.

* شێخ بدرالدین : (١٣٥٨ – ١٤٢٠) محمود کوری ئیسرائیل کوری عەبدولعەزیز ناوزەندکراوە بە (بدرالدین)و ناسراوە بە کوری قازی سماونە(سماوەند)، لە قەلای سماوەند لەدایك بووە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەنجقی کۆتاهیە، باوکی قازی بووە، چۆتە قۆنیە بۆ خوێندن، دواتر چۆتە قودس و قاهیرە، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: م. ن، ص ١٩٠.

١١- خلیل أینالجیك، م، س، ص ص ٤٨٤-٤٨٦.

١٢- أحمد شقیرات، م،س، ص ص٩١-٩٢.

١٣- خلیل أینالجیك ، م س،ص ١٠٣.

١٤- أکرم کیدو، م،س، ص٣٤.

* بایەزیدی یەکەم (١٣٨٩-١٤٠٢)، کوری سولتان موورادی یەکەم بووە، دوای کوژرانی باوکی لە شەری قوصوە لە سالی ١٣٨٩ ز هاتە سەر تەختی دەسەلات، نازناوی (یلدرم) واتە هەورە تریشقەی لێنراوە،دایکی ئافرەتێکی بەرەگەز یۆنانی بووە و بۆتە موسلمان،لەساڵی ١٤٠٢ ز لە شەری ئەنقەرە لەبەرامبەر تەیمورلەنگ شکست دەهێنی و کۆتایی بە دەسەلاتی دێت. زین العابدین شمس الدین نجم، م. س،ص٥٩.

** موورادی دووەم (١٤٢١-١٤٥١ن)، لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا دەسەلاتی وەرگرت لە دەولەتی عوسمانی،زۆر حەزی بە جیهادوغەزاکردن بووە لە پێناوی خوا،لەناو کۆمەڵ بەناوبانگ بووە بە خواپەرستی ودادپەروەری ودل نەرمی، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ : م.ن،ص ٨٠.

***) بۆ زیاتر زانیاری لەسەر شەری ئەنقەرە بگەڕێوە بۆ : شکیب أرسلان، تاریخ الدولة العثمانیة،دار التربیة،دمشق، ٢٠٠١،ص٦٦.

١٥- یلماز ئوزتونا، م.س، مج ١، ص ١١٠ ؛ أحمد شقیرات، م.س، ص ٩٤.

١٦- خلیل أینالجیك ، م.س،ص ١٠٣.

١٧- م.ن، ص ١٤٩.

١٨- الكمل الدين احسان اوغلي، م. س، مج ١،ص ٣٠٢.

١٩- كارل بروكلمان : تأريخ الشعوب الاسلامية،ت: نبيه أمين فارس و منير البعلبكي،دار العلم للملايين،مطبعة كارا،بيروت،١٩٤٨،ص٤٧٩؛ وديع أبو زيدون، تأريخ ألامبراطورية العثمانية من التأسيس الى ألسقوط،ط١،عمان، ٢٠٠٣،ص١٢٦.

٢٠- أكرم كيدو، م س، ص ١٠٥.

٢١-خليل أينالجيك، م.س، ص ١٥٩.؛ أحمد شقيرات، م. س، ص ١٧٤.

* شيخ أسعد أفندى (١٥٧٠-١٦٢٥ز)، ناوی (محمد ئەسعەد) كوری سعد الدين كوری حسن جان (حسنجان) كوری محمد جمال الدين حافزی تەوریزیە، باوكیشی شێخی ویسلام بووە بەرلەخۆی، براكەشی بەهەمان شێوە، وە یەكێكە لە ئەندامانی بنەماڵەی "خواجە زادە" كە شێخی ئیسلامی سێیەم بووە لەو بنەماڵەیە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ : أحمد شقيرات، م.س، ص ٤٦٢.

٢٢- أكرم كيدو، م. س، ص ١٠٨.

٢٣- خليل أينالجيك، م س، ص ١٥٥؛حسن ضيقة : الدولة العثمانية الثقافة المجتمع و السلطة،ط١، دار المنتخب العربي،بيروت،١٩٩٧،ص ص ١٠٨-١٢٣.

٢٤- أكرم كيدو، م.س، ص ١٠٨.

** شمس الدين الفناری (١٣٥١ -١٤٣١ ز) ، یەكەم شێخی ئیسلام بووە لە دەوڵەتی عوسمانی و شیخایەتی لەگەل ئەوەوە سەری هەڵداوە. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: أحمد شقيرات، م.س، ص ٣٠١ ؛ شكيب أرسلان،م. س،ص٦٧.

٢٥- اكمال الدين احسان اوغلي، م.س،مج١، ص ٣٠٢.

٢٦- حسن ضيقة، م. س ، ص ١١٦؛أحمد شقيرات، م. س، ص ١٤٨.

*** يحيى ئەفەندی زەكەریا زادە (١٥٥٣-١٦٤٤)، كوری بیرم ئەنقەراوی قوستەنتینی رۆمی یە، كوری زەكەریا ئەفەندی كە شێخی ئیسلام بووە باوكی،لە ئەستەمبۆل لە دایك بووە لە كانوونی دووەمی ١٥٥٣زو هەر لوێش گەورەبووە،لە قوتابخانەكانی ئەستەمبول خوێندویەتی. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم شێخە بگەڕێوە بۆ :أحمد شقيرات، م س، ص ٤٦٨.

٢٧- أكـرم كيدو، م.س، ص ١١٢.

٢٨- اكمل الدين احسان اوغلي، م. س، مج ١،ص ٣٠٣.

٢٩- يلماز أوزتونا، م. س، ج ٢، ص ص ٢٧٣-٤٧٤؛ زين العابدين شمس الدين نجم، م.س،ص٢٢١.

** شێخ ئەبو سعود ئەفەندی (١٤٩١-١٥٧٤)، لەساڵی ١٥٤٥ كراوەتە شێخی ئیسلام تاكو ئەو كاتەی كۆچی دوایی كرد لە ١٥٧٤، لە سەردەمی سولتان سلیمانی یەكەم (١٥٢٠-١٥٦٦ز)وسولتان سەلیمی دووەم كاری كردووە،بە بەناوبانگترین شێخەكانی ئیسلامی سەردەمی فەرمانرەوایی دەوڵەتی عوسمانی دادەنرێت، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ :أبي الفلاح عبدالحي بن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب،ج٨، دار الكتب العلمية، بيروت،، ص ص ٣٩٨-٤٠٠؛ أكرم كيدو، م. س، ص ص ٧٨-١٠٤.

٣٠- أكرم كيدو، م. س، ص٢٢٢.

* كۆبریلی محمد پاشا : (١٦٥٦ - ١٦٦١ ز)، بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ :خليل أينالجيك، م. س، ص ١٥٦،١٥٩،١٦٣،٢٧٩.

٣١- أكرم كيدو، م. س، ص ١٠٦.

٣٢ -م. ن، ص ١٠٤.

٣٣- حسن ضيقة، م. س، ص ١٢١.

٣٤- كارل بروكلمان، م. س، ص ٤٧٩.

٣٥ -أحمد شقيرات، م.س، ص ١٨٥.

٣٦- أكرم كيدو، م.س، ص ٨٩.

٣٧- أحمد شقيرات، م.س،ص ١٢١.

* گۆڤاری ئەحكامی عەدلی، لەسەردەستی جەودەت پاشا دروست بوو، ئەم گۆڤارە ببوە مەرجەعێك بۆ دادگاكانی دەوڵەتی عوسمانی، تاكو ساڵی ١٩٢٦ ز بەردەوام چاپكراوە، لەناوەڕۆكەكەیدا باسی لەیاسا شارستانیەكان كردبوو، بەجۆرێك هەموو بوارەكانی ژیانی مرۆڤی گرتبۆوە تەنها باسی مافی ئاژەڵانیشی تێداكرابوو. يلماز أوزتونا، م.س، ص ٤٦٠.

٣٨- م.ن، ص٤٦١.

٣٩- أكمال ألدين أحسان أوغلي، م.س، مج ١،ص٤٩٠ ؛ محمود السيد، تأريخ الدولة العثمانية و حضارتها، مؤسسة باب الجامعة، د.م، ٢٠٠٠،ص ١٧٨.

٤٠- أكرم كيدو، م. س، ص ص ٩٨-٩٩؛ أحمد شقيرات، م. س، ص ١٨٥.

* شێخ زنبلی علی جمالی (... - ١٥٢٥)، ماوەی ٢٢ ساڵ شێخی ئیسلام بووە لە ماوەی نێوان (١٥٠٢ تاكوو ١٥٢٥ز) لەسەردەمی سێ سولتان كاری كردووە بایەزیدی دووەم و سەلیمی یەكەم و سلیمانی یەكەم (قانونی)، ناوی علی (علائەدین) كوری ئەحمەد كوری مەحەمەد جەمالی یە،

دەگەڕێتەوە لە بنەچەدا بۆ مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی، ناوزەندکراوە بە موفتی ئەماسی بەهۆی ئەوەی وەکو موفتی لە ئەماسیاAmasya کاری کردووە،کە شارێکە دەکەوێتە باکوری ئەنادۆل.بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ : أحمد شقیرات، م. س، ص ٣٤٥.

٤١_ حسن ضيقة، م. س، ص ١٢٣.

٤٢ – حسن ضيقة، م. س، ص ص ١٠٨ – ١٢٣ ؛ أكرم كيدو، م.س،ص ٧٩

٤٣– صلاح أحمد هريدي، دراسات في تاريخ العرب الحديث، عين للدراسات والبحوث الانسانية و الاجتماعية،،ج. م. ع،٢٠٠٨،ص ١٠٢؛كارل بروكلمان، م. س، ص ٤٣٧.، وديع أبو زيدون، م. س، ص ١٢٦.

٤٤– زين العابدين، م. س، ص ٢٢١.

٤٥– أكرم كيدو، م. س، ص ١٠٠.

٤٦– يلماز أوزتونا، م. س، ص ٤٦٥ ؛ أحمد شقيرات، م. س، ص ١٢٢.

٤٧– أكرم كيدو، م. س، ص ١٠٢.

٤٨– حسن ضيقة، م. س، ص ١١٩.

٤٩– م. ن، ص ١٤٦.

٥٠ – أحمد شقيرات، م. س، ص ٨٦.

# وەرزەکانی شارستانیەت لای شپنگلەر

سامان احمد عبدالله

قوتابی ماستەر - کۆلێژی پەروەردەی بنیات

## پێشەکی

کاروانی ئەکادیمیای کوردی خاڵیبوونی بابەتگەلی فەلسەفەی مێژووی پێوە دەبینرێت، کە یەکێکیش لەو بابەتانە وەرزەکانی شارستانیەتە لای شپنگلەر، توێژینەوەی بابەتی فەلسەفەی مێژوو لەدیدی فەیلەسوفی ئەڵمانی (ئۆسوالد شپنگلەر) جێگای گرینگی پێدانەو زۆر بەخۆیەوە هەڵدەگرێت، چونکە بۆچوونەکانی بە شێوەیەکی جیاواز لە فەیلەسوفانی تردەربڕیوە، وە بیرۆکەی نوێی هێنایە بوون، کە بەر لەخۆی بەم شێوەیە نەبوو، بۆیە سەرنجی زۆر لە لێکۆڵەران و بیرمەندانی بەرەو بۆچوونەکانی ڕاکێشا، تەنانەت هاندەرێك بوو بۆ هەڵبژاردنی ئەم توێژینەوەیە، چونکە تێڕوانینەکانی بەشێوەیەکە کە شارستانیەتی کردووە بەپێکهاتەیەکی زیندووی وەك مرۆڤ و ئاژەڵ وە زیندەوەرانی دیکە، وە هەروەها شارستانیەکانی بە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ چوواندووە، وەك چۆن مرۆڤ بە لەدایك بوون و گەنجێتی و پێگەیشتن و مردندا دەڕوات ئاواش شارستانیەتەکان دەبێت بەم قۆناغانە گوزەر بکەن.

بۆچوونێکی دیکەی لەمەڕ شارستانیەتەکان کە جێگای بایەخی زیاترە، ئەوەیە کە شارستانیەتی چوواندووە بە وەرزەکانی ساڵ، واتە چۆن ساڵ بە وەرزی بەهار و هاوین و پایز و زستان گوزەر دەکات، کە وەرزی بەهار وەرزی

بوژانەوەی سرووشتە، بۆ شارستانیەتەکانیش بەم شێوەیە چونکە سەرەتای لەدایکبوونی هەر شارستانیەتێکی بە وەرزی بەهار چوواندووە، پاشان وەرزی هاوین کە پێگەیشتنی بەروبوومە لە سرووشتدا، بۆ شارستانیەکانیش بەهەمان شێوە گەشەکردن و پێگەیشتنی شارستانیەتەکانی بە وەرزی هاوین داناوە، پاشان وەرزی وەرینی گەڵاکان و زەردبوونی ڕوخساری سرووشت کە پایزە، بە سەرەتای لێکترازان و کێشەی شارستانیەتەکان داناوە، پاشان وەرزی کۆتایی دێت ئەویش زستانی ساڵە، کە وەرزی هاتنی سەرما و سۆڵ و داباریینە، بۆیە ئەم وەرزەی کردۆتە سەرەتای قۆناغێك کەبەرەو پیریەتی هەنگاو دەنێت، ئەو پڕشەنگ و ڕوناکییەی شارستانیەت هەیەتی دەکوژێتەوە، واتە شارستانیەت لە زستاندا، زیندوێتی خۆی لەدەست دەدات و توشی سستی و بێهێزی دەبێت و توانای نامێنێت.

ئەم توێژینەوەیە لە پێشەکی و دوو بەش و دەرئەنجام پێکهاتووە، کە هەر بەشێك بۆ چەند تەوەر و خاڵێك دابەش بووە.

بەشی یەکەمی توێژینەوەکە باس لە ژیانی شپنگلەر و بەرهەمەکانی وە ئەو بۆچوونانەی لەمەڕ مێژوو وە فەلسەفەی مێژوو دەربڕیووە کراوە ، پاشان بەشی دووەم دێت ئەویش (وەرزەکانی شارستانیەت لای شپنگلەر)ە، کە وەرزی بەهاری شارستانیەت و هاوینی شارستانیەت و پایزی شارستانیەت و زستانی شارستانیەتە، پاشان بەرنامەی هاوچەرخێتی فەلسەفی و گرینگی ئەو بەرنامەیەیە بۆ مێژوو نووسان، وە لە دوای ئەوە داخراوی شارستانیەتەکان دێت، کە بە بۆچوونی شپنگلەر شارستانیەکان سەربەخۆن و هیچ هاوبەشییەك لە نێوان فەلسەفەی ژیانی شارستانیەتەکان نییە، وە ئەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی بیروبۆچوونەکانی شپنگلەر کراون.

ئەم توێژینەوەیە بە چەند دەرئـەنجامێكی پەیوەسـت بـە بیرەكـانی شـپنگلەر سەبارەت بە وەرزەكانی شارستانیەت كۆتایی هاتووە.

بـۆ ئـەم توێژینەوەیـە چـەند سەرچـاوەیەك هـەن كـە سـوودی زۆرم لێبیـان بینیـوە، كـە گرینگترینیـان كتێبەكـەی خـودی شـپنگلەر بـەناوی (ئـاوابوونی شارستانیەتی ڕۆژئاوا)یە، كە (احمد شیبانی) وەریگێڕاوەتە سەر زمـانی عـەرەبی و وە كتێبەكەی (عبدالرحمن بدوی) بەناوی (اشبنجلر)ە، وە چەند سەرچاوەیەكی تریش هەن كە گرینگیان لـەو سەرچـاوانە كـەمتر نـەبوون كـە ئامـاژەمـان بـۆكرد، ئەوانیش: كتێبەكەی (هاشم یحیی مەلاح)ە، بەناوی (المفصل في الفلسفة التاریخ)، وە كتێبەكەی (احمد محمود صبحي) بەناوی (في فلسفة التاریخ)، وە ئەو بابەتەی (محسن محمدحسین) كە لە گۆڤـاری ڕۆشـنبیری نـوێ بـڵاوی كردۆتـەوە، بـەناوی (تایبەتێتی زیندوویی شارستانییەكان لای شـپنگلەر)، وە چـەند كتێـب و بابـەتی دیكە لەمەڕ بۆچوونەكانی شپنگلەر.

لە كاتی ئەنجامدانی گشت توێژینەوەیەك، توێژەر دوچاری گیروگرفت و كەم و كوڕی دەبێت، لەو گرفتانەی هاتە پێش توێژینەوەكەمان كەمی زانیارییـە لەسـەر ئەم بابەتە، بەهۆی كەمی سەرچاوە و دووبارەیی بابـەت و زانیارییـەكان لەسـەر فەلسەفەی مێژوو بەگشتی و تێڕوانینی فەلسەفیانەی شـپنگلەر بـۆ شارسـتانیەت بەتایبەتی بەرچـاودەكەوێت، سـەرەڕای ئـەوەی هەنـدێ زاراوە هـەن كـە لـەكاتی وەرگێڕانی بۆ كوردی كێشەی زۆریان بۆ خودی توێژەر دروست كرد.

لـە كۆتایـدا داوای بەخـشین دەكـەم لەهـەر هەڵـەو كـەم و كوڕیـەك كـە لـەم توێژینەوەیـە بـەدیبكرێت، وە هیـوای ئـەوە دەخـوازم كـە ئـەم توێژینەوەیـە هاندەرێك بێت بۆ بەرەو پێشچوونی كاروانی زانستی كوردی.

# بەشی یەکەم
# ژیان و بەرهەمەکانی شپنگلەر و تێڕوانینەکانی بۆ مێژوو وە فەلسەفەی مێژوو

## تەوەری یەکەم/ ژیانی شپنگلەر:

فەیلەسوفی ئەڵمانی ئۆسوالد شپنگلەر((Oswald Spengler، لەئایاری ساڵی ١٨٨٠ لەشاری بلاکنبورگی ئەڵمانیا لە (هەرتس) لەدایك بووە، باوکی ناوی (برنهرد) بووە، دایکی لەخێزانی گرنتزوو (Grantzow)، بووە لەسەر ئاینی مەسیحی وسەربەئاینزای پرۆتستانتی بووە [١]، لە قوتابخانەی (هالە) ناوەندی تەواو کردووە و پاشان چووەتە زانکۆی بەرلین و پاشان زانکۆی میونخ، دوای تەواو کردنی خوێندن گەڕاوەتەوە بەرلین و بووەتە پسپۆڕ لەزانستە سرووشتییەکان [٢].

چوّتە هامبۆرگ و ماتماتیکی خوێندووە [٣]، وە خوێندنی دکتۆرای تەواو کردووە تێزی دکتۆراکەی دەربارەی (هیراکلیتس) بووە لەساڵی ١٩٠٤ پێشکەشی کردووە و بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە [٤].

کاری وانەوتنەوەی ئەنجامداوە و مامۆستای بابەتی مامتماتیك و زیندەوزانی بووە تەنانەت جوگرافیا و مێژووشی وتووتەوە لەشارەکانی (ساربر) و (دسلدۆف) و (هامبورگ)، دەسکەوت و داهاتی کەمبووە لەکرداری وانە وتنەوەدا بۆیە زۆر هەستی بە بێزاری کردووە لەکارەکەیدا و دەیویست خۆی تەرخان بکات بۆ نووسین و لێکۆڵینەوە [٥]، دوای بێزاربوونی لەکاری وانە وتنەوە وەك توانجگیری (معلق) کاری کردووە بەڵام لەمەشییاندا سەرکەوتوو نەبووە [٦].

لەکاتی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەسکەوتی زۆر کەمبووە و ناچار بووە کەشوێنەکەی بگوازێتەوە بۆ گەڕەکێکی هەژار نشین لەشاری میونخ،

تەنانـەت خواردنیـشی لەخواردنگـەکانی تایبـەت بـەکرێکاران دەخـوارد، پاشـان دەگەڕایـەوە ژوورە سـاردەکەیی و خـەریکی نووسـینی ڕەشنووسـی کتێبەکـەی (ئاوابوونی شارستانییەتی خۆرئاوا)بووە[٧].

کتێبی (ئاوابوون و کەوتن) ی (جیبوون)ی لەیەکێ لەکتێبخانـەکانی شـاری (میـونخ) دیـوە ئیلـهامی دانـانی کتێبـی (ئـاوابوونی شارسـتانییەتی خۆرئـاوا) ی پێداوە[٨]، شپنگلەر دووا ساتەکانی تەمەنی بەگۆشەگیری و دابڕاو لەخەڵك بەسەر بردووە، خۆی سەرقاڵ کردووە بەخوێندنەوە لە بەر تینی چراکەی تـا لـە ئایـاری (١٩٣٦ ) کۆچی دوایی کردووە[٩].

تێڕامان لەسەر بـووردەی ژیـانی بۆمـان دەردەکـەوێت لـەبارودۆخێکی خراپـدا ژیانی گوزەراندووە تـەنانـەت زۆرجـار هۆکـاری گەرمکـەرەوەی نـەبووە و بـەتینی چراکەی خۆی گەرم کردۆتەوە، واتە ژیانێکی کولەمەرگی ژیاوە.

## تەوەری دووەم/ بەرهەمەکانی شپنگلەر:

فەیلەسوفی ئەڵمانی ئۆسواڵد شپنگلەر خاوەنی چەندین بەرهەمـە کـە جێگـای بایەخی زۆر و تێڕامانە بەتایبەت لەبارەی مێژووی ئەڵمانیا و بۆچوونەکانی لەمـەڕ ئۆرگانی شارستانییەت.

یەکەم بەرهەمی شپنگلەر کە ئاماژەی بۆکراوە لەزۆربەی سەرچـاوەکان تێـزی دکتۆراکەیـــەتی لەمـــەڕ فەیلەسـوفی یۆنـانی (هیراکلیـتس) لەسـاڵی ١٩٠٤ دا نووسیوییەتی، ناونیـشانی تێـزی دکتۆراکـەی بـەم شێوەیە بـووە "هیراکلیـتس، لێکۆڵینەوەیـــەك دەربـــارەی بیرکردنـــەوە ســـەرەکییە دینامیکییـــەکان لەفەلسەفەکەیدا"، ئەم بەرهەمە یەکەمجار لـە (هـال) چـاپکراوە لەلایـەن بلاوکـار کیمـرر ( C. A. Kaemmerer )، پاشـان جـارێکی تـر لەلایـەن بـك

(C.H.Beck)، لەشاری منشن ساڵی ١٩٣٧ لەژێرناوی (وتارونووسینەکانی شپنگلر) بڵاوکرایەوە لەلاپەڕە ١ – ٤٧[١٠]، دوای ئەمە لەساڵی ١٩١٠ بەرهەمێکی ئەدەبی نووسیوە، کەبریتییە لەکورتەچیرۆکێك کە تاکە پرۆژەی تەواوی کاری ئەدەبییەتی بەناوی (الظافر)[١١].

بەناوبانگترین کتێب و بڵاوکراوەکانی کتێبەکەیەتی بەناوی (لەناوچوونی شارستانیەتی ڕۆژئاوا)، وێنەیەکی تەواوی مێژووی جیهان ( Der Untergang des Abendlanandes )،احمد الشیبانی ئەم کتێبەی بەناوی (تدهور الحضارة الغربیة)، بەدوو بەش بەزمانی عەرەبی لەبەیروت بڵاوکردۆتەوە[١٢].

لەساڵی ١٩١١ دەستی بەنووسینی ئەم کتێبەی کردووە تاساڵی ١٩١٤ پێوەی خەریك بووەو لەو ساڵەدا ئامادەبوو بۆ چاپکردن، بەڵام بەهۆی جەنگی جیهانی یەکەم بەچاپ نەگەیەنرا[١٣]، پاشان لەساڵی ١٩١٧ دەستی کردووە بەگەڕان بۆ دۆزینەوەی یەکێك تاوەکو بۆی بڵاو بکاتەوە، بەڵام گشت خانە گەورەکانی بڵاوکردنەوە ئەم کتێبەیان وەلاناو ڕازی نەبوون بڵاوی بکەنەوە تا بڵاوکەرەوەیەکی نەمساوی ڕازی کردووە بۆی چاپ بکات ئەوەبوو (١٥٠٠) دانەی بەمشێوەیە بەچاپ گەیاند بەمجۆرە لەساڵی ١٩١٨ کتێبەکەی بڵاو بوویەوە[١٤]، پاشان بڵاوکەرەوە بك (C.H.Beck)، بەشێوەیەکی باشتروو ڕێکتر لەدوو بەرگدا کتێبەکەی چاپکردەوە، بەشی یەکەمی لە ساڵی (١٩٢٠) بوو لەمینشن کە پێکهاتبوو لە (٦١٥) لاپەڕە، وە بەشی دووەمی لە ساڵی(١٩٢٢) چاپکرا کە (٦٣٥) لاپەرە بوو لەلایەن هەمان بڵاوکەرەوە[١٥].

ئەم کتێبە بۆ یەکەمجار هەوڵێکە بۆ دەرخستنی ئەوەی لەمێژووی داهاتوودا چی ڕوودەدات وە هەوڵدانێکە بۆ بەدواداچوونی ئەوقۆناغانەی هێشتا ڕوویان نەداوە لەچارەنووسی شارستانییەتی ڕۆژئاوا، ئەوروپا وە امریکا کە

شارستانییەتێکە لەکاتی ئێستادا لەم هەسارەیە بەدیارکەوتووە کە ئەم شارستانییەتە ئەوەی پێگەیشت لەڕاستەقینەی ئێستادا بۆ تەواو کردن و لێکۆڵینەوە هاتووە[١٦].

لەبارەی پێشوازیکردنی کتێبەکە، دوای کۆتایی هاتنی ساڵی (١٩١٨) کتێبێکی گەورە لە لە کتێبخانەکانی ئەڵمانیا دەرکەوت کە (لەناوچوونی شارستانیەتی ڕۆژئاوا) بوو، بەڵام بۆ چەند هەفتەیەك کەس سەرنجی نەدایێ، وە بۆ ماوەیەکیش کەس دانەیەکیشی لێ نەکڕی، وەکەس هیچی لەسەر نەنووسی، دوواجار خەڵك ویستییان بزانن ئەم کتێبە چییە؟ ڕەنگە بەهۆی ئەمەوە بێت کە خەڵکی دەستییان بەکڕینی کرد، بەڵام ناوەندە ئەکادیمییەکان ئاوڕییان لێ نەدایەوە، کە خەڵك دەستی کرد بە گفتوگۆ لەسەر کتێبەکە ڕۆژنامە گەورەکان وتاری توندییان لەدژ نووسی، بەهۆی ئەمە ژمارەی فرۆشتنی زۆرتر بوو وە ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد کەخانەی بلاوکەرەوەکەشی سەرسام کرد و ناچار دووبارە چاپی کردەوە، بەوەندەش نەوەستا بەڵکو چاپی سێیەم و چوارەمیشی بلاوکرایەوە و بۆماوەی دە ساڵ (سەدهەزار) دانەی لێ فرۆشرا[١٧].

کولن ولسن شیکردنەوەی خراپی هەیەسەبارەت بەکتێبەکەی شپنگلەر (لەناوچوونی شارستانیەتی ڕۆژئاوا) و جارێکی تر ئاماژە بەوە دەکات کەوا " جەماوەری یەکەمی کتێبەکەی شپنگلەر ئەو کەسانە بوون کە لەڕۆژی یەك شەمانندا بابەتی (ئەستێرەکان چی دەڵێن) یان دەخوێندەوە" [١٨].

هەندێ لەلێکۆڵەران هۆی پێشوازی لێکردنی کتێبەکە بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کەوا توانیویەتی ڕۆحی ڕەشبینی دەربڕێ کە خەڵکی ئەورووپای داگرتبوو لەمیانەی جەنگی یەکەمی جیهانەوە (١٩١٤ز- ١٩١٨ن)، وە ئەو بارودۆخ و کەشەی لەو جەنگە کەوتبۆوە پاش جەنگەکەش کاریگەری زۆری لەسەر خەڵك

جێهێشتبوو[19]، یەکێك لەگرینگییەکانی ئەم کتێبە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە نووسەرەکەی خاوەنی هزرێکی فراوانە، بە ئەندازەیەك ئەگەر کەسێك کتێبی (لەناوچوونی شارستانیەتی رۆژئاوا) بخوێنێتەوە هەست بەسەرسوڕمان دەکات و بۆی دەردەکەوێت خاوەنی ئەم کتێبە چەندە لەبیرکاری و زیندەوەرزانی دەزانێ، ئەوەندەش لەهونەرو مۆسیقا دەزانێ[20].

هەروەها شپنگلەر لەکتێبەکەیدا بۆ دەربڕینی بیروبۆچونەکانی زارەوەگەلێکی تایبەتی و بەواتایەکی تایبەتی بەکاربردووە و لە گوزارشتکردنی بیروبۆچوونەکانی پشتی بە ڕوداوی خۆیەتی و تێڕوانینی رۆحییانەی تایبەت بەهزری مێژوو بەستووە[21].

کتێبی (لەناوچوونی شارستانیەتی رۆژئاوا) پێویستی بە هەڵوێستەکردن و تێڕامانی زیاترە، چونکە شپنگلەر لەکتێبەکەیدا بیروبۆچونە فەلسەفییەکانی بەچڕی دەرخستووە و لەو کتێبەکەیدا بەشێوەی بەراوردکاری لەدیاردەی پێکهاتەی شارستانییەکانی کۆڵیوەتەوە[22].

لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، بیرۆکەی گەڕانەوە لەهیچ شوێنێکدا بە ئەندازەی کتێبی (لەناوچوونی شارستانیەتی رۆژئاوا) مێژووی لەگەڵ بنبەستی نائومێدیدا ڕووبەڕوونەکردۆتەوە، ئەم سیپارەیە کەبەرگی یەکەمی چەند مانگێك پێش شکستی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانی لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بڵاوکرایەوە کە پێشبینی نەهامەتی کۆتایی کولتورێك و ڕووخانی بوو[23]، هەرچۆنێبێ کتێبەکەی بەڵام کاریگەری زۆری کردە سەر لێکۆڵەران و توێژەران بەتایبەت ئەوانەی لەبواری فەلسەفەی مێژوو کاردەکەن کەبەرچاوترینییان تۆینبی بوو[24].

سەرەڕای ئەو بەرهەمانەی و بەردەوامبووە لە چالاکی نووسین و چەند کتێب و بابەت و نامە و وتاری بڵاوکردۆتەوە لەوانە:

کتێبێکی بەناوی: ( پرۆسیاو ئیشتیراکییەت) کە لەساڵی ١٩٢٢ دەرچوو، کەوێنەیەکە بۆ ژیانی ئینگلیز و پرۆسیا و مارکس، وە دووخراوە پاش ئەوەی هیتلەر دەسەڵاتی بەدەست هێناوە ئەم کتێبە لەلایەن بیك بلاوکرایەوە[٢٥]، هەروەها کتێبێکی تری بەناوی: ( بونیادێکی نوێ بۆ رایخی ئەڵمانی ) کە لەساڵی ١٩٢٤ لەلایەن بیك بلاوکراوەتەوە کەتیایدا دەڵێ: پەروەردە یا سیستەمی سیاسی یا فێرکردن؟ هۆی مانەوەی ئەڵمانیان، لەهەمان ساڵ و هەمان بلاوکەرەوە کتێبێکی بەناوی: ( ئابووری ) کەتیایدا باس لە کشتوکاڵ و بازرگانی و چینە کۆمەڵایەتییەکان و چینەکانی ئابووری و کارکردن و رژێمی سەرمایەداری و رێکخستنی باری ئابووری دەکات[٢٦].

بابەتێکی دیکەی لە ١٩٢٤/٢/٢٦ بەناوی ( بەرپرسیارییەتی گەنجانی ئەڵمانی لەرووی سیاسی ) لە لایەن بیك بلاوکرایەوە. وە بابەتێکی لەگۆڤاری کیلن لە ١٩٢٤/١/٢٦ بەناوی فەرەنسا و ئەوروپا لەشێوەی کۆمەڵێك وتار بلاوکرایەوە لەلاپەرە ٨٠-٨٨ دا لەلایەن هەمان بلاوکەرەوە. وەبابەتێکی بە بۆنەی تێپەرینی هەشتا ساڵ بەر تەمەنی نیتشە بلاوکردەوە لەژێر ناونیشانی سەدەی نیتشە لە ١٩٢٤/١٠/١٥ بلاوکردەوە[٢٧].

وەهەروەها کتێبی ( مرۆڤ و پیشەسازی هونەری ) بەپشکدارییەك دادەنرێ لە دۆزینەوەی فەلسەفە بۆ ژیان لەساڵی ١٩٣٢ بلاوی کردۆتەوە[٢٨]، هەروەها وتارێکی بەناوی (مێژووی گەشەسەندنی راگەیاندنی ئەڵمانی) لەساڵی ١٩٢٦، پاش ساڵێك وتارێکی تری بەناوی (سرووشتی گەلی ئەڵمانی) بلاو کردەوە لەگۆڤاری (خطبة ومقالة)، وە هەروەها لەساڵی ١٩٣٥ وتاریکی تری بەناوی ( بۆ مێژووی جیهانی هەزاران ساڵی پێش زایین) لە گۆڤاری جیهان لەمێژوودا بلاو

کردەوە وەبابەتی ( ئاسیای کۆن ) لەگۆڤاری (جیهان وەك مێژوو) لەساڵی ١٩٣٦ بلاوبۆوە [٢٩].

لەهەمان ساڵدا واتە لە ساڵی (١٩٣٦)، کتێبێکی بەناوی سەردەمی شارستانیەتی ئەمریکی بلاوکردەوە [٣٠]، کۆتا بەرهەمی وتارێك بوو بەناوی (ئایا ئاشتی جیهانی دێتە ئارا؟) لەگۆڤاری (خطبة ومقالة) لەساڵی ١٩٣٦ بلاوکرایەوە [٣١].

## تەوەری سێیەم/ مێژوو، فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر:

فەیلەسوفان و مێژوونوسان تەوەری گرینگی نووسین و بابەتەکانیان بایەخدانە بەمێژوو، واتە مێژوو هۆکارێکی گرینگ بووە لایان بۆ تێرمان و گفتوگۆ کردن لێی، ئەوەی مەبەستمانە تێرامان و بیرەکانی شپنگلەرە بۆ مێژوو و فەلسەفەی مێژوو، کە لە کتێبەکەی (لەناوچوونی شارستانیەتی رۆژئاوا) بەشێکی زۆری فەلسەفەکەی بۆ مێژووی شارستانییەت تەرخان کردووە.. چونکە شارستانییەت بەیەکەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی دادەنێت و تاوتوێ ی مێژووی مرۆڤایەتی دەکات لەدیدی شارستانییەتەوە.

مێژوو لای شپنگلەر: بریتییە لەهۆیەك بۆ هەوڵدانی مرۆڤ بۆ هەستکردن بەزیندوێتی جیهان و پەیبردنی بەڕاستییەکی قوڵ و ڕوون، وە هەست بەمێژوو دەکەین کە بریتییە لەژیان وە ژیانیش بریتییە لەمێژوو [٣٢]، تێڕوانینێکی تری شپنگلەر بۆ مێژوو ئەوەیە کە مێژوو بریتییە لەزنجیرەیەك ڕووداوی دوابەدوای یەکی تاکەکەسی سەربەخۆ و تەواوکەری یەکتری، کە بەرۆشنبیرییەکان ناویان دەبات و هەر رۆشنبیریەك مۆرکی جیاوازی خۆی هەیە [٣٣].

ئۆرگانی مێژووی ڕاستەقینە بەبیروڕای شپگلەر بریتییە لەیادەوەری وێنەی ڕابردووی کەسایەتی مرۆڤ و نەتەوەو جیهان و بەردەوام دەبێت بۆ ئێستایی و داهاتووی، ئەمەش هۆکاری ئاگابوونمانە لەزانیارییەکانی ڕابردوو کە سوودی لێ وەردەگرین[٣٤]، شپنگلەر یاداشت یا ژیاننامەی کەسێك بەتەنها کۆکەرەوەی ژیانی ئەوکەسە نازانێ، بەڵکو بەکۆکەرەوە و لەخۆگری ڕۆحی شارستانییەتێکی تەواو دەزانێت، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی وەك چەمکێکی فراوان گرینگی دەدات بەسەرجەم جۆرەکانی بەراورد کاری سایکۆلۆژیو شیکارکردنە جیاوازەکان، واتە بەم پێیە ئێمە دەتوانین لەرێگەی ژیاننامە یان ژیاننامەی کەسێکی تایبەتی سەربەشارستانییەتێك لەسەرجەم ڕۆحی ئەو شارستانییەتە تێ بگەین[٣٥].

لای شپنگلەر مێژوو تەنها توێژینەوەی بارودۆخی میللەتان و ڕەوتی پێشکەوتن یا ڕوخانی نییە، زۆرتر خوێندنەوەی جێبەجێکاری (تطبیق) ی کولتوورەکانە، لەجێی ڕەچاوکردنی مێژوو بۆ سەردەمەکانی کۆن، سەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی نوێ، دەبێ دابەشکردنی کولتوورەکان لەبەرچاو بگرین[٣٦].

شپنگلەر قسە لەسەر مێژوو دەکات کە تەحەکوم بە بەرەو پێشچوونی شارستانییەتەوە دەکات، ئەمەش ڕێگەی بۆ ئەوە خۆشکردووە کە پێشبینی داهاتووی شارستانی بکەین شپنگلەر تاوتوێی مێژووی مرۆڤایەتی دەکات لەدیدی شارستانییەتەوە، دەڵێ: مێژوو بێ ناوەندێك یا ئامانجێکی کۆتایی وەکو چیرۆکێکە لەیەکەکانی شارستانییەت کە شارستانییەتی ڕۆژئاوا یەکێکە لەمانە، گەشە دەکات بەهەمان بیرۆکەی نەبوونی ئامانج وەکو کێڵگەیەك، ڕێڕەوی شارستانی هەمان ڕێڕەوە[٣٧].

بۆیە شپنگلەر داوای شۆڕشێکی (کۆپەرنیکی)* ، دەکات لە لیکۆڵینەوەی مێژوودا بۆ سڕینەوەی ئەو بەندوباوەی لەمێشکی ئەوروپاییەکان چەسپیوە سەبارەت بەوەی کەوا چەقی شارستانیەتن[٣٨].

جگە لەوەش شپنگلەر مێژوو و مرۆڤ وەك یەکەیەك دادەنێ، چونکە لەو بڕوایەدابوو لێکۆڵینەوەی مێژوو بەپێی تێگەیشتنی بوونگەرایی خزمەتێکی زۆری مێژوو دەکات و پێی وایە مرۆڤ و مێژوو لەیەك دەچن، چونکە لەدایك دەبن و گەورە دەبن و پێدەگەن و دەمرن[٣٩].

شپنگلەر میژوو دەچوێنێ بە کۆمەلێك زیندەوەری ئەندامی زیندوو کە ئەویش شارستانیەتەکانە وە هەر شارستانیەتێك بەزیندەوەریکی ئەندامی زیندوو دەچوێنێت، وە مێژووی هەر شارستانیەتێك وەکو مێژووی مرۆڤ و ئاژەڵ و داروەدرەختەکان وایە، وە مێژووی گشتیش وەرگێرانی ژیانی ئەو شارستانیەتانەیە، ئە گەر هاتوو ڕێڕەوی ژیان یەکێك بێت لە نێو تاکەکانی کە دەچنە یە ك جۆر، ئەوە شارستانیەتەکان یەك ڕێڕەویان هەیە کە پێیدا تێدەپەڕن[٤٠].

پاشان شپنگلەر دێت باس لە مێژوو و سرووشت دەکات و جیاوازی لەنێوانییاندا دەکات بەوەی لەبەرامبەر مێژوو سرووشت دەبینێ، ئەم جیاوازییەش هەر لەچوارچێوەی جیاوازی نێوان زانست و مێژوو دایە کە لەیەکتری جیاوازن، شپنگلەر پێیوایە مێژوو پەیوەستە بە ڕووداو جارێك ڕوودەدات و ئیتر ڕوونادانەوە، بەلام سرووشت سیفەتی دوبارە بوونەوەی هەیەو دەکرێت دووبارە ببێتەوە، هەربەشێکی سرووشت بگریت پێکهاتووە لەکۆمەڵە ڕاستییەك، بەلام مێژوو لەسەر ڕووداو وەستاوە ڕووداوەکانیش دوابەدوای یەکن، بەمشێوەیە (کەی) جیاوازە لە (چۆن)، مێژوو ڕووداوێکی ئێستاییە و

ئاراستەیەکی بەرەو داهاتووە و نیگایەکیشی بەرەو رابردووە، لەکاتێکدا سرووشت لەپشت هەموو کاتێکەوەیە، وە پێویستی ماتماتیك زاڵە بەسەر سرووشت، بەلأم پێویستی مرۆڤ بەسەر مێژوودا زاڵە[٤١]، وە کاتێك لێکۆلەری مێژوویی دەڕوانێتە جیهان لەشێوی سرووشت چونکە لەکاتی ڕوانینی بۆ مێژوو وادادەنێ بەرامبەر سرووشتە بۆ یاسا گشتییەکان[٤٢].

باسکردنی زانستێتی مێژوو وەك هەر زانستێکی تر مشتوومڕی بەردەوامبووە لای زۆربەی مێژوو نووسان و فەیلەسوفانی مێژوو، بەبڕوای شپنگلەر دەکرێ مێژوو ببێتە زانستێك وەك زانستی زیندەورزانی و فیزیا.. لقێك لە لقەکانی مێژووی سرووشتی (زانستی بەراوردکردنی زیندەوەر)ە[٤٣].

تێڕوانیەنکانی شپنگلەر بۆ مێژوو دەچێتە خانەی فەلسەفەی مێژوو، چونکە مێژووی بەشێوەیەکی فەلسەفیانە ڕاڤە کردووە.

**بەشی دووەم**

**ومرزەکانی شارستانیەت لای شپنگلەر، بیری هاوچەرخێتی فەلسەفی و گرینگیەکانی، وە داخراوی شارستانیەکان لەدیدی شپنگلەر و ئەو ڕەخنانەی لێی گیراون**

**تەوەری یەکەم/ومرزەکانی شارستانیەت:**

لەپێشدا ئاماژەمان بەوەدا کەوا فەلسەفەی شپنگلەر ئۆرگانی شارستانییە، دەربارەی پەیدابوون و لەناوچوونی شارستانیەت شتێکی نوێی هێنایە ئاراوە، کە جیاواز بووە لەگەڵ لێکدانەوەکانی بیری هیگڵ لەمەڕ دەوڵەت، چونکە شپنگلەر شارستانیەت بە پێوەندگی هەمووشتێك دەزانێ، لەدیدی شارستانیەتەوە دەڕوانێتە ژیان، واتا فەلسەفەکەی شپنگلەز بە لوتکەی وەرچەرخانی فیکری

فەلسەفەی مێژوو دادەنرێ، لەحاڵەتی گەشبینی بە ئایندەی شارستانیەکان و ڕەشبینی ئەو ئاسۆیانەی چاوەڕێیان دەکات و گومان بردنی بوو بۆ دووا ڕۆژی شارستانیەتەکان، بەتایبەت شارستانیەتی خۆرئاوا، کەبەشی هەرە زۆری کتێبەکەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکردبوو.

شپنگلەر باسی هەشت شارستانیەتی کردووە کە شارستانیەتی (شارستانیەتی بابلی و میسری و هیندی و صینی و کلاسیکی(یۆنان - ڕۆمان) و عەرەبی و مەکسیکی و ڕۆژئاوا) بەڵام تەنها باسی شەش شارستانیەتی ترکردووە، وە زیاتر گرینگی بە سێ شارستانیەت داوە کە(کلاسیکی(یۆنان - ڕۆمان) و عەرەبی و ڕۆژئاوا) بوو[44]، لەلایەکی دیکە (عبدالعزیز الدوري)، دەڵێت شبنگلەر باسی نۆ یا دە شارستانیەتی کردووە، بەدووری دانەنا کە شارستانیەتی تریش هەبێت، وە پێداگری دەرکرد لە سەر ئەوەی کە هیچ پەیوەندی عەقلی نیە لەنێوان شارستانیەتێك و شارستانیەتێکی تردا، ڕەتیکردەوە کە فێربوونی شت لە یەکتری هەبێت لە نێوان شارستانیەتێك و یەکێکی دیکەدا[45].

دەستەواژەی وەرزەکانی شارستانیەت ئەوە دەگەیەنێ کە هەر شارستانیەتێك کەسێتی و خەسیەتگەلی تایبەتی خۆی هەیە، ئەمەش مانای وایە هەر شارستانیەتێك بیگری داخراوە و ڕۆحێکی ئازاد و بەرەڵا نیە، چونکە ڕۆحی بەرەڵا ڕەوتی شارستانییەتەکان دەرنابڕێت، بەڵکو دوا بەدواهاتنی وەرزەکان بەشێوەی خولاو خولی ڕەوتی شارستانیەتەکان دەردەبڕێت[46].

سەرەڕای ئەوەی شپنگلەر شارستانییەت دەچوێنێ بە ئۆرگانێکی زیندوو، شارستانیەت دابەشدەکات بەسەر چوار وەرزدا[47]، واتە وەك وەرزەکانی ساڵ کەپێکهاتووە لەچوار وەرزی (بەهارو هاوین و پایز و زستان)، هەریەك لەمانە سیفەت و خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەیە و شارستانیەتیش بەهەمان شێوە

پێکهاتووە لەچوار وەرز یا بەچوار وەرزدا تێپەڕ دەبێت[٤٨]، دوای گوزەراندنی شارستانیەت بەم وەرزانە ئینجا کۆتایی و مردنیەتی[٤٩]، زانینی وەرزەکانی شارستانیەت بۆ ئەوەیە کە بەراورد بکەین لەنێوان شارستانیەتەکان لەهەر وەرزێکیدا، بۆیە لەخوارەوە ئامارە بەهەر وەرزێك دەدەین بە جیا لەمەڕ بیرۆکەکانی شپنگلەر بۆ چارەنووسی شارستانیەتەکان:

## ١- وەرزی بەهاری شارستانیەت :

دەستپێکی گشت شارستانیەتێك وەرزی بەهارە، چونکە وەرزی بەهار سەرەتای لەدایکبوونی شارستانیەتە، کە داهێنان و کرداری گرینگ و نوێ ئەنجام دەدرێت لەم وەرزەدا[٥٠]، شپنگلەر ئەم وەرزە بە سووڕی مندالی دەچوێنێت، کە لایەنی سیاسی و ئابووری دەگرێتەخۆ، ئەویش بە بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی دەرەبەگ لە بڕیارداندا بۆ سەر کۆمەڵ لە هەموو لایەنێکەوە[٥١].

وەرزی بەهار ملوەی پاڵەوانەتیە کە لە ئەفسانەکان و هەڵبەستە ئەندێشەکاندایە، ئەم وەرزە بە هاتنە ئارای شارستانیەتەکان دەناسرێت[٥٢].

ئەم وەرزە بە چالاکی ڕۆحی دەناسرێتەوە[٥٣]، کە کۆمەڵێك خەونی زۆری لەخۆ گرتووە، جگە لەوە لەسەرەتای ئەم وەرزەدا ئەفسانەی زۆر گەورە لەدایك دەبن گوزاشت دەکەن لەهەستێکی نوێ بەرامبەر بەخوا و ترس لەجیهان[٥٤].

وەرزی بەهار ماوەی پەیدابوونی پیاوی دەگمەنە کە خۆیان لە پێناوی کۆمەڵگەکەیاندا بەخت دەکەن، ماوەیەکە پڕە لە شیعری قارەمانێتی و بە شان و باڵی توانستی خولقێنەر و ئازاری ئادەمیزاددا هەڵدەڵێن، هەروەك ماوەکەی هۆمیرۆسی یۆنانی و ماوەی چاخەکانی ناوەڕاست لەڕۆژئاوا، ئەم قۆناغە قۆناغی خەملێن و بوژانەوەیە، قۆناغی کارامەیی و عەقڵ و بەجێهێشتنی کونە ئەشکەوتی

سارد و سڕی بەربەرییە، قۆناغی بەشدار بوونی ڕیزە ئیشێکی داهێنەرانەیە، کە ژیان و حاڵەتێکی نوێ دەنوێنێت، وا خەریکە مژدەی پەیدابوونی شارستانیەتێکی تازە دێنێت[٥٥].

شپنگلەر ئاماژەی بە بەهاری هەندێ لە شارستانیەتەکانداوە، کە بەهاری شارستانیەتی هیندی لە (١٥٠٠پ.ز) دەست پێدەکات تاوەکو (١٢٠٠پ.ز) کە ئاینی ڤیدا و ئەفسانەی پاڵەوانانی ئاری لەم وەرەزەدا بووە، وە شارستانیەتی کلاسیکی (ئەپۆلۆن)، دەستپێدەکات لە (١١٠٠پ.ز) تا (٨٠٠پ.ز)، کەدەکاتە سەردەمی ئایینی هیلینی ئیتالی، کە ئاینی گەل بووە، وە سەردەمی هۆمیرۆس و ئەفسانەکانی هرقل بووە. پاشان شارستانیەتی عەرەبی[*]، لە (٠) دەست پێدەکات تا (٣٠٠ ز) کە سەرەتای مەسیحییەت و وەسەنییەت و خەونی ئەفسانەییە، پاشان دێتە سەر بەهاری شارستانیەتی ڕۆژئاوا کە لە (٩٠٠ ز) تا (١٣٠٠ ز)، کە سەردەمی کاسۆلیکی ئەڵمانییە[٥٦]، ئەم ماوەیە بەوە ناسراوە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپا باڵا دەست بووە و چینی پیاوماقوڵان (النبلاء) دەرەبەگەکان و پیاوانی ئاینی دەستیان بەسەر کۆمەڵگادا گرتبوو، بەڵام لەسەر ئاستی ئاوەدانکردنەوەدا کاتیدرائی تیا بینا کراوە، وە ڕەسم و نەخش لەسەر شوشە کراوە و پەیکەرسازی بڵاوبۆتەوە[٥٧].

هەر لەبەهاری شارستانیەتدا سۆفیزمی میتافیزیکی و تێڕوانینی نوێ بۆ جیهان و لوتکەی فەلسەفەی لاهوتی دەرکەوت، کەخۆی دەبینییەوە لە بەشە سەرەتاییەکانی (ڤیدا) لەشارستانیەتی هیندی، وە بەشە پێشکەوتووەکانی (هیود) و (کسۆگوتیس) لە شارستانیەتی ئەپۆلۆنیدا، (بارتۆتیوس٢٦٩ز) و (مانی٢٧٦ز) و (ئاڤێستا) و (تلمود) لە شارستانیەتی عەرەبیدا، (تۆمای

ئەکوینی١٢٧٤ن) و (دۆنس سکرتوس١٣٠٨ن) و سۆفیزم و فەلسەفەی لاهوتی لەشارستانیەتی ڕۆژئاوا[٥٨].

لەمەوە دەردەکەوێ سەرەتای لەدایکبوونی شارستانیەت لای شپنگلەر وەرزی بەهارە سەرەتای دەست پێکردنی نەشونما و شێوازی گرتنەبەری گوزارشت لەخۆیی و وەرگرتنی تایبەتمەندییەکانیەتی.

## ٢- وەرزی هاوینی شارستانیەت:

پاش لەدایکبوونی شارستانیەت و دەرکەوتنی، تایبەتمەندییەکانی وەرزی بەهار تێدەپەڕێنێت و وەرزێکی تر دەست پێدەکات کە وەرزی هاوینە[٥٩]، کە ئەم وەرزە وەرزی فراژووکردن و پێگەشتنی شارستانیەتەکانە[٦٠].

وەرزی هاوین وەرزی بەدیارکەوتنی شارو ڕیکخستنی سیاسیە، وە لە هەمانکاتدا شۆڕشێکە دژی ئەفسانە (المیثولوجیا) و زیرەکی و وشیاری و چالاکی تێدا بەدیار دەکەوێت و ئاین لەدووا دەدات و وشیاری زانستی دێتە ئارا[٦١]، تیادا دەسەڵات لە لادێوە بەرەو شار دەگوازرێتەوە و پیشەسازی پەرە دەسێنێ، کە ئەمەش بووە هۆی گواستنەوەی دەسەڵاتدارییەتی لەدەرەبەگایەتیەوە بۆ دەسەڵاتدارییەتی چینی ناوەند(بورجوازی)[٦٢].

وەرزی هۆشیارییە لە ڕێڕەوی پێگەیشتن و بەشاریبوون و ڕەخنەگرتن لە سەردەمە زووەکان و چاکە خوازی بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی ناوخۆیی لە فۆڕمێکی جیاواز وسەرهەڵدانی چەمکی نوێی ماتماتیك و بەپرۆگرامبوونی بەشێوەیەکی نمونەیی، قۆناغی هاوینی شارستانیەتی هیندی لە (١٠٠٠-٩٠٠پ.ن)، کە دەرکەوتنی کۆنترین بەشی (یوپانیشادن) بوو، لە شارستانیەتی کلاسیکی (٧٠٠-٨٠٠پ.ن) جوڵانەوەی ئاینی تۆما بوو[٦٣]، شارستانیەتی عەرەبی

لە (٣٠٠-٦٥٠ز)، تا ئەو كاتە ئیسلام دەركەوت و دوڵەتی خۆی دامەزراند لە "مەدینە" لەساڵی (٦٢٢ز)، یانی لە كۆتایی وەرزی هاوینی شارستانیەتی عەرەبی بوو، وە هاوینی شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە سەدەی پازدەهەمەوە دەست پێدەكات تا كۆتایی سەدەی حەڤدەهەم، بەوە جیادەكرێتەوە كە سەردەمی ڕاپەڕین و بەربەرەكانی میللی بووە لەدژی دەرەبەگ و دەسەڵاتی كڵێسا، وە چینی بۆرجوازی پەیدابووە و دەوڵەتی نوێ دامەزراوە [٦٤].

هەر لە هاوینی شارستانیەتدا فۆرمێكی فەلسەفەی ڕووت دەسنت پێدەكات وەك هەستكردن بەرامبەر بەجیهان، وە بەرهەڵستی كردنی ڕێبازە میسالی و ڕاستەقینەكان و پێشكەوتنی زانستی ماتماتیك، كە لەشارستانیەتی هیندی (پارێزگارییە لە یۆپانیشادن)، وە لە شارستانیەتی كلاسیكی لە (فەیلەسوفانی پێش سوكرات) و لە شارستانیەتی عەرەبی (قیبتی) و (فارسەكان)، وە لەشارستانیەتی ڕۆژئاوا لە (گالیلۆ) و (دیكارت) و (لایبنز) خۆی بینیەوە [٦٥].

## ٣- وەرزی پایزی شارستانیەت:

پایزی شارستانیەت سەردەمی گەشە كردنی شارییە، وە سەردەمی بازرگانێتی بەربڵاو و موڵكدارییە، ئاین دەست دەكات بە لەناوچوون و هەژاری ژیانی ناوخۆیی، بەڵام بیرمەندیەتی و ڕۆشنگەری لەدیاردە دیارەكانی ئەم وەرزەی شارستانیەتن [٦٦]، لە پایزدا تەواوی سەرچاوە ڕۆشنبیری و ڕۆحیەكان بەرەو قۆناغی پێگەیشتن دەچن و سەرەتاكانی پیری و ماندووبوونی شارستانیەكان پەیدا دەبێت كەتیایدا موڵكایەتی ناوچەیی و فەلسەفەی بەرهەڵستی ئاین و ڕەوشت بەناوی ڕۆشنگەری دەست پێدەكات [٦٧].

وەرزی پایز وەرزی زیرەکی شارە، لوتکەی داهێنانە، سەردەمی ڕوناکییە، ئیمان هێنانە بە عەقڵ کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، کە لەشارستانیەتی هیندی دەرکەوتنی ئاینی بوزایە، لەشارستانیەتی کلاسیکی لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین (مردنی سوکراتە) لە ساڵی(٣٩٩پ.ز)، لە شارستانیەتی عەرەبی (دەرکەوتنی گۆشەگیری) و (سۆفیگەرێتییە) لەدەوروبەری (٨٣٠ز)، لە شارستانیەتی ڕۆژئاواش دەرکەوتنی بیرمەندی ئینگلیزی (جون لوك) و دەرکەوتنی ئینسکلۆپیدیە فەرەنسیەکانی وەك (ڤۆلتێر و ڕۆسۆ)[٦٨].

کۆتایی ئەم وەرزە پێشکەوتنی کرۆکی ماتماتیك و ڕاڤەکردنی جیهان لەسەر شێوەی ژمارە و پرۆگرامی کۆتایی لەفۆرمی زانکۆیی تۆکمە و بەرزدا، کە لەشارستانیەتی هیندی لە (یۆگای نمونەیی) خۆی دەبینیەوە، وە لەشارستانیەتی کلاسیکی (ئەفلاتون٣٤٦پ.ز) و (ئەرستۆتالیس٣٢٢پ.ز)، هەرچی شارستانیەتی عەرەبییە، لە(سەدەی چوار)چۆتە قۆناغی پایزی شارستانیەت (فارابی٩٥٠ز) و (ابن سینا١٠٠٠ز)، لەم سەردەمەدا بوون، وە لەشارستانیەتی ڕۆژئاوادا (گۆتە)، (کانت)، (هیگل) خۆی دەنوێنێت[٦٩]، پایزی شارستانیەتی ڕۆژئاوا سەدەی هەژدەهەم تا سەدەی نۆزدەهەمی خایاند، کە تیایدا گەلێ شۆڕش پەیدابوو دژی سیستەمی سیاسی و بیری کۆنی ئەو سەردەمە، لەوانە شۆڕشی فەرەنسی و ئەمریکی و دامەزراندنی سیستەمگەلی نوێ[٧٠].

شیکردنەوەی شپنگلەر بۆ ئەم وەرزە دەردەکەوێ، کە دوای لەدایکبوون و پێگەیشتنی تەواوی شارستانیەکان لە بەهار و هاویندا، وەرزی پایز دێت کە

سەرەتای قۆناغی پیری و دارمان و بێهێزییە بەردەوام دەبێت تا دەگاتە قۆناغی کۆتایی ژیانی کە وەرزی زستانە.

## ٤- وەرزی زستانی شارستانیەت:

دوای ئەوەی شارستانیەت قۆناغی پایزی بڕی، پێدەنێتە قۆناغێکی کۆتایی کەئەویش وەرزی زستانە، بە دەست پێکردنی زستانی شارستانیەت، هونەر مۆرکێکی نەزانراوی پەنهان وەردەگرێت، فەلسەفەش مۆرکی گومان و نازانمی (لا ادرية) وەردەگرێت[٧١]، وەرزی زستانی شارستانیەکان بەرەو پێشچوونی پیرییە، ئەو پڕشەنگ و ڕوناکییەی کە هەیبووە دەکوژێتەوە دەیەوێت کاریگەری دروست بکات بەڵام توانای نەماوە و پێی ناکرێ[٧٢]، واتە کاتێك شارستانیەت دەچێتە ناو وەرزی زستانەوە وردە وردە زیندوێتی خۆی لەدەست دەدات و توشی سستی و بێهێزی دەبێت ئەو توانایەی نامێنێت کارەکان بکات، زۆرجار هەوڵ دەدات بچێتەوە دۆخی داهێنان و بەرهەمهێنان، بەڵام لە توانای نیە ئەو کردارە ئەنجامبدات، وەك چۆن ناتوانرێت هیچ یەکێك لە وەرزەکانی ساڵ بگەڕێنرێتەوە، بەم شێوەیە ناتوانرێت بەهیچ جۆرێك شارستانیەت لە وەرزی زستان ڕزگار بکرێت و بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای بەهارییەکەی[٧٣].

ئەم وەرزە بەرەبەیانی مەدەنیەتی شارە گەورەکانە، کە تیایدا تێڕوانینی ماددیی بۆ جیهان و زاڵبوونی زانست و سوود و خۆشگوزەرانی شارستانیەتەکان دێتەئارا، کە لە شارستانیەتی هیندی لە (سنخیا) و (ڤالکاشیکا)دا خۆی دەنوێنێت، وە لە شارستانیەتی کلاسیکی لە (کیلنیەکان) و (سیرانیون)دا خۆی دەنوێنێت، وە لەشارستانیەتی عەرەبی (ڕێچکەی شوعیەت) و (اخوان الصفا) ی

سەردەمی عەبباسیدا خۆی دەنوێنێت، لەشارستانیەتی ڕۆژئاواشدا لە (بنتهام) و (داروین) و (سبنسر) و (مارکس) و (فیورباخ) دا خۆی دەنوێنێت[٧٤].

هەر لەم ورزەدا قۆناغیکی دیکە دێتە ئارا، ئەویش بەکارهێنانی هێزی داهێنەرانە و ململانێی ڕەوشتییە، وە کاملبوونی جیهانی ناوەکی لەشێوەی ماتماتیکدا و بیرکردنەوە بە ئاراستەی بەرهەمهێنانی زیاتر، کە ئەمە لەشارستانیەتی هیندی لە (ململانێی سەردەمی بوزا) خۆی دەنوێنێت، لە شارستانیەتی کلاسیکی لە ( هیلینەکان) و(ئەرخەمێدس) دا خۆی دەنوێنێت، لەشارستانیەتی عەرەبیدا لە (جولانەوە لە ئیسلامدا) و (خوارزمی) خۆی دەنوێنێت، لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە (شوبنهاور) و (نیتشە) و (هیگل) و (ریمان) دا خۆی دەنوێنێت، کۆتا قۆناغی وەرزی زستان کە شپنگلەر ئاماژەی بۆ کردووە ئەوەیە کە فەلسەفە لە هۆڵەکانی خوێندنی دانپیانراو ڕیکخستنی بۆ کرا، وە بلاوبوونەوەی سۆی جیهانی کۆتایی بوو کە لەشارستانیەتی هیندی لە (پرۆگرامی کلاسیکی) و (ئاینی بوزی هیندی) خۆی دەنوێنێت، وە لەشارستانیەتی کلاسیکی لە (ئەکادیمیەکان) و (عبقریەکان) و (سەرگوشتەی هیلینی) و (دەست پێکی ڕۆما ٢٠٠پ.ز) دا خۆی دەنوێنێت، لە شارستانیەتی ئیسلامیدا (قوتابخانەکانی بەغدا وبەصرە) و (زانستی جەبر لە سەردەمی ئیسلام پاش ١٠٠٠ز) خۆی دەنوێنێت، لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا (دەروونناسان) و (ئەخلاقێتی هاوبەش لە ١٩٠٠ز) دا خۆی دەنوێنێت [٧٥]، زستانی شارستانیەتی عەرەبی ئەو کاتە بوو کە چالاکی ڕۆحی نەما، مەزهەبی خوانەناسی و گومان سەریان هەڵدا، کە بووە هۆی لێکترازان و داکەوتن لە بونیادی ناوخۆیدا و کە ئەمە داگیرکاری مەغۆلەکانی بەدوای خۆیدا هێنا لە ساڵی (١٢٥٠ز)، (ڕاستیەکەی ١٢٥٨ز–٦٥٦ك) یە، کە کۆتایی ژیانی شارستانیەتی عەرەبی بوو کە ماوەی

١٢٥٠ ساڵ خولی ژیانی بەردەوامی هەبوو، سەبارەت بە زستانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی پێکرد ئێستاش بەردەوامە، شپنگلەر لەو بڕوایەدایە تا ساڵی (٢٢٠٠ز) بەردەوام بێت، دواجار چارەنووسی ئەم شارستانیەتە وەك شارستانیەتەکانی بەر لەخۆیەتی، چونکە تەماشای کرد داگیرکاری زۆر پەیدابووە و شەڕو قەتل و عامیشی تیادا ڕوویداوە[٧٦]، شپنگلەر دەڵێت: شارستانیەتی ڕۆژئاوا بە تەنها نامرێ، بەڵکو گشت شارستانیەتە گەورەکان دەمرن و کۆتاییان پێدێت، تەنانەت ڕۆژێك دێت مرۆڤ و ڕووەك و ئاژەڵیش لەسەر ئەم ئەستێرەیە نامێنن، نەك هەر ئەمەش تەنانەت کۆمەڵەی خۆریش نامێنێت و کۆتایی پێدێت[٧٧].

ئەو دابەشکردنەی شپنگلەر بۆ وەرزەکانی کردووە گرینگییەکەی ئەوەیە کە بەجیا باس لەهەر لە شارستانیە باسکراوەکان دەکات، کە هەر یەکەیان تایبەتمەندی و خۆی هەیە نەك تەنها باس لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا بکات و بیکاتە پێوەرێك بۆ شارستانیەکانی دیکە.

## تەوەری دووەم/ بەرنامەی هاوچەرخێتی فەلسەفی:

چەمکێکی گرینگ کە شپنگلەر دایهێناوە چەمکی هاوچەرخێتی فەلسەفییە، ئەو چەمکە بەشێوەیەك دەربڕاوە کە لەلای فەیلەسوفانی تری مێژوو بەو شێوەیە دەرنەکەوتووە، شپنگلەر ئەم بەرنامەیەی هێنایە ناو ڕێگای مێژووییەوە و بەشێوەیەکی ڕێك و ورد دایڕشتووە، شپنگلەر پێیوایە دوو ڕووداوی مێژوویی لەدوو شارستانییەتی جیاوازدا هاوچەرخی یەکترن، لەیەك ڕەوشدا دەردەکەون بەشێوەیەکی ڕێژەیی کە مانایەکی چونیەکییان هەیە بەتەواوی[٧٨].

سەبارەت بە چەمکی هاورچەخێتی شپنگلەر دەڵێ: " مەبەستم لە چەمکی هاورچەخێتی ئەوەیە کە دوو ڕووداوی مێژوویی هاوچەرخ کە هەریەکەیان لەشارستانیەتێکی تایبەت بن کە بەشێوەیەکی ڕێژەیی ورد بەدیاردەکەون و دوو مانای هاوشێوەیان دەبێت"، ئەمەش سەبارەت بە هەموو ڕووداوێك و شارستانیەتێك، هەر لەبەر ئەمەیە ئەو دوو ڕووداوە خاوەنی گرینگییەکی یەکسان و بەرامبەرن، مەبەستی شپنگلەر دووبارە بوونەوەی ڕووداوەکان نییە چونکە خۆی لەبنەڕەتدا باوەڕی بەدووبارە بوونەوەی مێژوو نییە بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە هەریەکە لەو ڕووداوانە بۆ شارستانییەتەکەی خۆیان هەمان گرینگیان هەیە[٧٩].

هەموو شارستانیەکان چەند قۆناغێکی لە یەك چووی هاوچەشن دەبڕن ئەگەر بەوردی لەمێژووی ئەو شارستانیەتانەمان کۆڵییەوە ئەوسا دەبینین دوو ڕووداوی مێژوویی لەدوو شارستانییەتدا لەدووجێ و کاتی لەیەك دووردا پەیدا دەبن ئەم دوو ڕووداوە بە هاوچەرخ دەژمێردرێن ئەگەر هەر یەکەیان هەمان دەور بگێڕێت و هەمان ئەرکی هاوچەشنەکەی لەشارستانییەکەی تردا بەجێ بگەیەنێت. ئەوەیش کە هەندێك مێژوونووس دەیکەن وەك لە یەکچواندنی ئەسکەندەری گەورە لەگەل ناپلیۆن پۆناپەرت دا، یان لە بەراورد کردنی بوودا و مەسیح، وە مەسیحیەتی سەرەتاو سۆسیالیزمی نوێ، لەبەر ئەوەی لە هەندێك ڕووەوە لەیەك دەچن، لە ئاست و شێوەی ڕووداوەکە نەك لەسەر ئاستی قۆناغی مێژوویی شپنگلەر ئەم بۆچوونە بە لەیەکچونێکی درۆزنانە دەچوێنێت وە بەراوردکردنەکان بۆ بەڵگەی ئەم ناڕاستییە گیانلەبەری بڕبڕەدارەکان بەنمونە دێنینەوە کە هەر هەمویان لە مرۆڤ و سەگ و ماسی و لە سەرو ئەندامەکانی تر دا لەیەك دەچی لە بەر ئەوە

لێك دانەوەی مێژو لای شپنگلەر لیكدانەوەیەكی بایلۆجیە بۆیە گونجانیش لە لەیەكچون وردترو قوڵترە[٨٠].

بۆزیاتر سەلماندنی بیرەكانی لەبارەی هاوچەرخێتی نمونەی تر دەهێنێتەوە وەك فیثاگۆرسی زانای ماتماتیكی یۆنانی لەگەڵ دیكارتی زانای ماتماتیكی ئەوروپی و ئەفلاتون و لابلاس لە یەك دەچن، كەواتە دەتوانین بڵێین ئەسكەندەرییەی سەردەمی یۆنانی و بەغدای سەردەمی ئیسلامی وە واشنتۆن ی سەردەمی شارستانییەتی ڕۆژئاوا لە یەك دەچن، كە واتە دەتوانین پرۆگرامی هاوچەرخێتی بە سەر هەموو دیاردە هونەری و دینی و سیاسی و ئابووری كۆمەڵایەتی لەهەموو شارستانیەكان لەسەردەمی سەرهەڵدان و گەشەكردن و ڕوخان و نەمانییان جێبەجیێ بكەین مادام پێكهاتنی ناوەوە لە هەموو شارستانییەكاندا هاوڕێك و گونجاوە هەربەم جۆرەش لەچاو دیاردەكانی تردا لەسەرهەڵدان و پێگەیشتنیاندا هاوچەرخن[٨١].

## تەوەری سێیەم/ گرنگی بەرنامەی هاوچەرخێتی فەلسەفی:

بەرنامەی هاوچەرخێتی فەلسەفی كە شپنگلەر دایهێناوە گرینگی زۆری هەیە كە بەهۆیەوە مێژوو نوس دەتوانێت سوودی لێ وەربگرێ لەم لایەنانەی خوارەوە:

١- دەتوانین بەهۆی بەرنامەی هاوچەرخێتی فەلسەفییەوە لە چەندان چەرخی سەردەمی ڕابردوو بكۆڵینەوە كە زانیاریمان لە سەر نیە یان كتێب و بەڵگە نامەی لەسەر نەدۆزراوەتەوە[٨٢]. واتا ئەم جارە فەلسەفە بۆ لێكۆڵینەوە لەمێژوو بەشداری دەكات، دوای ئەوەی سەردەمێكی زۆر مێژوو دەستی بۆ فەلسەفە درێژ دەكرد، ئەوسا لێكۆڵەرەوەی مێژوو دەتوانێ بەرنامەی

هاوچـەرخێتی بکاتـە ڕێگەیـەك بـۆ لێکۆڵینـەوەی مێـژوو کاتێـك کەرەسـتە بـاوە باسکراوەکان لەبەردەستدا نەبێت[٨٣].

٢- بـەهۆی بەرنامـەی هاوچـەرخێتی فەلـسەفی دەتوانرێـت سـنوری ئێـستا ببڕدرێت و پێشبینی داهاتوو بکرێت بەشێوەیەکی ورد و دروست، بەتایبـەت کـە شـبنگلەر پێیوایـە دەتوانرێـت خوێندنـەوە بـۆ ئـەو سـەردەمانە بکرێـت لەشارستانیەتی ڕۆژئاوا و شارستانیەتەکانی تر کە تائێستا نـەهاتوون، لـە ڕووی وێنـەو تەمـەنی شارسـتانیەتەکە و چوارچـێوەی پێـشکەوتنی و واتاکـەی و ئـەو دەرئەنجامەنـەی لێـی دەکەوێتـەوە[٨٤]. واتـە بەرنامـەی هاوچـەرخێتی وادەکـات فەلـسەفەی مێـژوو دەسـت درێـژ بکـات بـۆ زانـستی سیاسـەت و ئـابوری و نەخشەکێشانی دوارۆژی کۆمـەڵ بەچاوبڕینە قۆناغـە بـەرەودوواکانی کەمێـژوو پێیـان تێدەپـەڕێت، ئەمـەش وادەگەیـەنێ مێـژوو، پاشـان فەلـسەفەی مێـژووش بەتەنها هەربۆخودی خۆی نابێتە مەیدانی لێکۆڵینەوە بەڵکو بۆ زۆر کاری بەسوود کەڵکی لێوەردەگیرێت[٨٥].

کە ئەمە خاڵێکی گرنگە چونکە بەهۆی ئەمەوە کاری مێژوونوس تـەنها بریتـی نابێت لە لێکۆڵینەوە لـە ڕابـردوو کـە زۆر لـە توێـژەران بـەهۆی ئەمـەوە بایـەخی مێژوو کەم دەکەنەوە کە دەڵێن مێژوو سودێکی نیە چونکە تەنها بـاس لـەڕابردوو دەکات، بەڵام بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە سوود لـەڕابردوو و ئێـستا وەردەگـرین بـۆ پێشبینیکردنی داهاتوو.

٤- سـوودێکی تـری ئـەم بەرنامەیـە ئەوەیـە ڕووداوە مێژووییـەکان شـتێکی کتوپڕوسەرسوڕهێنەر نییە لەلای مێـژوونووس، چـونکە هاوشـێوەی ئەوڕووداوانـە لەشارسـتانیەتەکانی تـردا ڕوویانـداوە، بـۆ نموونـە جـەنگی یەکـەمی جیهـانی ڕوداوێکـی هـەلاوێردی (الاسـتثنائي) نییـە، لـەدایکبووی حـەزوئارەزووی

دەستبەسەرداگرتن و سەروەری نییە لەلایەن هەندێك گەل و تاکەکەسەوە، هەروەك ناکرێت هۆکارەکەی بگەڕێنرێتەوە بۆ ئابووری چونکە لێکچوون هەیە لەنێوان جەنگی تەڕوادە و جەنگەکانی خاچییەکان، وە لەنێوان جەنگی بولینزی و جەنگی جیهانی یەکەم وەلەنێوان ئەسینا و پاریس وە لەنێوان ئەرستۆ و کانت وە لەنێوان ئارەزووی جیهانگیری پاش ولاتگیرییەکانی ئەسکەندەر و ئیستعماری ئەورووپیدا[٨٦].

## تەوەری چوارەم/ داخراوی شارستانیەکان:

١) شپنگلەر پێی وایە هەر شارستانیەتێك پێکهاتەو سەر بەخۆیی خۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە شارستانیەکانی دیکە، وە ماوەی بەیەك گەیشتنیان نیە، وە ئەو لە یەکچونەی کە دەبینرێت تەنیا چاو خەڵەتێنە، چونکە لە یەکچونێکی ڕواڵەتیە نەك ناوەڕۆکی، بۆ نمونە ئەگەر ڕەگەزە دەرەوەییەکانی دوو شارستانیەتی کارکردوو هاوبەش بووە، ئەی بۆ هەرشارستانیەتێك بە شێوەی جیاواز ئەم ڕەگەزانە قبوڵ دەکات بە گوێرەی سروشتی خۆی؟ چونکە تاحەواڵەی سروشتی خۆیانی نەکات پێی قبوڵ ناکرێت ئەگەر هەر دیاردەیەك لە شارستانیەکەوە پەڕیەوە شارستانیەکی تر توشی گۆڕانی دەکات[٨٧] هەر شارستانیەتێك فەلسەفە و خەسڵەتی خۆی هەیە وە ژیانی دیاری کراوی تایبەتی بە خۆی هەیە، کەدەبێ لەڕادەیەك کۆتایی بێت، هەروەکو چۆن تاکەکەس لەناو دەچێت و نامێنێت، بەڵام (جۆرەکەی) هەر دەمێنێت، شارستانیەتیش ئاوا دەمرێت و لەناو دەچێت و تەنها ئادەمیزاد لەناویا دەمێنێت کە نوێنەری هەموو شارستانیەکانە، هەروەکو چۆن لەدایکبوون و گەورەبوون و پیربوون و مردن هەموو بونەوەرێکی ئۆرگانی دەگرێتەوە، هەربەوجۆرەش هەموو شارستانیەتێك

دەگرێتەوە، بەو جۆرە مێژووی جیهان لەوە پێکدێت کە هەموو شارستانیەتەکانی جیهان لەپاڵ یەکەوەن و بەشێوەیەکی سەربەخۆ دادەنرێن، بەو پێیەی کە هەریەکەیان دیاردەیەکە و بەسەرخۆیدا داخراوە و ڕۆحی شارستانی دروست دەکات و دەریشی دەبڕێت[٨٨].

شپنگلەر دەڵێت: با ئەو بیروباوەڕە پڕوپوچانە لەناو ببەین، کە مێژوونوسانێکی خەڵەتاو مێژوویان پێ شێواندووە و خەڵکیان پێ گومڕا کردووە، چونکە ئەو مێژوونووسانە وتیان شارستانییەتەکان پەیوەندییان بە یەکتری هەیە و بەیەکەوە بەستراون، هەرکاتێك هۆکارێکی سادەی ڕووی شارستانیەتێکی کۆن بە شارستانیەتێکی تازەوە ببینن، هاوار دەکەن و دەڵێن: ئەمە "کاریگەرییە" ئیدی بەدوای کاریگەریەکەدا دەڕۆن بۆ هەموو ئەو شتانەی دەیانەوێت[٨٩].

پوختەی قسە ئەوەیە: شارستانیەتەکان هەریەکە سەربەخۆیە و بازنەیەکی داخراوی لەدەوری خۆیدا کێشاوە، تەنها دەلاقەیەك لەنێوانیاندا هەیە کە لێناگەڕێن ئەوەی لەگەڵ کرۆك و گیانی شارستانیەتەکەدا گونجاو نەبێت تێپەڕببێت، ئەوەی کە تێپەڕیش دەبێت بەزوویی دەچێتە سرووشتی شارستانیەتەکەی ترەوە، هەموو وێکچوون و هاوشێوە بوونێکیش تەنها ڕوواڵەتە و ئەگەر بشڵێین کە ئادەمیزاد یەك کولتووری هەیە و مەزندەی کاریگەری و کارلێکراوی دەکات ئەوە قسەی پڕوپوچە و لەخەیاڵ زیاتر هیچی تر نییە[٩٠].

واتە بەپێی بۆچوونەکانی شپنگلەر بیرۆکەی کارلێکردن و کارتێکردن لەشارستانیەتەکان بوونی نیە ئەگەر هەشبێت لە چوارچێوەیەکی زۆر کەمە بەشێوەیەك کە گۆڕانکاری ڕیشەیی بەسەریدا دێنن ئینجا وەریدەگرن.

**تەوەری پێنجەم/ ئەو ڕەخنانەی لە بیروبۆچوونەكانی شپنگلەر گیراون:**

گشت خاوەن بیرو تیۆرێك لە هەر ئاستێك و پلەیەكدا بێت، گشت بیروبۆچوونەكانی وەرناگیرێت و دووچاری ڕەخنە و توانج دەبێت، چونكە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی هەر بابەتێك جیاوازە لە كەسێك بۆ كەسێكی دیكە بەهۆی هەستی بیركردنەوە و ویژدان و ئەو ژینگەیەی تێیدایە، هەر ئەمەشە وایكردووە لە بابەتێكی دیاری كراودا چەندین تیۆر و تێڕوانینی جیاوازی بەرهەمهێناوە كە گشتیان دووچاری ڕەخنەو توانج بوونەتەوە، لەگەڵ ئەوەی لایەنگرێكی زۆریشیان هەبووبێت.. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو ڕەخنانەیە كە لە بیرو تیۆرەكانی شپنگلەر گیراون سەبارەت تێڕوانینی بۆ وەرزەكانی شارستانیەت، چونكە فەلسەفەی شپنگلەر ئەوەبوو كە شارستانیەتی بە پێودانگی گشت شتێك زانیوە، وە لەو بڕوایەدا بوو كە شارستانیەتەكانیش وەك مرۆڤ یا ڕووەك خولی ژیانی هەیە كە (لەدایكبوون و گەنجێتی و پیری پاشان مردن)، یان پێكهاتووە لە (بەهار و هاوین و پایز و زستان)، بۆیە لێرەدا هەندێك لەو ڕەخنانە دەخەینە ڕوو كە ئاراستەی بیروڕاكانی كراون :

١- شپنگلەر خولی شارستانیەتی بە خولی ژیانی بوونەوەری زیندوو دەشوبهێنی، ئەوەندە سەردەكات كە لەگەڵ پرۆگرامی زانستیدا ڕێكناكەوێت، چونكە بوونەوەری زیندوو پاش ئەوەی لەشی دەگاتە پلەیەكی تایبەتی پێگەیشتن دەمرێت، بەڵام گەلان یا كۆمەڵان لەگەڵ هاتنە دنیای هەر نەوەیەكدا لاوێتیان نوێ دەبنەوە، ئیتر شایەنی ئەوە نییە ئەگەر لەڕووی مەجازێكی ڕووتەوە نەبێت شارستانیەتیەك بە پیر وەسف بكرێت، چونكە لێرەدا پیری كە بێهێزی و ڕزینە لەدیاردە كۆمەڵایەتی و سیاسیەكاندا لەپیربوونی ئەندامی زیندووان زۆر جیایە[٩١].

٢- کۆمەڵگاکان و گەلان، ئەو چوارچێوەیەن شارستانیەتەکانی تیادا پەیدا دەبێ و دادەمەزرێ، لە درووستکراوی زیندوو ناچن، چونکە درووستکراوی زیندوو، دوای ئەوەی جەستەی دەگاتە پلەیەکی دیاریکراو لە گەشەکردن دەمرێت، کەچی گەلان و کۆمەڵان لە لەدایکبوونی هەر نەوەیەکدا زیندوو دەبنەوە[٩٢].

٣- رەخنەیەکی تر ئەوەیە کە شپنگلەر پێی وایە هیچ کاریگەرییەك نیە لەنێوان شارستانیەتەکاندا، بەڵام ئەوەی هەیە تەنها شتێکی رووکەشە، بەڵام هەندێك لەلێکۆڵەران رەخنە لەم بیرۆکەیەی شپنگلەر دەگرن و پێیانوایە ناکرێت لەنێوان شارستانیەتەکاندا هیچ پەیوەندیەك نەبووبێت و کاریگەریان لەسەر یەکتر دانەنابێت[٩٣].

٤- شپنگلەر پێی وابوو کە توانای رەگەزی مرۆڤ بۆ رزگارکردنی شارستانیەت ئەستەمە[٩٤]، شپنگلەر تەنها نکوڵی لە رۆڵی تاکەکان ناکات، بەڵکو نکوڵی لە رۆڵی میللەتان و گەلانیش دەکات لە دروستکردنی شارستانیەتەکەیاندا، چونکە وای دەبینی شارستانی میللەتان و گەلان دروست دەکات نەك بە پێچەوانەوە[٩٥].

٥- شپنگلەر خواستی هێزی بۆ چارەنووسی شارستانیەتەکان بە پلەیەك داناوە، کەچی رۆڵی تەکنەلۆژیا و ئابووری لە پلەی دووەم دێن[٩٦].

٦- رەخنەیەکی تر ئەوەیە کە شارستانیەتی عەرەبی(ئیسلامی) بە شارستانیەتی جادوگەری و مەجوسی وەسف کردووە، وە زۆربەی بەشی سەردەمی ئیسلامی لە ژیانی شارستانیەتی عەرەبیدا دەخاتە وەرزی پایز و زستان، کە ئەمە بریتیە لە قۆناغی دارمان و لەناوچوون واتە بێلایەن نەبووە لەم لایەنەدا[٩٧].

٧- مافێکی ڕۆژئاواییەکانە گەر شپنگلەریان بە فەیلەسووفی ڕەشبین ناوناوە، چونکە پێشبینی ڕووخانی شارستانیەتەکەیانی کردووە، پێیانی گەیاندووە کە شارستانیەتەکیان بەر لە حەوت سەدە لەناو چووە و کۆتایی پێهاتووە[٩٨].

**دەرئەنجام:**

لەماوەی نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا و گەڕان بەدوای دەربڕین و بیرەکانی فەیلەسوفی ئەڵمانی ئۆسواڵد شپنگلەر دەرکەوت کەوا:

١- لە سەربووردەی ژیانی بۆمان دەرکەوت کە ژیانێکی کولە مەرگی هەبووە، سەرەڕای بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا و نووسینی چەندان کتێب و بابەت لەگۆڤارەکان، بەڵام ژیانێکی ناخۆشی گوزەراندووە.

٢- شپنگلەر لەدەربڕینەکانی شتێکی نوێی هێنایە ئاراوە لە پرسەکانی بۆ فەلسەفەی مێژوو، وەنەبێ ئەو پرسە تەنها ئەو ورووژاندبێتی و سوودی لەکەس وەرنەگرتبێت، بەڵکو بەر لەئەو بوونی هەبووە و خۆی ئاماژە بەوە دەکات کەوا کاریگەری نیتشە و گۆتە و هیگڵی بەسەرەوە هەبووە، بەڵام دەربڕینەکانی ئەو لە فۆڕمێکی جیاواز وێنەی مێژوو و شارستانیەتی کێشاوە چونکە لەو سەردەمە ژیاوە و کاریگەری کۆمەڵگە و بارودۆخی بەسەرەوە بووە.

٣- شپنگلەر شارستانیەت بە یەکەی توێژینەوەی مێژوویی دادەنێت، وە هەروەها شارستانیەت بە هەبوویەکی زیندوو دەچوێنێت، کە چۆن سەرەتا لەدایك دەبێت و پاشان پێگەیشتن و مردنی، یا شارستانیەت وەك وەرزەکانی ساڵ دادەنێت، کە چۆن هەر ساڵێك بە چوار وەرز گوزەر دەکات شارستانیەتیش

ئاوا بە چوار وەرز گوزەر دەکات، کە لەدایکبوونی بە بەهار دەچوێنێ، پێگەیشتنی بە هاوین، وە گەروەبوونی بە پایز و پیربوونی بە زستان.

٤- بە درێژی باسی لە چوار شارستانیەت کردووە کە شارستانیەتی ( هیندی و کلاسیکی و عەرەبی و ڕۆژئاوا ) یە، هاتووە لە هەریەك لەم شارستانیەتانە وەرزەکانی سالّی بۆ دیاری کردووە کە ئەم شارستانیەتانە گوزەری پێدا کردووە، واتە بە بڕوای ئەو هیچ شارستانیەتێك تا سەر نامێنێتەوە بەڵکو کۆتایی پێدێت ڕۆژێك لە ڕۆژان.

٥- داهێنانی ڕێبازی هاوچەرخێتی فەلسەفی یەکێکە لە بەرنامە گرینگ و بەسوودەکان، لێکۆڵەری مێژوویی سوودێکی زۆری لێوەردەگرێت، بۆ باس و خواسەکانی ڕابردوو وە ئەوەی لە داهاتوودا ڕوودەدات.

٦- ڕەخنەی زۆر ئاراستەی مێژوونووسانی ڕۆژئاوا دەکات لەمەڕ هەندێ پرسی وەك: دانانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بە سەنتەری هەموو شارستانیەتەکانی تر و خولانەوەی شارستانیەتەکانی تر بەدەوری ئەم شارستانیەتە، وە هەروەها دابەشکردنی مێژوویان بۆ کۆن و ناوەڕاست و نوێ، وە ئەوەیان سەپاندووە بەسەر گشت شارستانیەتەکانی تردا و لە گرینگی و گەورەیی ئەو شارستانیەتانەیان کەمکردۆتەوە.

٧- شپنگلەر بیرۆکەی کارلیکردن و کارتێکردنی نێوان شارستانیەتەکان ڕەت دەکاتەوە و بە شتێکی حەتمی دادەنێت.

## لیستی سەرچاوەکان


- سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:

١. أحمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، دارالنهظةللطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٥.

٢. أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية، ت.احمد الشيباني، دارالحياة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٦٤.

٣. ايمري نف: المؤرخون وروح الشعر، ت: توفيق اسكندر، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٦١.

٤. رأفت الشيخ: تفسير مسار التاريخ (نظريات في فلسفة التاريخ)، مركز عين للدراسات والبحوث الإنسانية، قاهرة، ٢٠٠٠.

٥. عبالرحمن بدوى: اشبنجلر، دارالقلم، بيروت، ١٩٨٢

٦. فرحان جلوب: الفيلسوف والتاريخ (نمازج من التأويل الفلسفى للتاريخ)، منشورات مكتبه بسام، موصل، ١٩٨٧.

٧. كولن ولسن: سقوط الحظارة، ت: أنيس زكي حسن، دارالعلم، بيروت، ١٩٧١.

٨. مصطفى حسن النشار: فلسفة التاريخ(معناها ونشأتها وأهم مذاهبها)، دارالمسيرة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٢.

٩. مفيد كاصد الزيدي: المدخل الى فلسفة التاريخ، دارالمناهج للنشر، عمان، طبعة الأولى، ٢٠٠٦.

١٠. هاشم يحيى الملاح وآخرون: دراسات فى فلسفة التاريخ، دارالكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٨.

١١. هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ (دراسة التحليلية في فلسفة التاريخ التأملية والنقدية)، دارالكتب العلمية، بيروت–لبنان، ٢٠٠٧.

- سەرچاوەکان بە زمانی کوردی:

١٢– ئیزاك ئاسیمۆف و فرانك وایت، مێژووی شارستانییەت، وەرگێڕانی حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣.

١٣– عەبدولحسەین زەرینکوب: مێژوو لەتەرازوودا (فەلسەفەو لۆجیکی مێژوو)، وەرگێڕانی د.قادر محەمەد حەسەن و سۆران بهاء ئەحمەد، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

١٤– مەریوان عەبدول: فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٩.

- گۆڤارەکان بەزمانی عەرەبی:

١٥- حسين مؤنس: التاريخ والمؤرخون، مجلة عالم الفكر، المجلد الخامس، عدد١، كويت، ١٩٧٤.

١٦- عبدالعزيزالدوري، فلسفة التاريخ، مجلة عالم الفكر، المجلد الثاني، العدد الثاني، وزارة الاعلام، كويت، ١٩٧١.

- گۆڤارەکان بەزمانی کوردی:

١٧- جوامێر محەمەد: ڕاڤەی شارستانیەکانی مێژوو، گۆڤاری مێژوو، ژمارە١٠، هەولێر، ٢٠٠٩.

١٩- دلشاد مەحمود عبدالرحمن: شپنگلەوڕاڤەی بایلۆژییانەی شارستانییەت، گۆڤاری هزرین، ژمارە ١، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٠- محەمەد تەها: شپنگلەر و شارستانیەت، گۆڤاری مێرگ، گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنبیرییە دەزگای مێرگ دەریدەکات، هەولێر، ژمارە ٤٥.

٢١. محسن محمد حسین، فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا – تایبەتێتی زیندوویی شارستانییەکان لای شپنگلەر، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٤، بغداد، ١٩٨٩.


---

[١]- عبالرحمن بدوي: اشبنجلر، دارالقلم، بيروت، ١٩٨٢، ص٣٠٧ .

[٢]-رأفت الشيخ: تفسير مسار التاريخ (نظريات في فلسفة التاريخ)، مركز عين للدراسات والبحوث الإنسانية، قاهرة، ٢٠٠٠، ص١٨٧.

[٣]- مەریوان عەبدول: فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٢.

[٤]- أسوالد اشبنغلر: تدهورالحظارة الغربية، ت.احمد الشيباني، الجزء الأول، دارالحياة للطباعة والنشر، بيروت١٩٦٤، ص٨.

[٥]- هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ (دراسة التحليلية في فلسفة التاريخ التأملية والنقدية)، دارالكتب العلمية، بيروت–لبنان، ٢٠٠٧، ص٣٥٩.

[٦]- دلشاد مەحمود عبدالرحمن: شپنگلەوڕاڤەی بایلۆژییانەی شارستانییەت، گۆڤاری هزرین، ژمارە١، هەولێر ٢٠٠٥، ل٨٩.

٧- هاشم يحيى الملاح، المفصل في فلسفة التاريخ، ص٣٥٩-٣٦٠.

٨- نفس المصدر، ص٣٥٩.

٩- أحمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، دارالنهظةللطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٥، ص٢٤٣ .

١٠- عبالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص٣٠٨.

١١- نفس المصدر ص٣٠٨.

[١٢]- محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا (تایبەتێتی زیندوویی شارستانییەکان لای شپنگلەر)، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٤، بغداد، ١٩٨٩، ل٢٣.

[١٣]- ایمري نف: المؤرخون وروح الشعر، ت: توفيق اسكندر، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٦١، ص٢٦٩.

[١٤]- هاشم يحيى الملاح وآخرون: دراسات في فلسفة التاريخ، دارالكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٨، ص٢٠٠.

[١٥]- عبالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص٣٠٩.

[١٦]- أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية، ج١، ص٣٩ .

[١٧]- كولن ولسن: سقوط الحضارة، ت:أنيس زكي حسن، دارالعلم، بيروت، ١٩٧١، ص١٢٦-١٢٧.

[١٨]- كولن ولسن: سقوط الحضارة، ص١٢٨.

[١٩] - هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، ص٣٦١.

[٢٠]- عبالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص٣٠٩.

[٢١]- دلشاد مەحمود عبدالرحمن: شپنگلەورواڤەی بایلۆژیانەی شارستانییەت، ل٩٠.

٢٢- هاشم يحيى الملاح: مصدر السابق ص٣٦١.

٢٣- عەبدولحسەین زەرینکوب: مێژوو لەتەرازوودا (فەلسەفەو لۆجیکی مێژوو)، وەرگێڕانی. قادر محەمەد حەسەن و سۆران بهاء ئەحمەد، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٣٨٧.

٢٤- هاشم يحيى الملاح: مصدر السابق، ص٣٦٢.

٢٥- فرحـــان جلـــوب: الفيلـــسوف والتـــاريخ(نمـــازج مـــن التأويـــل الفلـــسفي للتـــاريخ)، منشورات مكتبة بسام، موصل، ١٩٨٧، ص٤٣.

٢٦- عبالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص٣١٠-٣١١.

٢٧- المصدر نفسه ، ص٣١٤.

٢٨- فرحان جلوب: مصدر السابق، ص٤٣.

٢٩- عبالرحمن بدوي: مصدر السابق، ص٣١٥.

٣٠- رأفت الشيخ: تفسير مسار التاريخ(نظريات في فلسفة التاريخ)، ص١٨٧.

٣١- عبالرحمن بدوي: مصدر السابق، ص٣١٦.

[٣٢]- عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص٤٨.

[٣٣]- محـــسن محمـــد حـــسێن: فەلـــسەفەی سرووشـــتی لەلێكدانـــەوەی مێـــژوودا لای شپنگلەر، ل٢٤.

[٣٤]- عبدالرحمن بدوي: مصدر السابق، ص٢٥٨.

[٣٥]- مەریوان عەبدول: فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر، ل٥٤.

٣٦- عەبدولحسەین زەرینكوب: مێژوو لەتەرازوودا، ل٣٨٩.

٣٧- عبدالعزيزالـــدوري: فلـــسفة التـــاريخ، مجلـــة عـــالم الفكـــر، المجلـــد الثـــاني، العـــدد الثاني، وزارة الاعلام، كويت، ١٩٧١، ص٧٧.

* ئەستێرەناســـی پۆڵنیـــایی (نیكـــۆلا كۆپـــەرنیك) (١٤٧٣-١٥٤٣)، ڕایگەیانـــد كـــە زەوی و ئەســـتێرەكان بـــەدەوری خـــۆردا دەســـوڕێنەوە كـــە ئەمـــەش پێـــچەوانەی بـــیردۆزی بـــەتلیمۆس و ئەســـتێرە ناســـانی یۆنانـــە كـــە دەیـــانوت زەوی ناوەنـــدی گەردوونـــە (( ئیـــزاك ئاســـیمۆف و فرانـــك وایـــت، مێـــژووی شارســـتانییەت، وەرگێڕانـــی حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٠٧)).

٣٨- محـــسن محمـــد حـــسێن: فەلـــسەفەی سرووشـــتی لەلێكدانـــەوەی مێـــژوودا لای شپنگلەر، ل٢٤.

٣٩- هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، ص٣٦٣.

٤٠- مـــصطفى حـــسن النـــشار: فلـــسفة التـــاريخ(معناهـــا ونـــشأتها وأهـــم مـــذاهبها)، دارالمسيرة للنشر والتوزيع، عمان،٢٠١٢، ص٢٣٢.

٤١- عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص٥٩-٦٠.

٤٢- عبدالعزيزالدوري: فلسفة التاريخ، مجلة عالم الفكر، ص٧٨.

٤٣- فرحان جلوب: الفيلسوف والتاريخ، ص٤٩.

[٤٤]- هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ ، ص٣٧٢

[٤٥]- عبدالعزيزالدوري: فلسفة التاريخ، مجلة عالم الفكر، ص٧٧.

[٤٦]- محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا لای شپنگلەر)، ل٣١.

[٤٧]- احمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٥٠.

[٤٨]- سەلمان نادر: لە ڕوانگەی فەلسەفەی مێژووەوە چوون بۆ ناو مێژوو، گۆڤاری هەژان (گۆڤارێکی فیکری وەرزییە)، هەولێر، ژمارە ٢٣، ٢٠١٠، ل٤٠.

[٤٩]- هاشم يحيى الملاح وآخرون: دراسات في فلسفة التاريخ، ص٢٠٥.

[٥٠]- عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص ١٠٤.

[٥١]- المصدر نفسه ، ص١٠٥.

[٥٢]- جوامێر محەمەد: ڕاڤەی شارستانیەکانی مێژوو، گۆڤاری مێژوو، ژمارە١٠، هەولێر٢٠٠٩، ل٢٣٩.

[٥٣]- سەلمان نادر: لە ڕوانگەی فەلسەفەی مێژووەوە چوون بۆ ناو مێژوو، ل٤٠.

[٥٤]- عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص ١٠٢.

[٥٥]- محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا لای شپنگلەر، ل٣١.

* لای شپنگلەر شارستانیەتی عەرەبی پێکهاتووە لە شارستانیەتەکانی (جولەکە و مەسیحی کۆن و ئارامی و بیزەنتیەکان و ئێرانیەکان((هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ ، ص٣٧٠)). وە سەبارەت بە شارستانیەتی عەرەبی باشتر وایە دەستەواژەی شارستانیەتی ئیسلامی بەکاربێنین، بەڵام بەکارهێنانی لای شپنگلەر بەم شێوەیە، بۆیە ئاوا بەکارم هێنایەوە.

[٥٦]- أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية، جزء الثاني، (الجداول الملحقة).

[٥٧]- هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، ص٣٧٨.

[٥٨]– أسوالد اشبنغلر: مصدر السابق، الجزء الثاني، (الجداول الملحقة).

[٥٩]– سەلمان نادر: لەڕووانگەی فەلسەفەی مێژووەوە چوون بۆناو مێژوو، ل٤٠.

[٦٠]– دلشاد مەحمود: شپنگلەرورافەی بایلۆژییانەی شارستانییەت، ل٩٥.

[٦١]– عبدالعزيزالدوری: فلسفه التاريخ، مجلة عالم الفكر، ص٧٨.

[٦٢]– عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص ١٠١.

[٦٣]– أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية، الجزء الثاني، (الجداول الملاحقة).

[٦٤]– هاشم يحيى الملاح وآخرون: دراسات فی فلسفة التاريخ، ص٢٠٦.

[٦٥]– أسوالد اشبنغلر: مصدر السابق، (الجدول الملاحقة).

[٦٦]– عبدالعزيزالدوري: فلسفة التاريخ، مجلة عالم الفكر، ص٧٧.

[٦٧]– احمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٥٠.

[٦٨]– أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية ، الجزء الثاني، (الجدول الملحقة).

[٦٩]– المصدر نفسه (الجدول الملحقة).

[٧٠]– هاشم يحيى الملاح وآخرون: دراسات فی فلسفة التاريخ، ص٢٠٧.

[٧١] – محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوولای شپنگلەر، ل٣٢.

[٧٢] – عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص ١٠٥.

[٧٣] – المصدر نفسه، ص٨٢.

[٧٤] – أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية، الجزء الثاني، (الجدول الملاحق).

[٧٥]– أسوالد اشبنغلر: تدهورالحضارة الغربية، الجزء الثاني، (الجدول الملاحق).

[٧٦]– هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، ص٣٧٩.

[٧٧]– المصدر نفسه ص٣٧٩.

٧٨– عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص١١٢.

٧٩– المصدر نفسه ص١١٢.

٨٠– محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا لای شپنگلەر، ل٣٢.

٨١– عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص ١١٢.

٨٢- احمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٥٣.

[٨٣]- محسن محمد حسين: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

٨٤- عبدالرحمن بدوي: اشبنجلر، ص ١١٣-١١٤ .

٨٥- مفيد كاصد الزيدي: المدخل الى فلسفة التاريخ، دارالمناهج للنشر، عمان، طبعة الأولى، ٢٠٠٦، ص١١٣.

٨٦- احمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٥٣-٢٥٤.

[٨٧] - عبدالرحمن بدوي، اشبنجلر، ، ص ١٠٥.

[٨٨] - احمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٥٠-٢٥١.

[٨٩] - محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا لای شپنگلەر، ل٣٤-٣٥.

[٩٠] - محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا لای شپنگلەر، ل٣٥.

[٩١]- محسن محمد حسين: فەلسەفەی سرووشتی لەلێکدانەوەی مێژوودا لای شپنگلەر، ل٣٦.

[٩٢]- حسين مؤنس: التاريخ والمؤرخون، مجلة عالم الفكر، المجلد الخامس، عدد١، كويت، ١٩٧٤، ص١٠٥.

[٩٣]- هاشم يحيى الملاح: المفصل في فلسفة التاريخ، ص٣٧٩.

[٩٤]- ايمري نف: المؤرخون وروح الشعر، ص٢٧٢.

[٩٥]- مصطفى حسن النشار: فلسفة التاريخ، ص٢٤٥.

[٩٦]- دلشاد مەحمود: شپنگلەروراڤەی بایلۆژییانەی شارستانییەت، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.

[٩٧]- هاشم يحيى الملاح وآخرون: دراسات فى فلسفة التاريخ، ص٢١٠.

[٩٨] - احمد محمود صبحي: في فلسفة التاريخ، ص٢٥٠-٢٥١.

# خوایە لە دۆستانم بپارێزی دوژمنانم لەسەر خۆم

د.حسن جاف

بەڕێز د.بەهرۆز جاف خاوەنی بڕوانامەی (دکتۆرا) لە بواری (مایکرۆ بایۆلۆجی) گەردیدا لە زانکۆی بەغداو بەرپرسی بەشی ڕۆشنبیری سەنتەری ڕوناکبیری ئێل بەگی جاف، بڕیاری داوە بێتە گۆڕەپانی مێژووەوەو ئەم سەرەو ژورکە پڕ لە پێچو هەورازی دژوارەی هەڵبژاردووەو لە دیمانەکەیدا لەگەڵ گۆڤاری (گەڕان)دا ژ(٩) ڕێکەوتی (١٠ی کانونی دووەمی ٢٠١٢) و ژ(١٠، ١٧) شوباتی ٢٠١٢، قەڵای شێروانەو مێژووی ئەم قەڵایەو خاوەنەکەی کردوەتە کەرەسەی لێداوانەکەی، جەختی لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە کردووە:

١- مێژووی دروستکردنی قەڵای شێروانە زۆر کۆنەو ساسانیەکان لەسەردەمی نەوشیروانیدا نەوشیروانی یەکەم یا دووەم دروستیان کردووە.

٢- شێروانە هەر ئەو قەڵایەیە کە بە سیروان ناوبانگی دەرکردووە کە لە نێوان (حلوان) و شارەزوور دایە، وە ئەمەیشە خۆی واتەنی غەڵەت قەبوڵ ناکات...؟ قەڵاکە لەسەر ڕوباری سیروانە یان گەرمیان دەگرێتەوە وشەی گەرمیان لە تەئریخی ئیبن کەسیرو ئیبن خەلدوون دا بەرچاو ناکەوێت بەڵام ناوچەی سیروان هەبووە.

٣- بەپێی دراسەتێك کە کردویەتی قەڵای باکورا(بنکورەی) ئێستایە و سامەغان شارەزوری ئێستایە و ئەویش لە مێژوودا پێی دەوترێت شارەزور قەرەداغی ئێستایە، سامەغان میوانی ئەمڕۆیە، ناحیەی بەلوك واتە بەڕوو

(عەرەبیش پێی دەڵێ –برنوك– واتە بەڕوو، (بەرلوتی) ئێستایە، بەرلووتا کە موهەلهەل پاشەکشێی بۆ کردووە (بەرلوتی) ئێستایە، بەرلووتا کە موهەلهەل بەوێدا ڕۆیشتوە لە نێوان شارەزورو قەڵای شێروانەیە کەواتە قەڵای شێروانەش هەر قەڵای شێروانەیە وە هیچ گومانی تێدانیە...؟

٤– لە وەڵامی پرسیاری دیمانەکەرەکەدا ئەم قەڵای شێروانە بۆ بووە بە قەڵای شێروانە؟ دەڵێن لەبەر ئەوەی ڕوبارێك هەیە کە ناوی (سیروانە)و ناوچەکەش لەو سەردەمەدا ناوی سیروان بووە کەواتە قەڵاکەش ناوی سیروان دەبێت: وە چۆن لە زمانی عەرەبیدا شتێك هەیە پێی دەوترێت (تصحیف لسان) واتە گۆڕینی وشە پێم وایە... کە سیروان تەعریبی وشەی (شێروان)ە.

٥– لە ویلایەتی سیرەت لە کوردستانی باکور قەڵایەك هەیە ناوی شێروانەیە ئەوان پێی دەڵێن (شیرڤان قەلاسی)و ناوێکی تریشی هەیە پێی دەوترێت (کوفری قەلاسی) کوفری لە وشەی کوفرەوە هاتووە عەرەب و فارس پێی ئەڵێن کوفر کورد پێی ئەڵێت (کفر) لێرەدا ئاخاوتنێکی کوردییە بۆ وشەی کوفر چونکە هەمان ناو هەمان واتای هەیەو لە سیرەت هەر گەڕەکەکەش هەر ناوی کوفرییە لە پاکستانیش شارێك هەیە بەناوی کوفری چونکە بە لەفزی (ئۆردۆ) بە کوفر هەر ئەڵێن کوفر و کفرییەکەی خۆشمان لە گەرمیان عەرەب و تورکمان پێی ئەڵێت کوفری و من بڕوام وایە کە ئەم کفریەی خۆمان هاوشێوەی کوفرییەکەی سیرەت بێت(١)، وەك چۆن کوفری قەڵای شێروان هەیە لە سیرەت، ئاواش لێرە کفری قەڵای شێروانە هەیە، هەرچەندە ئەمە ئیشی زۆری ئەوێ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی زیاتر هەیە، لە لایەن شوێنەوارناس و مێژوونوسەکانەوە، بەندە لێرەدا ئەم تێهەڵکێش دەکەم و دەڵێم بە بۆچوونی من لەم بارەوە هەرگیز پێویستیەك بەدواداچونی شوێنەوارناسان و مێژوونوسان

ناکات چونکە بەڕێزت وەك مێژوونوسێکی لێهاتوو بابەتەکەت یەکلاکردۆتەوەو ئیتر ئیحتیاج بە زەحمەتی مێژوونوسانی تر ناکات، هەروەها لە لایەن خۆمەوە کە پەیوەندیەکی پتەوم لەگەڵ خەڵکی بە شەرەفی کفریدا هەیە مژدەیان دەدەمێ کە ناوی شارەکەیان ئاشکرابو ئیتر پێویستی لەم بارەوە بەدواداچوندا نییە، کێشەکە کۆتایی پێهاتووە، دەفەرموێ.

٦- هەروەها قەڵای سیرت شێوەی تەلار سازیەکەی ساسانیە بەڵام قەڵای شێروانەی کەلار شێوەی تەلارسازیەکەی مەغوولیە...؟و قەڵای شێروانە دوای سەدەی حەڤدە دروستکراوە ئەم شێوازی مەغۆلییە ڕەهەندە کاتیەکەی سەدەی پانزە لە هندستان لە سەدەی حەڤدە دەگاتە ئەسفەهان، بۆیە دوای سەدەی حەڤدە دەگاتە کوردستان و کەلار، دەستخۆش ئافەرین دۆزیتەوە.

ئەمە پوختەی دیمانەکەی بەشی یەکەمی بەڕێز د.بەهرۆز کە بە زەحمەتێکی فراوانەوە توانیم چوارچێوەیەك بۆ بۆچوونە پڕ لە هەڵەکانی دابنێم لە بەشی دووەمی دیمانەکەیدا.

چەند گوڵێکی تری بە ئاوداداوەو دەفەرموێ قەڵای شێروانە حەمە پاشا دروستی نەکردووە بەڵکو پێی بەخشراوە، عوسمانی و فارسەکان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی بە زەبری هێزی جافەکان کۆتایی بە بابانیەکان بێنن بەپێی ڕێکەوتن نامەی ئەرز روم پاراستنی ئاسایشی سنورەکان بە جاف سپێردراوە، ئەمەش پوختەی بەشی دووەمی دیمانەکەیەتی:

بە ڕاستی کە دیمانەکەییم خوێندەوە بەزەییم بە زانستی مێژوودا هاتەوە کە هەر کەسێك هەندێ زانیاری لەم لاو لەو لاوە سەبارەت بە بابەتێکی مێژوویی بێ بەڵگەو بنەمایەکی زانستی کۆدەکاتەوە، بە پەلە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوی دەکاتەوە، گومان لەوەدانیە ئەم جۆرە نوسراوانە لە ئایندەدا دەبێتە هۆی

چەواشـــەکردنی مێـــژووی میللەتەکـــەمان وە سەرلێـــشێوانی نـــەوەکانمانی لێدەکەوێتەوە، ئەمەش دەستدرێژییەکی ناڕەوایە بۆ سەر مێژووی ئەم نەتەوەیە.

بـۆم ڕوون بـۆوە هێـشتا زۆرمـان مـاوە تـا بتـوانین خۆمـان لـە بـیرو عـەقڵی کـشتوکاڵی ڕزگارکـەین و هـەواو هەوەسـی بۆچـوونە خێڵەکیـەکان و هـەروەها سەروەری و چینایەتی بخەینە لاوە وەك لێزانێکی پابەنـد بـە مەرجـەکانی دنیـای ئەکادیمی و توێژینەوەی زانستی لە باسێك بدوێن یان تەرازوو بگرین بەدەستەوەو کـەیل و کێشانەکان لـە ویـژدان دور نەخەینـەو ئـەم دەم هـەڵی سـەنگێنین، پـێم سەیرە بەم شێوەیە ڕەواج بە (هەرکەس بۆ خۆی)یە، کەی وەردەچـەرخێینە لای لۆژیك و دونیای حەقیقەتدا..؟ لەم بازاڕە ئاشوفتەدا هەر کەسێك لـە ڕووی هـەوا هەوەسێکی بـێ بنـەماو لـە پـسپۆڕی لـە بوارێکدا لـە شـاهووە دەیبـا بـۆ پـاهو، بەداخەوە لە تەواوی بوارەکاندا ئاشوفتە بازاڕی لە دونیای ڕێکلام، ڕۆژنامەگەری، مێوونووسـین، ئـەدەبیات و سیەسـەت و تـەواوی بوارەکـانی تریدایـە بـە زەقـی نمایانە... گەلانی تر بەم قۆناغەیدا گـوزەراون بـەڵام گـورج و گـۆڵانـە زامـەکانیان تیمار کردووە ئیدی هەنگاویان ناوە بەرەو دونیای پێگەیشتو وە تێگەیشتوو تـر. دژوارو پـڕ لـە نـشێو و فـرازەوە کـە سوارچـاکی خـۆی دەوێ وابـزانم بـەڕێزی چاکسواری ئەم مەیدانە نییە.

بێگومان نووسین لەسەر هەر بابەتێکی مێژوویی ڕامیاری کۆمەڵایەتی ئەدەبی، پێویـستی بـە چـەند هـەنگاوێکی گەڕانـەوە بـەرەو دواوە هەیـە، بـۆ بنەوانـەیی بابەتەکەو .. مێژوو و بەڵگەیی باوەڕپێکراوی نوسراو یا بۆچـوونی لەگـەڵ عەقڵدا گونجاوی مێژوونوسە جێی موتمانەکان و شوێنەوارناسـە شـارەزاکان کـە ژیانیـان لەم بوارەدا بردووەتەسەر.

لەو بڕوایەدام بەڕێز د.بەهرۆز کە ئیختساسەکەی لە مێژووەوە یەکجار دوورە بەوپەڕی ساکارییەوە هاتووەتە ئەم مەیدانە پڕ لە نەشیو خوازەو کە سوارچاکی خۆی دەوێ وابزانم بەڕێزی چاکسواری ئەم مەیدانەیە نییە.

دونیای د.بەهرۆز لە دیمانەکەیدا بۆچوون و گریمانەی (فەرەزیاتی) زۆری خستۆتە ڕوو، وە لەسەر بنەمای ئەم گریمانانەو(فەرەزیاتانە) چەند گریمانەیەکی تری دامەزراندووە ئەویش ئەگەر هات و توێژەرێك لەسەر بنەمایەکی زانستی ڕاست گریمانەیەکی سەلماند بەهیچ جۆرێك ناگونجێت و ئەوە ناگەیەنێت ئەم گریمانە بکاتە بنەمایەك بۆ گریمانەکانی تر چونکە گریمانە (فەرەزییە) ئیحتمالی ڕاست و هەڵەی تێدایە چۆن دەبێت وەکو حەقیقەتێکی پتەو و سەقامگیر بژمێردرێت، هەتا بەسەریەوە شت دروست بکرێ بۆچوونی مێژوویی لەسەر دابنرێت، وەکو بەڕێزی لەم دیمانەدا ئەنجامی داوەو پەیڕەوی کردووە.

پێش ئەوەی بێینە سەر هەڵەکانی، ئەمەوێت بەم پرسیارەوە بچمە نێو نوسراوەکەمەوە: ئایە قەلای شێروانە کۆنە وەکو بەڕێزی دەفەرموێ بۆ سەردەمی ساسانیەکان دەگەڕێتەوە...؟

یا وەك نوێیەو لە لایەن حەمە پاشای جافەوە دروست کراوە؟

وەلامی ئەم پرسیارە بە بۆچوونی من سادەو ساکارو ڕوونە ئەگەر ئەم قەلایە پێش ساڵی ١٨٦٦ زاینی کە لە لایەن مێژوونوسان و بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارەکانی بەغداو سلێمانی و گەریمانەوە دەستنیشان کراوە[1]، لەسەر ئەو تەپەدا بووبێ ئەو ساتە دەڵێین حەمە پاشا فری بەسەر دروستکردنی ئەم قەلاوە نەبوەو نییە... بەلام ئەگەر ئەم قەلایە لە پێش ئەم مێژووەوە نەبینرا بێ ئەوەی خاوەنەکەی ڕوون و ئاشکرایە جێی کێشمەکێش و ململانێ و قسە بە زۆران دانی تێدا نابێتەوە بەڕێزی لە وەلامی پرسیارێکی زیرەکانەی (ڕێبین تەها) ڕیپۆرتەری

گۆڤاری گەڕان کە لێی پرسیوە باشە دکتۆر مستر ریچ لە ساڵی ١٨٢٠دا سەردانی ناوچەکەی کردووە لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێت تەنیا تەپۆلکەیەك هەبوە بە ناوی تەپۆلکەی شێروانە، نەك قەڵا...د.بەهرۆز دەفەرموێ ئاساییە مومکینە تەپۆلکە بێت و قەڵاکەیشی لەسەر بێت و زیاتر بە تەپۆلکە ناسراوبێتەوە.

د.ریچ لەوبەری سیروانەوە کە دوورە لە قەڵاکەوە سەیری کردووە (ئەکرێ) وەك قەڵایەکی گەورە نەیبینێ بێ و بە تەپۆلکە باسی کردووە، خوێنەری بەڕێز سەیری ئەم گریمانە سەمەرەیە بکەن بەڕێزی وشەی (مومکینە) (ئەکرێ) بەکاردێنێت ئەم گریمانەیە کە بە وشەی ئەکرێو مومکینە ڕازاوەتەوە لە حەقیقەتەوە دوورە چونکە لە زانستی مێژوودا وشەی مومکینە، و ئەکرێ جێی نابێتەوە چونکە مێژوو زانستە و زانستی مێژوو بە شوێن حەقیقەتدا گەڕانەو حەقیقەتیش جێی گومانی تێدانیە مومکین و ئەکرێ جێی گومان و سەرسوڕمانە حەقیقەتەکەیش لەوەدایە (کلودیوس جیمس ریچ) کە شوێنەوارناسێکی زیرەك و هۆشیارو وردەکار بووە بەتایبەت بە شوێن ئاسەواری ساسانیەکاندا گەڕاوە، لە گەشتەکەیدا ساڵی ١٨٢٠ز بۆ سلێمانی پایتەختی میرنشینی بابان لەسەر بانگهێشتی مەحمود پاشای بابان لە نزیك ئەسکی کفرییەوە سێ ڕۆژ کاروانەکەی ڕادەگرێت و بەرەو کفری مل دەنێت چونکە بیستبوی چەند ئاسەوارێکی کۆن لە کفریدا هەیەو دوای بینینی ئەو شوێنەوارانە دەڵێت لەو بڕوایەدام کە زۆربەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان[٣].

ئایە دەگونجێ ئاسەوارناسێکی وردەکاری وەك (کلۆدیس ریچ) بێتە نزیك قەڵایەکی وەها گەورەو دیاری لە ناوچەکەدا کە لە هەموو شوێنێکی ئەو بەر سیروانەوە بە ئاسانی دەبینرێت نەیەت بۆ بینینی ئەو ساتە ئەم وەڵامەی د.بەهرۆز دەسەلمێنین.

ئەگەر بۆمان بە دیکۆمێنتەوە ڕوونی بکاتەوە کە کلۆدیۆس ڕچ چاوی کزبووە یا وەك چاوی تووشی نەخۆشی ئاوی سپی بووە بۆیە ئەم قەڵایەی نەبینیوە وەك تەپۆلکە هاتۆتە بەرچاوی وە بە تەپۆلکە ناوی هێناوە. ئەم گریمانەیە فەرزێکی مەحاڵە و بە پێچەوانەی حەقیقەتەکەیە کە ئەم قەڵایە لە سەردەمی ئەودا و جودی نەبووەو دوای ئەو دروست کراوە ریچ لە سەردەمی کەیخوسرەو بەگی باوکی حەمە پاشادا ساڵی ١٨٢٠ گەشتەکەی کردووەو لە شاری سلێمانی و دەوروبەری (گۆولی زریوار) ئەو زاتەی بینیوە وەسف و ستایشی کردووە بۆ زانیاری پتری بەڕێزتان ریچ عاشقی ئاسەوارەکانی ئێران، بەتایبەتی دەورەی هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانیەکان بووە، وە ئەم خولیایەی بوەتە هۆی سەرتیاچوونی چونکە لە سەردانەکەیدا بۆ بینینی شوێنەوارەکانی تەختی جەمشید نزیك لە شاری شیراز نەخۆشی ڕشانەوە لەو شارەدا بڵاوبۆوە ئەویش لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە چونکە کەمێك لە زانستی پزیشکی دەزانی ڕووی کردە شیرازو چووە هانای توشبوانی ئەو نەخۆشیەوە خۆیشی هەر بەو نەخۆشییە لەو شارەدا کۆچی دوایی کرد.

شایەتێکی ترمانیش لەم بابەتەدا هەیە ئەویش مێژوونوس (عثمان بن سند البصری)یە، لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (مطالع السعود بطیب أخبار الوالي داود) لە لاپەڕەی (٤٧٧)ی کتێبەکەیدا[٤] لە ڕوداوەکانی ساڵی ١٢٣٦ك/١٨٢٠زاینی، ئاماژەی بە تەپەی شێروانە کردووە، وە ئاماژەی بە قەڵایەك بەسەر ئەو تەپەوە نەکردووە، لەو بڕوایەدام د.بەهرۆز و هاوڕێکانی بێ ئەم لاو ئەو لا دەڵێن عوسمانی کوڕی سەنەدیش کوێرایی داهاتبوو مومکینە چاوی تووشی نەخۆشی ئاوی ڕەش هاتبێت بۆیە نەیتوانیوە قەڵاکە بەو گەورەییە بەدی بکات.

جگە لەم دوو بەڵگە ڕوونانە کە خرایەڕوو لـە سـەردەمی هێرشـەکەی هۆلاکـۆ (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) وە تــەیموری لەنگــدا (٧٩٥ك/١٣٩٣ز)، بــۆ داگیرکردنــی بەغـدا(حـەلوانیان) داگیرکردبـو وە لەشـکرەکەیان لـەو ناوچـانەدا بڵاوبووبونـەوە بەڵام باسێك لەم قەڵایە نەکراوە[٥].

لە یادمە سەرگەرمی وەڵامێکی نوسەرێك بووم کە سەبارەت بە قەڵای شێروانە لـە یـەکێ لـە ڕۆژنامـەکانی سـلێمانیدا بـڵاوی کردبـۆوە ئـەو نوسـراوەم پـێش بڵاوبوونەوەی بۆ خوالێخۆشبووان مەسعود محەمـەدو شـوکور مـستەفا لـە مـاڵی خۆمدا لە بەغـدا خوێنـدەوە بەهەشـتی مەسـعود محەمـەد فـەرمووی ئـەم جـۆرە نوسەرانە نەخۆشی دەروونین، من لە کتێبی (حەمە ئاغـای گـەورەدا)[٦]، باسـیانم کردووە، کاك حەسەن خۆت عەزیەت مەدە خوا شـاهیدە سـەد بەڵگـەی عـەقڵی و نـەقلیان بـۆ بێنیتـەوە هـەر لەسـەر قـسەکانی خۆیـان دەڕۆن و هـەر ئـەو قەوانـە لێدەدەنەوە، هـەرگیز ئامـادەنین ئـەم حەقیقەتـە ڕوونـە بـسەلمێنن کـە مێـژووی میللەتەکەمان ئەم سەرکردەو سەردارانە دروستیان کردووە چـونکە لـە شـورەتی پیاو ماقولان و دەستڕۆیشتوان و سەردارانی چینی دەستڕۆیشتوی میللەتەکـەیان ڕکیان دەبێتەوەو لایان تفت و تاڵە.

جگە لەم حەقیقەتە مێژوویانەی کە خرانەڕوو جێی خۆیـەتی ئامـاژە بـە نـاوی ئـەم مێژوونوسـانە بکـەم کـە سـەبارەت بـەم قەڵایـە دوان و گەڕاندویانەتـەوە بـۆ سەدەی نۆزدەهەم و بەڕاشکاوی جەختیان لەسەر ئەم حەقیقەتە کردووە کە ئەم قەڵایە دەستکردی حەمە پاشای جافە وەکو مێژوونوسی گـەورەی میللەتەکـەمان محەمەد ئەمین زەکی بەگ[٧]، مێژوونوس و ئەدیب و نوسەری بەتوانا خوالێخـۆش بوو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی[٨]، نوسەرو ڕۆشنبیر خوالێخۆش بوو مستەفا نەریمان، نوسەرو ڕۆشنبیری بەتوانا پارێزەر جەمال بابـان، فەیلەسـوف و شـاعیری بـەرزی

ولاتەکەمان (پیرەمێردی نەمر)، نوسەرو وەرگێڕی بەتوانا خوالێخۆش بوو ئومێد ئاشنا، شاعیری بەناوبانگی گەرمیان شێخ ئەحمەدی شاکەلی، ڕۆشنبیری بەناوبانگی گەرمیان شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی، شاعیری بەتوانا بەختیار زێوەر، شاعیری میللی میللەتەکەمان ئەحمەد موختار جاف، شاعیری بەتوانا خوالێخۆش بوو ع.بەسۆز، شاعیری بەناوبانگی ناوچەی گەرمیان مینە جاف، کەسایەتی ناودارو ڕۆشنبیر خوالێخۆش بوو مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف، کەسایەتی بەناوبانگ خوالێخۆش بوو کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف لە کتێبەکەیدا تەئریخی جاف، مێژوونوس د.حەسەن کەریم جاف، نوسەرو ئەندازیار خوسرەو محەمەد سەعید جاف، نوسەرو ڕوناکبیری بەتوانا خوالێخۆش بوو محەمەد سەعید جاف، نوسەرو سیاسەتمەداری کورد دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی، نوسەرو ڕۆژنامەنوس عومەر عەلی شەریف، نوسەرو سیاسەتمەدار عەلی حوسێن بەگی جاف، نوسەرو ڕوناکبیر جیهاد مەولود دەلۆیی، نوسەرو ڕۆشنبیر خوالێخۆش بوو مەلا ئیسماعیل ئیبراهیم، و سەدان نوسەری کوردی تر کە لەم بارەوە نووسیویانە، ئاسەوارناسانی عەرەب (طه باقر و فؤاد سفر)و لە مێژوو نوسەکان عەبدولعەزیز نەوار و دکتۆر عەبدولسەلام رەئوف و مێژوونوس سالم ئالوسی، وابزانم ئەوانەی کە ناومان هێنان سەرجەمیان مێژوونوس و ئاسەوارناس و نوسەرو شاعیری بەناوبانگ، بەڕێز د.بەهرۆز بەڕاستیانی نەزانیوە وا دەزانێت بە هەڵەداچوونە ڕاستیان نەپێکاوە کە فەرموویانە ئەم قەلایە نوێیەو لە لایەن حەمە پاشای جافەوە بنیات نراوە، تەنهاو تەنها باوەڕی بە توێژینەوە پڕ لە هەڵەکانی خۆیەتی کە لەسەر بنەمای گریمانەی بێ بەڵگەو بۆچوونی هەڵەو دوور لە زانستی توێژینەوەی مێژووەوە دامەزراوە.

بەڵام حەقیقەت وەك تیشکی هەتاو وایە بە بێژنگی شڕۆڵ ناشارێتەوە.

بەڵگەیەکی ڕۆشنتر لە ئارادایە کە ئەم قەڵایە نوێیە کە دەیگێڕمەوە لە دەورووبەری ١٩٨٩/١٠/٢دا لە لایەن حکومەتی پێشوی عێراقەوە فەرمانی سەدام حوسێن بۆ نۆژەن کردنەوەی ئەم قەڵایە دەرچوو و لە فەرمانەکەدا هاتبو، بەڕێوەبەرایەتی ئاسەواری عێراق پێویستە دەستنیشانی بکات کە ئەم قەڵایە ئاسەوارە یا وەك کەلەپورە (تراث)ە، ئەگەر پشت ڕاست بۆوە کە ئاسەوارە ئەوا ڕێبەرایەتی ئاسەواری بەغداو سلێمانی سەرپەرشتی نۆژەنکردنەوەی دەگرێتە ئەستۆ وە ئەگەر کەلەپورە (تراث) بۆ ئەوە پارێزگای سلێمانی بەرپرسیاری نۆژەنکردنەوەی بە ئەستۆ دەبێت، لە لایەن مامۆستای هێژا سالم ئالوسی یەوە کە دوو ساڵێك پێش لەو مێژووەی کە ئاماژەی پێکرا بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی ئاسەواری عێراق بۆ ئەو سەردەمە ڕاوێژکاری ڕێبەرایەتیەکە بوو پەیوەندی لەگەڵ من و خوالێخۆش بوو محەمەد سەعید جاف دا کرد کە وەك نوێنەری بنەماڵەی جاف لە لێژنەی نۆژەن کردنەوەی قەڵاکەدا ئامادەبین محەمەد سەعید جاف لەبەر سەرقاڵی نەیتوانی لەو لێژنەیەدا بەشداری بکات، بەندە لە کۆبوونەوەکەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسەوار لە بەغدا بەشداریم کرد، بڕیاردرا لێژنەیەك لە ئاسەواری بەغداو سلێمانی و پارێزگای سلێمانی دروست بکرێت بۆ دەستنیشانکردنی مێژووی قەڵاکە لێژنەکە ڕۆیشتنە کەلارو چەند خشتێکی (تابووقە)ی قەڵاکەیان هێنایەوە بەغدا بۆ فەحس کردنی هەروەها جۆری ئەو کەرەسەیەی وەکو قوڕەو گەچی تێدا بەکارهاتووە دوای فەحس و پشکنینی زانستیەکی ورد بۆیان ڕوونبۆوە کە زۆربەی تابوقەکان نوێیەو تەمەنیان لە (١٢٠) ساڵێك پتر نیە بەڵام چەند تابوقەیەك کۆن بوون دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی بابلیەکان و ساسانیەکان، لەمەدا ئاڵۆزی و چەواشەکاریەك بۆ لێژنەکە هاتە کایەوە، بەندە لە کۆبونەوەیەکدا تێیانم گەیاند، کە لێکدانەوەی ئەم حاڵەتە زۆر ئاسانە، وتم حەمە

پاشا ئەم قەڵایەی کە لە ساڵی ١٨٦٦زاینیدا دەستی کردووە بە بونیاتنانی ویستبوی لە کەرەسەی شوێنەوارەکانی ناوچەی زەند ئاباد سوود وەربگرێت، بەڵام بۆی ڕوون بۆوە کە ئەم کارەی خەرجییەکی زۆری پێویستە بۆ گوێزانەوەی تابوقەکانی ئەم شوێنەوارانە بۆیە دەستی لەم پرۆژەکەی هەڵگرتوو وە کورەی تابوقی لە باکوری شاری کەلاردا دامەزراند و زۆربەی کەرەستەی قەڵاکەی لەم تابوقانەیە دوای گوێبیستی ئەم ڕوونکردنەوەم لێژنەکە بەکۆی دەنگی ئەندامەکانی بڕیاریان دا کە ئەم قەڵایە نوێیە و کەلەپورەو تەمەنی لە ١٢٠ساڵێك زیاتر تێناپەڕێت.

وابزانم بۆچوونی چەندین فەنی و شوێنەوارناس و مێژووناسی ڕێبەرایەتی ئاسەواری بەغدا، بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ جەخت لەسەر ئەم حەقیقەتە کە ئەم قەڵایە نوێیە و کۆن نیە...

بابێینە سەر هەڵەکانی تری بەڕێز د.بەهرۆز لە دیمانەکەیدا.

بەڕێزی ئامـاژە بە مێـژووی ژیانی هەردوو مێژوونوسی بەناوبانگ (ئیبن کەسیر-ابن کثیر)و ئیبن خلدون-ابن خلدون، کردووە، دەڵێت: یەکەمیان لە سەدەی چوارەمی کۆچی و دووەمیان لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاون[٩].

وا دیارە بەڕێزی ئەم دوو سەرچاوەی بە دوو چاو نەبینیوە ئەگەر بیبینیایە بێگومان نەدەکەوتە ئەم هەڵە زەقەوە چونکە (ابن کثیر) ساڵی ٧٠١ك/١٣٠١ز هاتۆتە دونیاوە بەم مانایە لە ساڵەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاوە[١٠].

بەڕێزی چەند سەدەیەك لە دەست نیشانکردنی ساڵەکانی ژیانی ئیبن کەسیردا هەڵەی فەرمووە وە سەبارەت بە ساڵەکانی ژیانی مێژوونوسی گەورە ئیبن خەلدون، دەڵێن: لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوە، ڕاستییەکەی ئەمەیە ساڵی ٧٣٢ك/١٣٣٢ز لە تونس هاتۆتە دونیاوە، و لە ساڵی ٨٠٨ك/١٤٠٦ز کۆچی

دوایی کردووه لێرەشدا دوو سەدەیەك بە هەڵە داچووه[11]، گۆڤاری گەڕان وەك تێبینیەك داخوازی لێبوردنی لە د.بەهرۆز و خوێنەرانی گۆڤارەکە کردووه، چونکه مەبەستی د.بەهرۆز لە دیمانەکەیدا (ابن الاثیر)ه خاوەنی کتێبی (الکامل في التاریخ) بووه نەوەك (ابن کثیر) خاوەنی کتێبی البدایه والنهایه.

بێگومان ئەم تێبینیەی د.بەهرۆزه شتێك لە بابەتەکە ناگۆڕێت چونکه د.بەهرۆز سەبارەت بە ساڵی ژیانی ابن کثیر و ابن الاثیر هەڵەی فەرمووه، چونکه (ابن الأثیر) لە سەدەی چوارەمدا نەژیاوه لە ساڵی ٦٣٠کۆچیدا وەفاتی کردووه[12]، وابێت لە نیوەی دووەمی سەدەی شەشەم و سەرەتای سەدەی حەوتەمدا ژیاوه.

سەبارەت بە بوەیهیەکان دەڵێت لە دێرزوورەوه هاتوون، بەندە سەروکارم لەگەڵ مێژووی ئێراندایە لە هیچ سەرچاوەیەکی فارسی یا عەرەبیدا ئەم بۆچوونەم نەبینیوه کە بوەیهیەکان لە دێرەزورەوه هاتبن، سەرجەم سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەم حەقیقەتە دەکەن کە ئەمانە لە ناوچەی باکوری ئێران لە دەوروبەری دەریاچەی قەزویندا لە ناوچەکانی گەیلان و مازەندەران کە بە دەیلمستان بەناوبانگە ژیاون، باپیرە گەورەیان (بویە) پیشەی ماسیگری بووه ناوی تەواوی ئەبوشجاع بوو کوڕی فەنا خوسرەوه.

بەپێی نوسینەکانی ئەبورەیحانی بەیرونی، و ئیبن خەلەکان و ئەبولفیدا، و میرخواند، فنا خوسرەو باوکی ئەبو شوجاع(بویە) یەکێ لە سەردارەکانی سامانی بووەو دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەیەکی دێرینی دەیلەمی ئێرانی ناسراو بە شیرزیل یال شیرزیل ئاوند[13].

وە ئـەبو رەیحـان بنەچـەکەیان دەگەڕێنـەوە بـۆ پاشـای ساسـانی بـارامی گـۆور[١٤]. بـەڵام هەنـدێ لـە مێژوونوسـان بنەچـەکەیان بـۆ یـەزگردی سـێیەم دوا پاشای ساسانی دەگێڕنەوە[١٥].

وە ئەم بوەیهە سێ کوڕی هەبووە بە ناوی ئەبولحەسـەن عـەلی عیمادولدەولـە (٣٢٠-٣٣٨هـ.ق) ئەبوعـەلی حـسن روکنولدەولـە (٣٢٣-٣٦٦هــ) ئەبولحەسـەن ئەحمەد موعیزولدەولە (٣٣٤-٣٥٦هـ)و ئەم سێ کەسایەتیە توانییـان دەوڵـەتێك کە بە(آل بویە) بەناوبانگە دامەزرێنن و بەغدا پایتـەختی عەباسییەکان لـە لایـەن ئەحمەد موعیزلدەولە وە لە سـەردەمی خەلیفـەی عەباسـی (موسـتەکفی بـالله)دا داگیرکرد.

ئەمە بوو حەقیقەتی بنەچـەکەو ئـەو وڵاتـەی (آل بویـە)تێیـدا ژیـاوەو پـەرەی سەندووە نەوەك درووزەکەی بەڕێزی.

د.بەهرۆز باسی مەلیك رەحیم دەکـات بـێ ئـەوەی زانیارییـەك سـەبارەت بـەم زاتە بخاتەڕوو، مەلیك رەحیم (٤٤٠-٤٤٧هـ) کە ئاخرین فەرمانڕەوای (آل بویە)ە، لە بەغداد دا بووە دوای مردنی ئەبو کالیجاری بـاوکی خـەڵکی بەغـدا کوڕەکـەیان ئەبونصر خوسرەو فیرۆز، کە بە مەلیك رەحیم بەناوبانگە بە پاشـا هەڵبـژارد، لـە سـەردەمی حوکمڕانیەکەیـدا دووچـاری شۆڕشـی براکـانی بـوو لـە سـاڵی ٤٤٧هــ تەوغروول بێك فەرمانڕەوایی بەتوانای سـەلجوقیەکان بەغدای داگیرکـردو مـەلیك رەحیمی زینـدانی کـردو بەزینـدانکردنی و دەوڵـەتی آل بویـە لـە عێراقـدا لەبـەین چوو[١٦].

ئەوەی بەڕێز د.بەهرۆز سەبارەت بەم فەرمانڕەواییە دەیخاتـەڕوو ئەوەندەیـە، دەڵێت لە لایەن سەلجوقیەکانەوە دەستگیرکراوە ناردویانـە بـۆ قـەڵای سـیروان و وتویانە لەسەر ڕێی (رەیە) واتە تارانی ئێستا[١٧]. یان لەسـەر ڕێـی خوراسـان[١٨].

دوایی ئەوەی بەغدا کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی سەلجوقیەکان، ڕۆژهەڵاتی بەغدا واتە لە شارەزوورەوە تا مەندەلی لەژێر دەسەڵاتی کوردە شادەنجانەکان دابووە.

بەندە کتێبەکەی (ابن كثير) (البداية والنهاية)م خوێندەوە بەتایبەت سەبارەت بە ڕووداوەکانی ساڵی (٤٤٧هـ) کە توغروول بێگ بەغدای گرتووەو بەم عیبارەتانە باسی گرتنەکەی مەلیك رەحیم دەکات: (دخل طغرل بغداد في أبهة عظيمة جداً وخطب له بها ثم بعده للملك الرحيم ثم قطعت خطبة الملك الرحيم ورفع إلى القلعة معتقلاً عليه وكان آخر ملوك بني بويه)[19].

توغرول هاتە نێو بەغداوە بە شکۆیەکی یەکجار مەزنەوە وتاری هەینیان بەناوی ئەوەوە خوێندو لە پاشدا بوو مەلیك رەحیم لە دواییدا وتار بەناوی مەلیك رەحیم لابراو لە قەڵاکەیدا زیندانی کرا، گومان لەوەدانیە توغرول بێگ دوای دەستگیرکردنی مەلیك رەحیم لە قەڵای سیروان زیندانی کردووە و هەر لەو قەڵایەدا مردووە بەڵام د.بەهرۆز کەوتۆتە یاری بە ووشەکانەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە قەڵای سیروان لە نێو (حەلوان)و شارەزوور دایەو شوێنی قەڵاکە لەسەر سیروانە ناوچەکەش هەر ناوی سیروانە ناوچەکە وەکو هەرێمێك سیروان یان گەرمیان دەگرێتەوە وشەی گەرمیان لە تاریخەکەی ئیبن ئەسیرو ئیبن خەلدون دا نییە بەڵام ناوچەی سیروان هەبووە لەبەر ئەوەی ڕووبارێك هەیە کە ناوی سیروانە و ناوچەکەش ئەو سەردەمە هەر ناوی سیروان بووە کەواتە قەڵاکەش ناوی سیروان ئەبێت، ئاو بێرەو دەست بشۆرە هەرکەسیش نایسەلمێنێ سەری بە دیوار دا بدات.

بەرێز بچووکترین زانیاری لە جوگرافیای مێژوویی ئەم شوێنانە ئەم بۆچوونە هەڵەیەت پووچ دەکاتەوە بێگومان هیچ پەیوەندیەك لە نێوان قەڵای شێروانەو قەڵای سیروان دانییە، لە کتێبی (اشكال العالم)دا ناوی سیروان و سەیمەرە

بەیەکەوە دەبات کە لە سنوری گیبو سوسەوە تا دەگاتە دەریا[٢٠]. (اصطخریش) ناوی سیروان و سەیمەرە کە دەکەوێتە ناوچەی لورستان بە دوو شاری بچووك ناویانی هێناوە[٢١].

وە دەڵێت: (فیهما میاه وأشجار وزروع ویجتمع فیهما التمر والجوز وما یكون في بلاد الصرد والجروم)، مەسعودیش دەڵێت: (لە ساڵی ١٦٧ کۆچیدا خەلیفەی عەباسی مەهدی لە شاری سەلام دەرچوو بەرەو قرماسین(کرمنشاه) لە وڵاتی دینەوەردا چونکە وەسفی خاکی ئاووهەوای ماسبزانیان لە وڵاتی سیروان و جرجان بۆ کردبو[٢٢].

ئەم سیروانە کە بەرێز بەهرۆز باسی دەکات توغرولی سەلجوقی مەلیك رەحیمی تێدا زیندانی کردووە وە لەوێشدا مردووە ئەم سیروانەیە کە بە قەڵای سیروان لە مێژوودا بەناوبانگە نەوەك قەڵای شێروانەی کەلار، سیروان یەکێ بووە لە پایتەختەکانی بەدری کوڕی حەسەن وەیهی کە پاش مردنی حەسەن وەیهی دامەزرێنەری دەوڵەتی حەسەنەوییە[٢٣]. توغرول بێگی سەلجوقی داگیری کردو لە سەردەمی ئال بوەیهدا یەکێ لە خەلیفەکانی عەباسی لەوێ مردووە، بۆ ئەوەش بزانین ڕووباری سیروان لە کوردستانی باشوور پەیوەندیەکی بە شاری سیروانی لورستانەوە نییە، ئاوەکانی سیروانی لورستان دەڕژێتە(سەیمەرە)و تێکەڵی ڕووباری کاروان دەبێت[٢٤].

شایانی باسە ئەم شاری سیروانە لە سەردەمێکدا بەر لە وێرانبوونی، پایتەختی لورستانی بچووك کە بە بنەماڵەی خورشیدی ناسراون ١١٧٥-١٨٣٤زاینی بووە[٢٥].

ڕووباری سیروان ناوەکەی لە سێ ڕووانەوە هاتووە واتە سێ جۆگە لە چیاکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەقوڵێ، نازانم ئەم سێ ڕووانە چۆن بوەتە

شێروانە ئەم موعەمەیە تـەنها د.بـەهرۆز دەیزانێـت وەڵامـی یەکلاکـەرەوەش لای بەڕێزیانە.

دەفـەرموێ لەبـەر ئـەوەی ڕووبارێـك هەیـە نـاوی سـیروانەو ناوچـەکەش لـەو سـەردەمەدا هـەر نـاوی سـیروان بـووە[٢٦]. لێـرەدا بەنـدە وەك مێـژوو نوسـێك داخوازیت لێ دەکەم تەنها یەك بەڵگە یا یەك سەرچاوە کە ئەم ناوچـەی شـێروانە بە سیروان ناسراو بێت بیخەرەڕوو ئەو ساتە هەموو بۆچوونەکانت دەسەلمێنین.

بڕوا بفەرموونە شین کراوەتە سین و نەسـینیش بەشـین بـە مانـا نـە شـێروانە کراوەتە سیروان و نەشێروانەش سیروانە ئەمە بۆچوونێکی هەڵەو بێ بنەمایە، وە لەگەڵ حەقیقەتدا یەکناگرێتەوە.

بەڕێز بە دڵنیاییەوە دەڵێم لە هیچ سـەردەمێکدا ئـەم ناوچـەیە نـاوی سـیروان نەبووە و ئەم بۆچوونەی بەڕێزت هیچ بەڵگەیـەکی مێـژوویی پاڵپـشتی ناکـات کـە بۆچوونەکەت بسەلمێنێت، وە ئەگەر لـە ڕوانگـەی تـصحیف لـسان واتـە گـۆڕینی وشـەی سـەیری بابەتەکـە بکـەین لـەم بـارەوە دەڵـێم گـۆڕینی وشـە لـە هـەموو زمانەکاندا هەیەو کەسیش نکوڵی لەم حەقیقەتە نیە هەروەك نە من و نە بەڕێزتان زمانەوان نین ئەگەر بابەتیانە سەیری مەسەلەکە بکەین نەدەبو نەمنو نە تـۆ لـەم بوارەدا قەڵەم فەرسایی بکـەین و وەکـو شـارەزایەك لێـی بـدوێین، بـەڵام بـەڕێزت ناچارمانت کرد کورتە باسێك لەم بارەوە بەپێی زانیاریمان بکەین بـە تەصـحیف، سـەبارەت بـە ڕەسمـی حەرفـە نـەوەك چۆنیەتی ئاخـاوتنی (نطـق کردنـی)، وە عەرەبەکان ئەو حەرفانەی کە لە ئەلف بای عەرەبیـدا هەیـە زۆر کـەم تەصـحیفی دەکەن بەو مانایە کەمتر سین دەکەنە شـین یـان وەك بـە پێـچەوانەوە ئەگـەر بـە گوێرەی ئەم تەصحیفە کە بـەڕێزت تـەعمیمت کـردووە دەبوایـە شمـس بکرایەتـە سمش وە ئەگەر موشی لە ئیسلامدا بوەتـە موسـی چـونکە لـە قورئـانی پـیرۆزدا

هاتووە وشەی قورئان قابیلی گۆڕان نیە بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە گۆڕینی حەرف یا وشەش لە زمانەکاندا نەبووبی، لە زمانی فارسی و کوردیدا گۆڕینی حەرف و هەتا وشەش بەدی دەکرێت، فارسەکان غەین دەکەنە قاف و قافیش دەکەنە غەین بۆ نموونەو بزەخەنە: دەگێڕنەوە لە مازەندەرانیەکان بە زمانی عەرەبی پرسی لم تبدلون الغین قافاً والقاف غیناً، بەمانا بۆ چ غەین دەکەنە قاف و قافیش دەکەنە غەین لە وەڵامدا وتی: (استغفرالله من غال هذا) جگە لەمەش واویش دەکەنە ڤی وە لە زمانی فارسیدا لەم بارەوە نمونەی زۆرەو لە زمانی کوردیشدا مارف دەکەنە مارە(٢٧). جەعفەر دەکەنە عارە محەمەدی دەکەنە حەمە مەحمود دەکەنە خوولە حەسەن دەکەنە هەسەن ظاهر دەکەنە زایەر(٢٨).

هەروەك ئەم بابەتە لە دوورو نزیکەوە پەیوەندی بە باسەکەمانەوە نیە هەروەك د.بەهرۆز بە موتمانەوە جەخت لەسەر ئەم پەیوەندییە وەهمییە دەکات.

بەڕێز د.بەهرۆز، هەر لەسەر بنەمای ئەم گۆڕینی وشەیە(تصحیف) زۆر ناوی سەیرو سەمەرەی بە خەیاڵی خۆی ساغکردۆتەوە لە دیمانەکەیدا دەڵێت ئەوان باس لە ناحیەی بەلوك دەکەن(٢٩).

کە بەرلووتی ئێستایە(ئەوان کێن؟) ڕوونی نەکردۆتەوە کێن بەلوك واتە بەڕوو و عەرەبیش پێی ئەڵێ(برنوك) واتە بەڕوو، خۆش بە حاڵی بەرلووتیەکانی خزمم، بەڕێز بەهرۆز ڕیشەو بنەماو ناوی گوندەکانی دۆزیوەتەوە بەڕێز ئەگەر بەلوگ(٣٠). یا برنوگ بەڕوو بێت ئەی (بلوط) چییەو ناوی کام درەخت و میوەیەکە بڕوابکە ئێمەی گەرمیانیەکان هەرگیز نەمان بیستووە بەرلووت لە بەڕووەوە وەرگیرابێت، بە بۆچوونی من هیچ پەیوەندیەك لە نێوان ئەم دوو ناوە دانییەو بۆچوونەکەت هەڵەیە دەفەرموێت سامەغان شارەزووری ئێستایە بەڵگەی چییە بۆ نەتخستۆتەڕوو، گومان لەوەدانیە هەڵەت فەرمووە و ڕاستت نەپێکاوە.

سامەغان لە لغت نامەی دهخدادا کە موعتەبەرترین فەرهەنگی ئێرانە بەمجۆرە باسی سامەغان و سامغان کراوە: دهی است از دهستان خوسرەو شیر بەخش جغتاری شهرستان سبزدار، واتە سامەغان گوندێکە لە گوندەکانی خوسرەو و شیر بەخشی جوغتای شارۆچکەی سەبزەوار هەروەها لە فەرهەنگی جوغرافیای ئێران ج١٩ دا هەر بەم مانایە هاتووە، وە لە ئەفغانستاندا شارێك هەیە بە ناوی سامغان کە فارسەکان پێی دەڵێن بامیان، وە عەرەبەکانیش پێی دەڵێن سامغان.

ئەم سامغانە، چۆن بووە شارەزوور[٣١]، ساموغان چۆن بووە بە (موغان) وەڵامی لای ئێمە نیە بەڵکو بەرێزی با بە بەڵگەوە بۆمان روون بکاتەوە خوالێخۆشبو تەوفیق وەهبی سەبارەت بە ناوی شارەزوورەوە دەڵێت:

ناوی شارەزور ئەو زەویە پەست و خوارەیە کە بەشی باشوری خۆرئاوای تانجەرۆ لە پارێزگای سلێمانی کە نزمترین بەشە دەگرێتەوە، وە ئەم زەوییە خوارای و نزمە لە باشوری شارۆچکەی عەربەتەوە تا دەوروبەری شارۆچکەی هەڵەبجە شۆر دەبێتەوە وە چەند شاخێك رووی لێ کردووە بەتایبەت لە رۆژهەڵات و رۆژئاوایەوە و رووبەری شارەزوور ٦٥٦ کیلۆمەتری چوار سوچە مەزەندە دەکرێت[٣٢].

وە چەندین زاناو خوێندەواری ناودار لە شارەکانی شارەزووردا کە جێی شوێنی لە جوغرافیای کوردستانی باشووردا روونە بەدی دەکرێن بۆ نموونە ناوی چەند زانایەکیان لەم بوارەدا دەهێنین، اسحاق بن سليمان الشهرزوري، الخضر بن داود الشهرزوري، أبوبكر أحمد بن عبيد الشهرزوري، وأبو أحمد الشهرزوري، وأبو الحسن عبداللطيف القاضي بن أحمد بن عبدالله بن القاسم الشهرزوري، وابن صلاح الكردي الشهرزوري ابن الحاجب الشهرزوري[٣٣].

د.بەهرۆز دەڵێت لە ویلایەتی سیرت لە باکوری کوردستان قەڵایەك هەیە بەناوی شێروان، وە ئەوان پێی ئەڵێن شیرڤان قەلاسی، ناوێکی تریشی هەیە پێی دەوترێت کوفری قەلاسی، کفری لە وشەی کوفرەوە هاتووە وە عەرەب و فارس پێی ئەڵێن کوفر وە کورد پێی دەڵێت کفر وشەی کفر لێرەدا ئاخاوتنێکی کوردیە، چونکە هەمان ناو و هەمان واتای هەیە وە لە سیرەت گەڕەکەکەش هەر ناوی کوفرییە، و لە پاکستانیش شارێك هەیە بەناوی کوفری، چونکە بە لەفزی ئۆردو بە کوفر ئەڵێن کوفر کوفرییەکەی خۆشمان هەر پێی ئەڵێن کوفری ئەو تەصحیفی وشەیە، ئافەرین بارەك الله ناوی کفریشت لە ون بوون ڕزگارکرد خێرت بنوسێت، خوا شاهیدە ئەم بۆچوونانە لە قوتوی هیچ عەتارێکدا نیە بەندە وەك قوتابیەکی مێژوو هەرگیز بەخۆم ئەو مەودایە نادەم، لەم بارەوە بڕیارێك یا وەك نەزرو ڕایەك بدرکێنم، چونکە زمانەوان نیم، نازانم بەڕێزی کە پسپۆڕی (مایکرۆ بایۆلۆجی)یە چون وا بە موتمانەوە لە بواری زمانەوانیدا ئەسپ تاودەدات و خۆی کردووە بە خاوەن نەزەرو بیروڕای یەکلاکەرەوە.

جەناب ئەم بابەتە وردو قووڵە پێویستی بە توێژینەوەی زانستی زمانەوانی و مێژوویی هەیە کە لەگەڵ عەقڵ و مەنتقیشدا بگونجێت.

د.بەهرۆز دەڵێت: شیرڤان قەلاسی و کوفری قەلاسی ئەمە بینایەکەی شێوەی تەلارسازییەکەی ساسانیە[٣٤]. چونکە ساسانیەکان نەوشیروانیان هەبووە، نەوشیروانی یەکەم و دووەم ئیتر کامیان بووە نازانێت.

ئەم دوو قەڵایە لە سەدەی شەشەمی زانستی کەوتۆتە ژێر ڕکێفی ڕۆمانیەکان، مەبەستم قەڵای شێروانی سیرتە دوای ئەوە بۆ ماوەی (٧٠)ساڵ عەرەبەکان حوکمیان کردووە دوای ئەوە مەغۆلەکان لە ساڵی ١٢١٥ی زاینی هاتوونەتە قەڵای شێروان لە سیرت چونکە مەغۆلەکان لە ساڵی ١٢٥٨ز بەغدایان گرت هەر بۆیە

بـەو دەرئەنجامـە ئەگـەین ئـەم دوو قەڵایـە قـەلای شـێروانەی کـەلار و قـەڵای شێروانەی سـیرت مومکینـە هـەردووکیان ساسـانی بـوون و نەوشـیروان دروسـتی کردوون و سیروان تەعریبی شێروانە، هەر بۆیە مـن بـڕوام وایـە کـە کوفرییەکـەی خۆمان هاوشێوەی کوفرییەکەی سیرەت بێت وەك چـۆن کـوفری قـەڵای شـێروان هەیە لە سیرەت، ئاواش لێرە کفـری قـەڵای شـێروانە هەیـە[٣٥]. هەرچـەندە ئەمـە ئیشی زۆری ئەوێ و پێویستی بە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی زیاتر هەیە لە لایەن شوێنەوارناس و مێژوونوسەکانەوە.

بەندە هەرچی هەوڵمدا پەیوەندییەك لە نێوان ئەم قسانەی د.بـەهرۆزدا پەیـدا بکەم بەداخەوە نەمتوانی، دوای باسکردنی دوو قەڵاکە شێروان قەڵاسی و کـوفری قەڵاسی سیرەت دەفەرموێ هەربۆیە بەم دەرئەنجامە دەگـەین قـەڵای شـێروانەی کلارو قەڵای شێروانەی سیرەت(مومکینە) هەردووکیان ساسانی بوون، نەوشیروان دروسـتی کـردوون، بـەڕێزت خـاوەنی بڕوانامەیـەکی زانـستی مایکرۆبایۆلۆجیـت وابزانم لە زانستدا وشەی مومکینە جێی نابێتـەوە مێـژوویش زانـستێکە فەلـسەفەو قەواعیدو ڕێبازی زانستی تایبەت بەخۆی هەیە ئـەم جـۆرە وشـانە وەك مومکینـە جێی تیادا نابێتەوە، دەڵێت شێروان قەڵاسی شێوازی تـەلار سـازیەکەی ساسـانی بـەبێ ئـەوەی بەڵگەیـەك چـێ لـە ڕووی مێژوویيـەوە یـا وەك لـە ڕووی هونـەری میعماری و شێوازی میعماری ساسـانیەوە زانیاریـەك بخاتـەڕوو، دەفـەرموێ ئـەم قەڵایە ساسانییەو نەوشیروان دروستی کردووە نەوشیروانی یەکەم یا نەوشـیروانی دووەم؟ بەڕێز لە مێژووی پاشـاکانی ساسـانیدا تـەنها خوسرەوی یەکـەم کـە بـە نەوشــیروانی دادگــەر بەناوبانگــە(٥٣١-٥٧٩) زاینــی و پێغەمبــەری ئیــسلام محەمـەد(ص) لـە سـەردەمی ئـەودا هاتۆتـە دونیـاوە (٤٨)سـاڵ فـەرمانڕەوایی کردووە دەبینرێت[٣٦]. ئەوەی تریان خوسرەوی دووەمە کە بە خوسرەوی پەرویز

بەناوبانگە (٥٦٠-٦٢٨ز) کە پێغەمبەری ئیسلام محەمەد(ص) بە نامە داخوازی ئیسلام بوونی لێ کردبوو وە لە سەردەمی ئەودا وە لە سەردەمی ئەودا بەشێك لە تەلاری کیسرا لە مەدائین دارما وە هەندێ لە مێژوونوسان ئەم رووداوە بە نیشانەی دارمانی سیلسیلەی ساسانیەکان و سەرکەوتنی ئیسلام دەزانن[٣٧].

تۆ کە پاشاکانی ساسانی لە یەك ناکەیتەوە بچوکترین زانیاریت دەربارەیان نیە چۆن بە موتمانەوە دەڵێین قەڵای شێروانەی سیرەت ساسانیەو نەوشیروان دروستی کردووەو نایش زانی کام پاشای ساسانی دروستی کردووە لە خۆتەوە تفەنگ بە تاریکیەوە دەنێی دەڵێیت نەوشیروانی یەکەم یان دووەم دروستی کردووە بێگومان دەست نیشانکردنی مێژووی قەڵایەك و شێوازی میعماریەکەی پێویستی بە بەڵگە هەیە چونکە ساسانیەکان شناسنامەیەکی تایبەت بە خۆیانیان لە هونەری میعماریدا هەیە، بەرێزت لەسەر بنەمای کام بەڵگە ئەم دوو قەڵای سیرەتە بە ساسانی دەزانێت، وە بڕیار دەدەیت لەگەڵ بەکارهێنانی وشەی مومکینەدا قەڵای شێروانەیش ساسانیە...

بەرێز دونیای میعماری دونیایەکی پڕ لە وردەکاری ئەکادیمیە بنەماڵەی میعماریەکان وەك چڵ و پۆی درەختێك پەیوەندن بەیەکەوە، لە سەرەتاوە سەریان هەڵداوە و دەستنیشان کراون هەریەکە لەوانەش ئەبعادو قەدوو قامەت و شکل و فۆرم و قەبارەو چۆنیەتی مەعلومەو بە گوێرەی ژینگەو دەسەڵات و ئابووری و چوار تەنیشت رۆژ بە رۆژ شێوەو شەمایلی دیاری بوەو ناونراوە لە دونیای میعماریدا چەندین بنەماڵەی میعماری ناسراون بە دایکانە:

أ- بنەماڵەی میعماری سەردەمی فەراعینە.

ب- بنەماڵەی میعماری سەردەمی میزۆپۆتامیاو دۆڵی دوو رووبار.

ج- بنەماڵەی میعماری سەردەمی یۆنانی.

د- بنەماڵەی میعماری سەردەمی ڕۆمانی.

هـ- بنەماڵەی میعماری سەردەمی ئێرانی.

و- بنەماڵەی میعماری ئیسلامی.

بنەماڵەی میعماری چینی.

## بنەماڵەی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا:

هەڵبەتە هەریەك لەو بنەماڵانە چڵ و پۆی جۆراوجۆری لێ بۆتەوە لە باسەکەی ئێمەوە بە دووره ئێمە تەنها چڵ و لکی بنەماڵەی ئیسلامی دەخەینەڕوو.

پێش ئەوەی بێینە سەر ئەم باسە هەروەك بەندە ئەندازیارو شوێنەوار ناس نیم، بەڵام تا ڕادەیەك وەك مێژوونوسێك لە شێوازی تەلارسازی ئێرانیەکان زانیاریەکی کەمم هەیە بە پێویستم زانی کورتە زانیارییەك سەبارەت بە شێوازی میعماری هەخامەنشینەکان و ساسانیەکان بخەمەڕوو.

شێوازی میعماری هەخامنشینەکان (٥٥٠-٣٣١ز) کە لە کۆشك و تەلارەکانی ئاپادانـاو تەختی جەمشید دا کە بە پروسیولیس بەناوبانگە پایتەختی هەخامنشیەکان بووە، ڕەنگی داوەتەوە بە کورتی دەوری وەستا کارانی داریوشی یەکەم بەناوبانگترین پاشاکانی هەخامنشی و خشایارشا لە جەغزی کاروباری میعماری تەختی جەمشیدو هەخامنشیدا بریتیە لە سازکردنی تەلاری چوارگۆشەی پڕ کۆلەکە، داڕشتنی بناغەی سەخت بۆ ئەو کۆلەکە بەرزانەی میچەکانیان دەکەوتە سەر شانی و تێکێشانی هێرەی نیمچە کەوانەی شانی دەرانەو پەنجەرەو تاقچان، هێنانە گۆڕەی پەیکەری بونەوەران کە وەکو پەیکەری پاسەوان دەخرێتە سەر ئەم خاڵانەی سەرەوە[٣٨]. شایانی باسە کۆڵەکە بەرزەکان زۆربەیان لە بەردی تاشراوی خۆڵەکەپی ڕەنگ دروست کراوە

سەری کوولکەکان بە پەیکەری گایێکی وەحشی یا شێرێك یا بونەوەرێکی ئەفسانەیی کۆتایی پێدێت و ڕازاوەتەوە هەندێ لە ئاسەوار ناسان لەو بڕوایەدان ئەم کۆڵەکە بەرزانە لەژێر کاریگەری شێوازی کۆڵەکە بەرزەکانی تەلارەکانی فیرعەونەکانی میسر دایە وە لە شێوازی پەیکەرسازی و تەلارسازی ئاشوریەکان سودیان وەرگرتووە[٣٩].

تەلارسازی ساسانیەکان مۆری تایبەت بەخۆی هەیە و لەژێر کاریگەری شێوازی میعماری هەخامنشیەکاندایە بەڵام کەوانەی بەرزو شکۆدار کە بە سەرەکی ترین شێوازی تەلارسازی ساسانیەکان دەژمێردرێت مۆرکی شێوازی میعماری ساسانیە، ئەم شێوازە میعماریە لە تەلاری تاقی کیسرادا لە (تەیسەفوون) تەلارەکانی فەیروز ئابادو سروستان ڕەنگی داوەتەوە، وە ئەم سەبك و شێوازە میعمارییە لە قەڵای شێروانە نە لە دوورو نە لە نزیکەوە بەدی ناکرێت.

بۆ پووچ کردنەوەی بۆچوونی ئەو بەڕێزانە کە بێ بەڵگە قەڵای شێروانە دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان گوایە هەمان شێوازی تەلارسازیە دەڵێین نە کۆڵەگەیەك نە کەوانەیەکی گەورەو بەرزو نە داڵانێکی پانوپۆڕو نە هۆدەیەکی گەورە لە دەوری داڵانەکەدا و نە گوڵدەستەیەك و یا پایەیەکی چوارگۆشەو نە پەیکەرێك بەسەر کۆڵەکەکانەوەو نە گومەزییەك لە قەڵادا بەدی ناکرێت، ئیدی چۆن شێوازی میعماریەکەی ساسانییە...؟

گومان لەوە دانیە شێوازی میعماری قەڵای شێروانە ئیسلامی سەفەوییە شایانی باسیشە بنەماڵەی ئیسلامی لە سەرەتاکەیدا لە یەکەمین مزگەوتەوە دەستی پێکردووە بە گوێرەی دەوروبەرو ئاو و هەواو ژینگە، دەسەڵات و دارایی، هەروەها فەرهەنگی دوورو نزیك بوو بە قوتابخانەیەکی ناسراوی میعماری و

دابەش بوەتە سەر چەندین شێوە میعماریدا کە هەریەك لەوانە خاوەنی پێناسی خۆیەتی:

أ- شێوەی ئەمەوی.

ب-شێوەی عەباسی.

ج- شێوەی سەفەوی.

د- شێوەی عوسمانی.

هـ - شێوەی مەملوکی.

و- شێوەی هیندی کە بڕێك لە شاکانیان لە ڕەگەزی مەغۆل بوونە.

بێگومان ئەم باسە زۆر دوورو درێژە دێمەوە سەر چۆنیەتی میعماری قەلاّی شێروانە لە حەقیقەتدا ئەو قەلاّیە لە بارەی میعماریەوە زۆر کارێکی سادەو بێ گرێیە و ناکرێت لە خانەی هونەرێکی دەگمەنی میعماریدا دابنرێت ئەو قەلاّیە و زۆر بەو بابەتە لە دەڤەرەکانی دەوروبەری ئەسفەهان و یەزدو تەهران و خوراساندا بەدی دەکرێت، قەلاّی شێروانە بە موتمانەوە دەلێم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دوا دوایی دەورەی سەفەوییەو سەرەتای قاجاری شێوازی میعماری سەفەوییەکان شێوازێکی ئیسلامییە تایبەتە بەم سەردەمە زیاتر لە ژێر کاریگەری میعماری سەلجوقیەکاندا بووە، ئەم شێوازە میعمارییە شۆڕبۆتەوە بۆ سەردەمی قاجاریەکان وراجر سیڤری(٤٠). لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی ئێرانی سەفەوی بە درێژایی باسی ئەم شێوازەی کردووە وە ئەم شێوازە میعماریە لە ئارامگەکانی کەربەلاو نەجەفدا بەدیدەکرێت و لە تەلارەکانی سەردەمی سەفەویەکان لە ئەسفەهاندا و قاجاریەکان لە تەهراندا ڕەنگی داوەتەوە.

لە قەلاّی شێروانە هەر وەك گومەزی دووانەی تێدا نابینرێت بەلاّم شێوازی تاقەکانی و قوللەکانی کە وەك هەواکێش دروست کراوە دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی

میعماری ئەم دوو دەورەیە سەیرو سەمەرەی لەوەدایە، د.بەهرۆز قەوانێکی تازەی بۆ خستوینەتە سەر سەبارەت بە داستانی شێوازی میعماری قەڵای شێروانە ئەویش شێوازی میعماری مەغۆلییە کە بە موغالی بەناوبانگە گوایە شێوازی میعماری قەڵای شێروانە هەمان شێوازی میعماری مەغۆلییە دوای سەدەی حەڤدەهەم دروست کراوە بەڕێزی سەری لێ شێواوە لە لایەکەوە دەڵێت ساسانیە وەکو باسمان کرد لە لایەکی ترەوە دەڵێت مەغۆلییە.

بەڕێزی باز بازانێکی سەیرو سەمەرە دەکات ئەگەر لە کێبڕکێی بازداندا بەشداری بکات موسەلەمە پلەی یەکەمی بەدەست دەهێنا، بەڕێز ئەگەر مەغوولیە خۆ بە قسە نابێت، بەڵگەت چییە، وە ئەگەر ساسانیە بەڵگەت بخەرەڕوو، ئەینا ئەمە جەمعی نەقیچەینە، لەگەڵ زانستی مێژوو حەقیقەتی مێژوودا سازگار نییە، بۆ پووچکردنەوەی ئەم بۆچوونە هەڵەیەشت ناچارین سەبارەت بە شێوازی میعماری دەوڵەتی مەغۆلەکانی هند کە لە لایەن (ظهیرالدین)(بابره)وە(٩٣٢ك/١٥٢٦ز) دامەزراوە کە لە نەوەکانی (تەیمورلەنگن) کورتە باسێك بکەین شێوازی میعماری موغالی تێکەڵاویەکە لە نێوان شێوازی میعماری هیندی و ئیسلامیدا وە بەتایبەت شێوازی میعماری ئێرانی سەفەوی و لەو تێکەڵاوبوونەدا خۆی دەنوێنێ و ناودارترین شێوازی ئەم سەبکی میعماریە لە مەزارگەی تاج مەحەل دا هاوسەری شاه جەهان دەکەوێتە بەرچاو ئەم مەزارگەیە دوای کۆچی دوایی تاج مەحەل لەساڵی ١٦٣١ز لە لایەن شاه جەهاتەوە دروست کراوە خۆیشی هەر لەوێ نێژراوە شاه جەهان بۆ بونیاتنانی ئم مەزارگایە شورایەکی میعماری لە چاکترین میعمارانی هندی، ئێرانی، عێراقی وڵاتە ئیسلامیەکانی تریشی کۆکردەوەو داخوازی لێکردن کە نەخشەیەك بۆ مەزارگەی تاج مەحەل دابنێن، وە سەرەنجام نەخشەیەکی میعماری ئێرانی عیسی شیرازی

لە کێبڕکێیەکەدا بردیەوەو هەڵبژێردرا بۆ دروستکردنی ئەم مەزارە کە (٢٢)ساڵی خایاند تا تەواوبوو[٤١]. مەزارگەکە بریتی بوو لە گومەزەیەکی شیرازی بە شکلی پیازی و دومنارە لە هەردوو لایەوە دروست کراوە دیواری بینایەتەکە بە مەرمەڕی شەفاف داپۆشراوە کە تیشکی ڕۆشنایی داداتە نێو مەزارگەکەوە ئەم مەزارگایەو مەزارگای ئەکبەر لە شاری ئەکرای هندوستان و تەلاری همایون کە حەوت کیلۆمەتری لە شاری ئەکراوە دوورە شێوەیەکی میعماری هیندی تێکەڵ بە سەلیقەی میعماری ئیسلامی سەفەوییەو ئەم شێوازە بە هیچ شێوەیەك لە شێوەی میعماری قەڵای شێروانەدا بەدی ناکرێت.

بەڕێز شێوازی میعماری قەڵای شێروانە ئیسلامی سەفەوی نە هەخامنشیەو نە ساسانی و نە موغالیە. بە جەختەوە دوبارەی دەکەینەوە قەڵای شێروانە لە دونیای میعماریدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دوادوایی دەورەی سەفەوی و سەرەتای قاجاری.

حەمە پاشای جاف وەستایەکی ئێرانی لە ئەسفەهانەوە بۆ نێردراوە ئەم قەڵایەی لە ماوەی هەشت ساڵدا دروست کردووە ڕاستە حەمە پاشای جاف ڕەوەند بووە بەڵام مەغۆل و عوسمانی و سەفەوی جەلائری و ئاق قوینلو و قەرەقوینلو و قاجاری تەواوی دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمانە هەر هەموویان ڕەوەندو کۆچەر بوونەو کاری گەورەی تەلارسازی و قەڵاسازی و ساختمانیشیان ئەنجام داوە ئەم هەموو جەخت لەسەر کردنە د.بەهرۆز وا دەزانێت فەتحی موبینی کردووە کە دەفەرموێ جاف کۆچەر بوونە کاری وەهای گەورەیان لێ نەوەشاوەتەوە، خۆ ئەوانەی کاری مەزنی میعماریان کردووە پەری ئاسمان نەبوونە شمشێرەکانیان خوێنی لێ چکاوەو سەد ئەوەندەی حەمە پاشای جاف خوێن ڕێژتر بوونە جیاوازی نێوان ئێمەو ئەو گەلە پێگەیشتوانە ئەوان شانازی

بەو شمشێر وەشانەوە دەکەن ئێمەش دەکۆشین ئەوەی هەمانە بیکەینە هی خەڵکی تر وە سەیر لەوەشدایە سرنای کوردایەتیش لێ دەدەین.

بەڕێز د.بەهرۆز لە بەشی دووەمی دیمانەکەیدا چەندین هەڵەی زەقی تری کردووە بە پێویستم زانی بەرپەرچی بۆچوونەکانی بدەمەوە تا لە ئایندەدا نەبێتە دیکۆمێنت و بەڵگەیەکی متمانە پێکراو، بەڕێزی وای داوەتە قەڵەم کە حەمە پاشا لە لایەن عوسمانیەکانەوە نازناوی پاشای پێبەخشراوە بۆ ئەوەی هەرەس بە میرنشینی بابانەکان بێنن بەچی تەبعەن بە جافەکان[٤٢].

ئەم بۆچوونە لە حەقیقەتی مێژوویی و ڕاستی ڕووداوەکانەوە دوورە، ئەوەی شایەنی باسە لە نێوبردنی میرنشینە کوردەکان لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەمەوە دەستی پێکرد ئەو سوڵتانە لە ساڵی ١٨٣٤ زاینییەوە کەوتە بیرۆکەی قەڵاچۆکردن و لەنێوبردنی میرنشینە سەربەخۆیە کوردەکان چونکە لەو بڕوایەدا بوو هۆی دواکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو میرشینە کوردانە کە ڕێگرن لە دامەزراندنی لەشکرێکی یەکگرتووی عوسمانیداو دەوڵەتێکی مەرکەزی بەهێزدا.

**بۆ پووچکردنەوەی ئەم بۆچوونە هەڵەیە پەنا دەبەینە بەر ڕووداوەکانی مێژوو:**

دوای شەڕی چاڵدێران ١٥١٤ز لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی سەفەویدا، کوردستان لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا دابەشکرا[٤٣]، خاکی کوردستان بووە گۆڕەپانی ململانێیەکی خوێنینەوە، زەرەرو زیانێکی گەورە لە میللەتی کورد کەوت بەڵام لە لایەکی ترەوە سودیشی هەبوو سودەکە لەمەدابو هەردوو دەوڵەتەکە پێویستیان بە هێزی جەنگی ئەم میرنشینانە بوو بۆیە میرنشینە کوردەکان ئەم هەڵەیان دەقۆزتەوە و ڕۆژ بەڕۆژ پەرەیان دەسەندو سەربەخۆییان مسۆگەر دەکرد، لێرەدا بە پێویستم زانی ئاماژە بەم میرنشینە

سەربەخۆییانە بکەم کە بریتی بوون لە میرنشینی بۆتان، هەکاری، بادینان، سۆران، بابان، وەکو باسمانکرد هەر لە ساڵی ١٨٣٤زاینیەوە بە فەرمانی سوڵتان مەحمودی دووەمەوە ئەم میرنشینانەکەوتنە بەر شاڵاوی لەشکری عوسمانیەکان و زۆربەی میرنشینە سەربەخۆیەکانی کورد لەنێو چوون جێی داخە کەوا دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەو سەردەمەو ڕوسیای قەیسەری و ئینگلیز و فەرەنسا پاڵپشتی دەوڵەتی عوسمانی بوون بۆ لەناوبردنی میرنشینە کوردەکان کە گرنگترینیان میرنشینی سەربەخۆیی سۆران بۆ بەسەرکردایەتی میر محەمەد کە بە پاشا کوێرەی ڕەواندزی بەناوبانگە کە لە ساڵی ١٨٣٨ز دوای خۆبەدەستدانەوەی لە شاری تەرابزۆن ڕەشەکوژکرا[٤٤].

وە میرنشینی بۆتان بە سەرکردایەتی بەدرخان پاشا کە عوسمانیەکان لە ساڵی ١٨٩٧ز بەهۆی خیانەتی (یەزدان شێری) ئامۆزایەوە توانیان لە دەسەڵاتی بخەن، سەرەتا بۆ دورگەی کریت دورخرایەوە و لە پاشدا نێردرایە (دیمەشق)و لە ساڵی ١٨٦٨ لەوێ کۆچی دوایی کرد، وە لە حقیقەتدا ئەم دوو میرنشینە وێنەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوون و بە پێوەری سیاسی ئەم سەردەمە مەرجەکانی دەوڵەت بوونی تێیاندا بەدیدەکرا.

پاش واژۆکردنی ڕێکەوتن نامەی ئەرزرۆمی دووەم ١٨٤٧ز شەڕی گەرم لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجارپدا نەماو شەڕی سارد جێی گرتەوە.

وە ئەم ڕێکەوتننامەیە کە بریتی بوو لە (١١)مادده ماددەی هەشتەمی یەکڕاست پەیوەندی بە دۆزی کوردەوە هەبووە، و لەو ماددەدا هاتبوو پێویستە هەردوو دەوڵەتەکە نەهێڵن سەرکردەیەکی کورد سەرهەڵبدات و گێرەشێوێنی بکات و ئاشووب لە سنوری هەردوو دەوڵەتەکەدا بنێتەوەو ئاڵای سەربەخۆیی هەڵبکات و سەرجەم ئەو عێلە گەورانە کە کۆچەرین پێویستە مەنعی هاتوچۆی

گەرمیان و کوێستانیان لێبگرێت و دەبێت تەبەعیەتی یەکێ لەم دوو دەوڵەتە وەربگرن و نابێت میرنشینێکی سەربەخۆی کورد لەم دوو دەوڵەتەدا بەسەر پێوە بمێنێت و لە حەقیقەتدا ڕێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی دووەم ڕاستەوخۆ دژی هۆزە کۆچەرییەکان بو کە عێلی جاف ئەو سەردەمە گەورەترین عێلی کۆچەری بوون کە مەرزی عوسمانی و قاجاریان دەبەزاند و ئاسایشی سنورەکانیان دەخستە مەترسیەوە.

بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی بەڕێزت کە سەرتاپای هەڵەیەو فڕی بەسەر حەقیقەتەوە نییە، بەڕێز پاراستنی ئاسایشی سنورەکان بەعێلی جاف نەسپێردرابو، بەڵکو دەوڵەتی عوسمانی کاتێك هەستی بە وریایی و ئازایی محەمەد پاشا کرد وە زانیویەتی کە بیری سەربەستی و کوردپەروەری تێدا بەهێزە ویستویەتی بەهۆی نیشتەجێکردنی هۆزی جافەوەو خەریك کردنیانەوە بە کشتوکاڵەوە ئەم هەست و بیرەی محەمەد پاشا کزو لاواز بکات(٤٥).

ئەوەبوو بۆ سەرکوت کردنی حەمە پاشا سەردار عومەر پاشا والی بەغدا بە لەشکرێکی زەبەلاحەوە هاتە سەر حەمە پاشا و داخوازی لێکرد کە جافەکان نیشتەجێ بکات و تەبەعیەتی یەکێ لەم دوو دەوڵەتە وەربگرن، حەمە پاشا بەوپەڕی بوێرییەوە ئەو فەرمانەی قەبوڵ نەکرد، وە خۆی بۆ بەرەنگاری ئامادەکرد، جافەکان کەوتنە بەر شاڵاوی توندی لەشکری عوسمانی و شەڕو پێکدادان لە نێوانیاندا دەستی پێکرد، چەندین دێهاتی جافەکان لە بناری هەڵەبجەدا سوتێنرا و جافەکان لەو شەڕەشدا دەشکێن و لە ناوچەی شەمێران و کەژی و زمناکۆ خۆیان دەگرنەوە(٤٦).

نازانم ئەمە چۆن خزمەتکاریەکە ئاغا خزمەتکارەکەی تاڵان بکات و دێهاتەکانی بسوتێنێت، وە ئەگەر ئەم بەرپرسیارەتیە کە پاراستنی سنوور بە

جافەکان سپێردرابوو وەکو بەڕێزتان دەفەرموون بۆچ سەردار عمر پاشا جاف تالآن دەکات و دێهاتەکانیان دەسوتێنێت، بەپێی زانیاری بەندە بەهیچ جۆرێك لە کتێبەکەی فەریق دەروێش پاشادا بە ناونیشانی(تحدید الحدود) یا سیاحەتنامەکەی خورشید پاشادا باسی پاراستنی سنور لە لایەن جافەکانەوە نەکراوە نازانم ئەم چەواشەکاریە بۆچی و سوودی چییە؟

بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی جەنابت بەڵگە فەرمیەکانی وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری جەخت لەسەر ئەوە دەکەن دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگەی بالوێزخانەکانیەوە لە تاران بە فەرمی لە دەوڵەتی ئێران داخوازی بەدەستەوەدانی حەمە پاشای جاف و شێخ عوبەیدوڵای نەهرییان کردووە چونکە سنورەکانی دەوڵەتی عوسمانیان شێواندووەو دەست درێژیان بۆ سەر ئەو دەوڵەتە گەیشتۆتە ڕادەیەکی مەترسیدار و ئەمەیشە بە پێچەوانەی ڕێکەوتننامەی دۆستایەتییە کە لە نێو هەردوو دەوڵەتەکە واژووکراوە[٤٧].

ئەمما سەبارەت بە پەیوەندی هۆزی جاف و سەرکردەکانی لەگەڵ پاشاکانی میرنشینی بابان دا، لە حەقیقەتدا پەیوەندییەکی تۆکمەو پتەوو بووە و جافەکان هێزی چەکداری ئەو میرنشینە بوونە و لە پاراستن و پەرەسەندنی ئەو میرنشینەدا درێغییان نەکردووە.

بەڕێزت ڕاستت نەپێکاوە بێ بەڵگە دەفەرموی عوسمانیەکان و فارسەکان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی هەرەس بە بابانەکان بێنن، بەچی، تەبعەن بە جافەکان[٤٨].

ئەم بۆچوونەت دوورە لە حەقیقەتەوە وەکو باسمکرد ڕێکەوتننامەی ئەرزڕۆمی دووەم ئامانجەکەی لە نێوبردنی سەرجەم میرنشینە کوردەکان بووە وە ئەم ڕێککەوتننامەیە ڕاستەوخۆ دژی میللەتی کورد بە گشتی و میرنشینە

زۆرێك لە ناوەندە ئەكادیمی و ستراتیژی و بڕیارو فەیلەسوفان و میدیاكانی جیهانی بە خۆیەوە سەرقاڵ كردووە كە هەوڵ دەدەن لایەنە شاراوەكانی كلتوری و سیاسی و زانستی و فیكریەكانی ناو هەریەك لەو شارستانیەتانەی جیهان دەربخەن و لە ڕاددەو كاریگەری بوون و پەیوەندی و ململانێی نێوانیان بكۆڵنەوە تا لەو ڕێگایەوە دیاردەو ڕووداوەكانی جیهان شیكار بكەن، پاشان نووسەر چەند هەڵوەستەیەك لەسەر ئەو هەوڵ و مەرجانە پڕ لە گرفتەكان دەكات كە لە ئەنجامی گەیاندنی لێكۆڵینەوەكەدا دووچاری هاتوون لەوانە داڕشتنی ناوەڕۆكی لێكۆڵینەوەكە كە زۆر بە وردی و دیقەتەوە بە فۆڕمێكی تازەگەریانە بەدەر لە ستایلی تەكنیكی گێڕانەوە، دوا بەدوای پێشەكیەكە دێتە سەر شیكردنەوەی سەرچاوەكان كە پشت بەستن بە كۆمەڵێك سەرچاوە ڕاستیەكانی تۆماركردوە تۆماركردنەكەش هەمووی بە سەلماندنی بەڵگەنەویست و بە سەرچاوەی ڕەسەن (المصادر) و سەرچاوە نوێیەكان (المراجع) و سەرچاوەی كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و سەرچاوەی ئەلیكترۆنیەكان كە لە خزمەتی ناوەڕۆكی لێكۆڵینەوەكەدان و بووە بە هەوێنی توێژینەوەكەی كە ئەمە خۆی لە خۆیدا ماندوبونێكی زۆری ویستووە.

وا دیارە توێژەر لە بەشی یەكەمدا لە ڕەچەڵەكی شارستانیەت و بنەماكانی شارستانیەتی یۆنان دەست پێدەكات كە چۆن بە قۆناغ و كات دوای كات بەپێی بارودۆخی تایبەتی ئەو كاتەی تێیدا گەشە دەكات یان نوسشتی تێدا دەهێنێت، پێناسە دەكات وەك دەروازەیەك بۆچونە ناو باسەكە تا خوێنەر لە مەبەستەكەی تێبگات، لە باسی یەكەمدا باسی شارستانیەتی كردووە لە هەردوو ڕووی زمان و زاراوەی بنەچەكانی ئەم زاراوەی لە ڕووی زمانیەوە دەرخستووە، دێتە سەر وشەی شارستانیەت و بەپێی مانای زمانەوانی لێكیداوەتەوەو چاوگی

زمانەوانیەکەی دەرهێناوەو بەراوردی کردوە لە نێوان زۆربەی زمانە زیندوەکانی ئەورووپا و ڕاڤەی دەکات چی دەگەیەنێ لە زمانە زیندوەکانی ئەورووپا لەم بارەیەوە ڕاڤەیەکی بە برشتی کردووە وەڵامی ئەو پرسیارە دادەتەوە، ئینجا ئاوڕدانەوەیەکی فەلسەفی و هەڵوێستی چەند زاناو بیرمەندێکی فیکری وەك نمونە هێناوەتەوە لە گواستنەوەی حەرفی هەندێ مەفاهیم و چەمك و هەندێ بۆچوون لەوانە (إبن خلدون) دەڵێت: ((شارستانیەت بریتیە لە هونەری زیادەڕۆیی لە بنەماکانی پیشەسازی بەکارهاتوودا بە تەواوی شێوەو جۆرەکانیەوە کە خۆی لە دروستکردنی خواردن و جلوبەرگ و بیناسازی و باقی کەلوپەلی ناو ماڵدا دەبینێتەوە، دیارە ئەمانەش پێویستی بە دروستکردن و قوڵبونەوە هەیە لە بابەتەکاندا و بەم قولبونەوەیەش کەسەکان دەبن بە پسپۆڕ و شارەزا و لێرەوەشەوە کۆمەڵگا لە کۆچەری بەرەو شارنشینی و شارستانیەت دەڕوات)) هەروەها قسە بەناوبانگەکەی (ئەنگلسی) بیریار لە چەند دێڕێك بەیاندەکات و دەڵێت: ((شارستانیەت بریتیە لەو پلەوپایەی پێشکەوتنی کۆمەڵگا کە تیایدا دابەشکردنی کار و ئاڵوگۆڕ لە نێوان تاکەکاندا ڕوودەدات بەهۆی ڕوودانی ئەم دوو کارکتەرەشەوە دیاردەی بەرهەمهێنانی شتومەك تەواو دەردەکەوێت، کاتێکیش ئەم سێ کارەکتەرە لە کۆمەڵگایەکدا دەبێـە هۆی پێشکەوتنی)).

لێکۆڵەری ناوبراو هەر لە درێژەی تاوتوێکردنی لە بەشی یەکەمدا زۆر گەلێك لەو کەلتور و سەرچاوە و فەرهەنگ و شارستانیەتی مرۆڤایەتیمان بۆ دەست نیشان دەکات، ئاماژە بە کۆمەڵێك ڕونکردنەوەی زانستی دەدا (لە ڕووی زمانەوە هاوتایەکی نزیك لە نێوان زۆربەی زمانەکان هەبووە) وە لە بەرامبەر زمانی عەرەبی شارستانیەت بە (حضارة) پێچەوانەی کۆچەری (بداوة)یە کە لە جێیەکدا

ئاوها ئاماژەی پێداوە شارستانیەت (حضارة) پێچەوانەی کۆچەری (بداوة)یەو ئەمەش بۆ خۆی بەرامبەر لەگەڵ کێوییبون و بەربەریەتدا شارستانیەت بریتیە لە قۆناغێکی بەرز لە قۆناغەکانی گەشەسەندنی مرۆڤایەتی و کۆکردنەوەیەکە بۆ نەتەوەیەکی تر دەگوازرێتەوەو لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگوێزرێتەوە.

توێژەر لە باسی دووەمدا دێت بە جیا بەپێی گۆرانی قۆناغە مێژووەکەی قسە لە بارەی قۆناغە سەرەکیەکانی شارستانیەتی یۆنانی دەکات قۆناغێك کە پڕە لە کاریگەری شارستانیەتی یۆنانی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامیا کە لە سێ خاڵی سەرەکی بەرجەستەی کردوون و لێرەدا ئاماژەکردن بەو سێ خاڵە گرنگ دەبێ:

یەکەمیان: قۆناغی پەرەسەندن و دروست بوون (قۆناغی کۆن) نوسەر لەو قۆناغەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە شارستانیەتی یۆنانی لە بوارەکانی فەلسەفەو هونەرو شانۆ و مێژوو دەرکەوتن لەوانە (تالیس ٦٢٤-٥٢٦) بە دیارترین کەسی ناو ئەم شارستانیەتە دادەنرێت و بەیەکەم کەس و بە پێشەنگ دادەنرێت کە لەم شارستانیەتەدا سەرەتا بە زانست و حیکمەتەوە خەریك بووبێ، چەندین جار بە مەبەستی بازرگانی کردن سەردانی میسری کردووە و هەروەها گەلێك گەورە بیرمەندان و فەلسەفەکارانی تری گریگیەکان وەك (فیساگۆرس، دیموکریتس، ئەفلاتون، ئۆدۆکسیۆس) سەردانی میسر کردووە چەند سەرەتایەك لە بارەی زانستی ئەندازەیی بەتایبەتی ئەوەی میسر پێی گەیشتووە سوودی لێوەربگرن و پاشان بۆخۆیان کۆمەڵێك داهێنەرکاریی تیادا بکەن، پاشان چەند قوتابخانەیەکی سروشتی و فەلسەفی دروست دەبێت کە ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسوفانی لەخۆدەگرێت لە دیارترینیان (ئەمباکلیس، دیموکریتس، ئەنکسالۆگیۆس) ئەوەی یەکەمیان پێی وابوو کە بنەماکانی جیهان لە چوار

ڕەگەزی سەرەکی پێکدێت (ئاو، ئاگر، خۆڵ، هەوا) هەروەها تێفکرینی دیموکریتیش لە گریمانەی سروشت بە جۆرێك کە پێی وایە جیهان پێکدێت لە چەند یەکەیەکی کۆتایی نەهاتووە لە ژمارەدا کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و ئەمانیش بریتین لە چەند ئەتۆمیك سەرجەم شتومەك و بابەتەکانی سروشت لە چەند بەشێك پێکدێن و هاوشێوەی سروشتن و بە شێوەیەکی ڕێکخراو دەخولێنەوە.

سێهەمیان: لاوازبوون و دارمان (قۆناغی هیلنستی): لەم قۆناغەدا گەلێ فەیلەسوف و بیریارو زانا دەرکەوتن کە ڕۆڵی دیاتریان هەبوو لە داهێنان و پێشخستنی زانست لەم شارستانیەتەدا بەتایبەتی لەم قۆناغەدا کە بەرهەمەکانیان کاریگەری تەواوی لەسەر شارستانیەتی ئیسلامی هەبوو لە دیارترینیان ئەمانە (ئەقلیلس ٣٦٥-٣٠٠پ.ز)و (ئەرخەمیدس ٢٨٧-٢١٢پ.ز)، (ئەپۆلۆنیۆس ٢٦٠-٢٠٠پ.ز)و (هیپشیکلس)و (جالینۆس ١٣١-٢٠١پ.ز). لێکۆڵینەوەکانی ئەوانە زێتر بواری ئەندازیاری و گەردووناسی و میکانیك و فیزیاوە و لقەکانی پزیشکی و بیرکاریی و جوگرافیا بوو.

لە بەشی دووەمدا نووسەر لە باسی یەکەمدا بە بایەخێکی قول و نەپساوەوە باس لەو هەلومەرج و ڕێگا گرنگانە دەکات کە پێشینە بوون بۆ دروست بوون و کاریگەری شارستانیەتی یۆنان، وە توێژەر ڕوونی دەکاتەوە ئەویش لە ڕێگای فەتحکردنی ناوەندە شارستانیەکان، ڕۆڵیان لە گەیاندنی ئەو شارستانیەتە بە شارستانیەتی ئیسلامی لەم بەشەدا لێکۆڵەر هەموو ئەو لایەنانە ئەو ڕۆژگارە دەخاتە بەر نیگامان و جەخت لەسەر ناوەندەکان دەکات کە چۆن چەند ناوچەیەك دەکەوێتە ژێر سایەی خەلافەتی ئیسلامی کە بەناوچەکانی ناوەندی شارستانیەتی یۆنانی لە ڕۆژهەلات ناسرابوون ئەم ناوچانەش بەهۆی ئەو

خوێندنگایانەی کە تیایدا بوون بۆ خوێندنی شارستانیەتی یۆنانی توانیان ڕۆڵی سەرەکی ببینن لە گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی بۆ شارستانیەتی ئیسلامی چ بە وەرگێڕانی ئەو زانستانە بێت یان بە بڵاوکردنەوەیان بێت لە نێو خەڵکدا دیاترین ئەو ناوەندو زانستە گرنگانەی شارستانی یۆنانبوون ئەمانەن(ئەسکەندەریە، حران، نصیبین، روها(ئورفە)، ئەنتاکیە، جندیسابور).

ئەسکەندەریە پایتەختی دەوڵەتی بتالمە بووە بە جۆرێك کە ئەو شارە بەناوبانگترین کتێبخانەی دەوڵەمەندی سەردەمی خۆی بوو لەم ڕۆژگارەدا چەند بیرمەندێکی مەزن دەرکەوتن کە بەرهەمەکانیان پاش وەرگێڕانیان بۆ زمانی عەرەبی لە سەردەمی یەکەمی عەباسیەکاندا دەوری گەورەیان هەبوو لە ڕابونی شارستانیەتی ئیسلامیدا وە بەدەر لە زانستی فەلسەفە و پزیشك چەندین زانستی ترە وەك گەردووناسی و کیمیایی تێدا دەرکەوت کەواتە بۆمان دەردەکەوێت وەرگێران ڕۆڵێی پۆزەتیفی بینیوە لە ڕووی هۆشیارکردنەوەی خەڵکانی خوێندەوار وەك کەناڵێکی کارتێکەری کاریگەر لە مەیدانی زانستخوازیدا، کە لە بەشی سێیەم دا بە ڕووی قسە لەسەر کردەی وەرگێڕان دەکەم.

لە باسی دووەمدا لێکۆڵەر بە پێی هەنگاوە مێژووییەکە لە ئەنجامی پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامیدا بۆ هەرێمەکانی (عێراق و شام و فارس و میسر) کە نەتەوەی گەلی ناعەرەب و ناموسڵمانەکان لە گەیاندن و پەرەپیدانی شارستانیەتی یۆنانی لە نێو هەناوی شارستانیەتی ئیسلامیدا بەرەو پێشی بردوون، دەخاتە ژێر تیشکی توێژینەوەکەی، نووسەر زۆر بە وردی ڕۆشنایی دەخاتە سەر چەند لایەنێکی تایبەتی دەڵێت: ((ئەم گەل و نەتەوانەی تێڕوانین و بۆچونیان سەبارەت بەم نوێیە جیاوازبوو، لێرەوە هەندێکیان بوون بە موسڵمان و بە(موالی)یەکان ناسران هەندێکی تریشیان بەتایبەتی ئەوانەیان کە (أهل

الکتاب)یان پێدەگوترا لە (مەسیحی و جولەکە و صابیئە و مەجوس) لەسەر ئاینی خۆیان مانەوەو بە(اهل الذمة) ناسراون)) پاشان نڤیسکار زیاتری لەسەری دەڕوات و دەبێژێت: بە تێڕوانینیشمان لە بارودۆخی تایبەتی هەریەك لەم دوو کۆمەڵەیە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا دەتوانین لە ڕێژەی بەشدارییان لە شارستانیەتی ئیسلامییدا بکەین کە ڕۆڵی گەورەیان لە بەرەو پێشبردنی شارستانیەتی ئیسلامی بەردەکەوێت ئەمیش بە ئاوێتە بوونی شارستانیەتەکەیان لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامیدا.

لە بەشی سێیەم دا تیشکی لێکدانەوەی ئەکادیمی دەخاتە سەر ڕێگای دووەمی گەیشتنی شارستانیەتی یۆنان بۆ سەر شارستانیەتی ئیسلامی کە قورسایی لێ توێژینەوەکەی لەم بەشەو بەشەکەی دی پێك هاتووەو هەر لە باسی یەکەمدا پێ لەسەر دیاردەو هۆکارەکانی بزوتنەوەی وەرگێڕان دادەگرێت لە سەرەتایی فەرمانڕەوایی عەباسیەکان کە بەغداو بەسرا مەڵبەندی ڕۆشنبیری و خوێندەواری عەرەبی بوون لەم ڕۆژگارەدا بوو بە شێوەیەکی دیسپلین و لەسەر بنەمایەکی پتەو دەستکرا بە ئاشنایەتی پەیداکردن لە شارستانیەتی گریك و ڕۆمانی کۆن بەتایبەتی بە خوێندنەوەی وەرگێڕان لە گریکی و لاتینیەوە دەستی پێکرد بۆ زمانی عەرەبی، لێرەشەوە کردەی وەرگێڕان پانتایەکی بەرفراوانی لە دنیای ڕۆشنبیری و کەلتوریدا داگیرکردو، بە شێوازێك لە شێوازەکان بووە ناسنامەی کەلتوری و فەرهەنگی و بە فەرمانڕەوایەکی دەوڵەمەند دادەنرێت لە ڕووی وەرگێڕان و دەوڵەمەندی فکرو کەلتوردا بە جۆرێك زۆربەی بیریارو قوتابخانە فکریەکانی بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرگێڕاون توانیویانە سودو بەهایەکی فرە لە ئەرەستۆ و ئەفلاتون وەربگرن و بیانکەنە عەرەبی، مەبەستم بیری ئەم فەیلەسوفانە بۆ سەر زمانەکە وەرگێڕا، توێژەر بەجیا قسە لەسەر

هەڵوێستەکانی خەلیفەکان دەکات لە پێشخستنی وەرگێڕان بەتایبەتی (خەلیفە ابوجعفر منصور، هارون الرشید، خەلیفە مائمون، ئەلواسیق بیللا) جموجۆڵێکی بەرفراوانیان لە کردەی وەرگێڕان ڕەخساند کە هانی وەگێڕان و چالاکبونی بزوتنەوەی وەرگێڕانیان داوە کە لەو زەمەنەدا توانرا بەرهەمەکانی عەقل وەرگێڕدرێنە سەر زمانی عەرەبی بە جۆرێك ئەو سەردەمە بە قۆناغی زێڕینی بزوتنەوەی وەرگێڕان دادەنرێت وەك لێکۆڵەر ئاماژە دەکاو زیاتر پێی وایە دەڵێ: "بزوتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی یەکەمی عەباسیەکاندا، هەرچەندە ئەم بزوتنەوەی وەرگێڕانە لە سەردەمی یەکەمی عەباسیەکاندا وەك بزوتنەوەیەکی داڕێژراو ڕێك دەردەکەون، بە جۆرێکی دیکە دەرکەوتەوە گەیشتە لوتکە، پاشان لێکۆڵەر لەسەر ڕوونکردنەوە زانستیەکەی دا زیاتر لەسەری دەڕوات و بەردەوام دەبێت و دەڵێت: (لەم سەردەمەدا کە سەردەمی ڕابونی زانست و پەرەسەندن و بنیاتنانی شارستانیەی ئیسلامی دادەنرێت، یەکێك لە گرنگترین ڕوخسارەکانی ئەو ڕابوونە زانستیەش بریتیە لە بزوتنەوەی وەرگێڕان لەم سەردەمەدا بەتایبەتیش لە شارستانیەتی یۆنانیەوە بۆ شارستانیەتی ئیسلامی بابەتێکی وا کە تەواوی سەردەمی یەکەمی عەباسیەکانی پێدەناسرێتەوە، بەڵام دیارە ئەمە مانای ئەوەنیە کە سەرجەم خەلیفەکانی ئەم سەردەمە وەك یەك وابوبێتن لە گرنگی پێدانی بابەتەکەدا و سەردەمەکانیدا وەك یەك تیایدا بزوتنەوەی وەرگێڕان پەرەسەندوو، بەڵکو ئەم بابەتە لە سەردەمی خەلیفەیەکەوە بۆ خەلیفەیەکی دیکە گۆڕانکاریی بەسەرداهاتووە و هەریەکە و دیاردە و هۆکاری تایبەتی سەردەمی خۆی هەبووە کە کاری کردۆتە سەر بابەتی بزوتنەوەی وەرگێڕان.

کاك زریان حاجی لە درێژەی باسەکەیدا دیسان دێتەوە بە جیا قسە لەسەر هەڵوێستەکانی خەلیفە و هەندێك بنەماڵە و زۆرێك لە خەلیفەکان لە ڕێگای

لێکۆڵینەوەکەیدا دەکات، بەڕاستی هەندێك لەو داهێنانە لەوانەیە مرۆڤ بۆ یەکەم جار بڕوایان پێ بکات بەتایبەتی کاتێك کە ئەوەمان بۆ دەست نیشان دەکات کە خەلیفە منصور یەکەم خەلیفە بووە کە لەم سەردەمیدا گشت زمانەکانی سریانی و عەجەمی بۆ وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، لە سەردەمی ئەودا چەندین دانراوی جیاواز لە چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆرەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی وە یەکەم خەلیفە بووە کە ئەستێرەناسانی لە خۆی نزیك دەکردەوە کاری بە بنەماکانی ئەستێرە ناسی کردووە، لێکۆڵەر لە زمانی (إبن خلدون) دەڵێت: ((ابوجعفر المنصور ناردی بۆ لای پادشای ڕۆمانیی بۆ ئەوەی کە کتێبی لە بواری زانستەکاندا بۆ بنێرێ، ئەویش کتێبی اقلیدس و هەندێك کتێبی لە بواری سروشتناسیدا بۆ نارد پاشان موسڵمانان خوێندیانەوە)).

پەیبردنی هارونە الرشید لە درێژەی فەرمانڕەوایی مێژوویەکەی خۆیدا بۆ سەلماندن و بنیاتنانی شارستانی و نوسەر زۆر بە چڕوپڕی ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە خەلیفە نوێنەری خۆی دەنارد بۆ ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی تا هەرچیان لە کتێب و دەستنوسی گرنگی یۆنانی دەست دەکەوێت بیکڕن و پەیدای بکەن و لەگەڵ خۆیاندا بیهێننەوە بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندیان بە بواری پزیشکیەوە هەبووە لەم بوارەشدا چەندین پارەی زۆری خەرج کردووە، کاتێکیش هەردوو شاری (انقرەو عموریە) فەتح دەکات فەرمان دەکات بەوەی کە دەست لە کتێبخانەکانیان نەدرێن پاشان ژمارەیەك لە زانایان و وەرگێڕکارانی لە بەغداوە بۆ دەنێرێت بۆ ئەوەی کتێبە گرنگە ناوازەکانیان کە دەست ناکەوێت دەربهێنن بەتایبەتی لە بوارەکانی پزیشکی و فەلسەفی و گەردوناسیدا. نوسەر بە بایەخەوە باس لە دروست بوونی دەزگایەکی بەنرخ و بایەخی وەك (بیت الحکمە) کردووە کە بە دامەزراندنی بناغەی وەرگێڕان چووە

قۆناغێکی نوێوەو کە ڕێگا خۆشکەر بووە بۆ داهێنان و ئبداع کردن وەرگرتنی شارستانیەتی یۆنان بووە بە کارێکی بە دەزگاو ڕێکخراو، کەواتە لە خۆڕایی نیە کە ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەمریکی (استانوودکب) دەڵێت: ((بیت الحکمە یەکەم زانکۆ بووە کە لە جیهاندا دامەزرابێت بە مانا نوێیەکەی)).

لێکۆلەر وەك ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە ڕێگای سەرچاوە مێژووییەکاندا ئەو ڕاستیەی خستۆتە ژێرباری لێکۆڵینەوەکەی کە خەلیفە مەئمون و خەلیفە الواثق باللە ئەگەر خەلیفە نەبوونایە ئەوا یەکێك دەبوون لە زانا گەورەکانی سەردەمی یەکەمی عەباسیەکان بەجۆرێك کە خەلیفە مەئمون بە (حکیم بنی عەباسی) ناسرابو خەلیفە الواثق باللە)ش کەسایەتیەکی خاوەن پلەوپایەو عەقل بووە زمان پاراو و شاعیر بووە، هاوشێوەی مەئمون بووە لە جوڵە وەستاندا، سەرچاوە دیکۆمێنت و بەڵگەنامە زانستیانەی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە سەردەمی ئەم خەلیفەدا بایەخدان و گرنگی پێدانێکی زۆر گەورە هەبووە بۆ زانایان و زانیاری بە جۆرێك کە چەندین کۆڕ دەگێڕا لە سەردەمی ئەم خەلیفە داو خەلیفە بۆ خۆی ئامادە دەبوو کە تیایدا ئامادەبوان پرسیاریان لە زانایان دەکردو ئەوانیش وەڵامیان دەدانەوە.

لە باسی دووەمدا، باس لە دەستە بژێرێك لە گرنگترین وەرگێڕکارانی سەردەمی عەباسیەکان و بەرهەم و شێوازەکانی هەریەکەیان دەکات بەتایبەتی لەوانە (یوحنا بن بەتریق، حەجاج بن مەتر، یوحننا بن ماسویە، حونەین بن ئیسحاق ئەلعابیدی، یەعقوب بن ئیسحاق ئەلکیندی، قیستا بن لۆقا بە علەبەگی، حبیش بن ئەلحەسەن ئەلئەعسەم) کە هەریەك لەم وەرگێڕانە بەیەك شێوازو بەهاو واتایی کاری وەرگێڕانیان نەکردووە بەڵکو جیاوازی لە نێوانیان هەبوو، لە ڕووی مانا دەربڕین و شێوازی نووسین و داڕشتنەوەی دەقەکاندا ئەمەش

وایکردووە جیاوازی هەبێت لە نێوان ئەو وەرگێڕکارانەدا دواجار لە کۆتایی ئەم باسەدا نووسەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم وەرگێڕکارانە سەرباری ئەوەی کە کاری وەرگێڕانیان کردووە، ڕۆڵێکی زۆر گەورەشیان هەبووە لە برەودان و بەرەو پێشبردن و بلاوکردنەوەو کاریگەری بوونی شارستانیەتی یۆنانی لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، ئەمەش چ لە ڕێگای پێڕەوکردنی ئەو زانستانەوە بێت لە ناو شارستانیەتی ئیسلامی و هەروەها دانانی کتێب بێت بەو زانستانەی کە لە وەرگێڕانەکانەوە دەستیان کەوتووە.

دوا وێستگەی کتێبەکە بەشی چوارەمە کەتێیدا نووسەر لە پوختەی ئەو زانست و یاسانە دەدوێت کە بە زانستە پەتیەکان (العلوم الصرف) ناسراون لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە کە بە دەستی هێناوەو باس لە ئاوێتە بوونی هەریەکە لە زانستەکانی (پزیشکی، بیرکاری، ئەندازیاریەکان، زانستی سێگۆشە، گەردونناسی، فیزیایی، میکانیکی(علم الحیل)، زانستی زیندەوزانی(ئاژەڵ-ڕووەك) وە سەرجەم لایەنەکانی ئەو ڕەنگدانەوەی لە وەرگێڕانی کتێبەکانی ڕۆژئاوا لەسەر بابەتەکە و ڕەنگدانەوەی لەسەر هزرڤان و فەیلەسوفان، ناساندووە و بە پوختی لە بەرهەمەکانیان دواوە، لەسەرێکی دیکەشەوە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا ڕەنگدانەوەی زانستەکانی بیرکاری، ماتماتیك، چوار بەشی سەرەکی دەگرێتەوە کە ئەوانیش (علم الحساب، علم الجبر، والمقابلة، هندسة، المثلثات) ئامادەگیەتی زۆر بەرچاوی هەیە لە نێو هزری ئیسلامی و هەرچی یەکەم و دووەمە زیاتر ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی هندییە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا. هەر لە میانەی درێژەی لێکۆڵینەوەکەیدا بەڕێز زریان حاجی دیارترین ئەو ڕەنگدانەوەی لەسەر شارستانیەتی ئیسلامییدا لە بواری

زانستەکانی گەردووناسی و پزیشکی هەبوون لە سێ خاڵدا بەرجەستەی کردوون کە شایستەی ئاماژە پێدانە:

یەکەمیان: وەرگێڕانی چەند کتێبێکی بواری گەردووناسی یۆنان و ڕەنگدانەوەی ئەم کتێبە لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیدا.

دووەمیان: ناوەندەکانی چاودێریکردنی گەردوون: سەرەتای دروستبونی ئەم ناوەندانەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلیفە مەئمون ئەویش پاش ئەوەی خەلیفە زانیارییەکانی ناو کتێبی (المجسطي) خوێندەوە و باسی ئامێرەکانی لێکدانەوەی گەردووناسی تیادا بینی بۆیە فەرمانیدا بە ژمارەیەك لە بیرکاریزان و گەردوونزانەکانی سەردەمی خۆی کە هەستن بە لێکدانەوەی (ارصاد)ی هەسارەکان و ئەو زانیاریانە ڕاست بکەنەوە کە لەو کتێبەدا هاتووە ئەو ئامێرانەش پەیدابکەن و لێکدانەوەیان لەسەر بکەن کە لەو کتێبە ئاماژەیان بۆ کراوە، ئەوەبوو لە ساڵی (٢١٥-٨٣٠ك) ناوەندێکی لێکدانەوەی گەردووناسی لە ناوچەی (الشماسیه) لە بەرزاییەکی بەغداد داناو بە (المرصد المأمونی) ناسرا وە هەروەها لە (دیمەشق)یش و لەسەر چیای (القاسیون) دانرا.

سێیەمیان: ئامێرەکانی لێکدانەوەی گەردووناسی (الات الرصد): ئەم ئامێرە(الاسطرلاب) کە ناوەکەی بۆ خۆی وشەیەکی یۆنانیە بەیەکە ئامێری باوەڕپێکراوی گەردووناسان دادەنرا سودێکی زۆری هەبوو لە بواری گەردوناسی و کەشتیوانی هەر بۆیە موسڵمانان ناویان نابو (الاله الشریفه) ئەم ئامێرە پێکدێت لە قاپێك(قرص)ێکی کانزایی کە دابەشکراوە بەسەر چەند پلەیەکدا و بەدەوری ئەم پلانەدا دوو ژمێرەر دەخولانەوە کە لە هەردوولاوە دوو

سەری تیژیان هەبوو لە شێوەی ستونی هەڵدەواسراو ڕووی دەکرایە خۆر، هەرکە تیشکی خۆر بە دوو سەرە تیژەکەدا تێپەڕ ببوایە ئەوا بەرزیی هەسارەکانی دەخوێندەوە.

لە باسی دووەمدا هەڵوێستە لەسەر زانستە مرۆڤایەتیەکان و ڕەهەندە جیاجیاکان دەکات وەك(فەلسەفە، جوگرافیا، میوزیك) فەلسەفە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا بە یەکێك لە لقەکانی (العلوم العقلیە)ی سەر بە(العلوم الاوائل) دادەنرێت، سەرلەبەری فەلسەفە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا بە کاریگەری شارستانیەی یۆنانی ڕەنگیداوەتەوە. دواتر دێتە سەر یەکێکی دیکە لەو زانستانەی کە بە کاریگەری شارستانیەتی یۆنانی ڕەنگیداوەتەوە و ڕەنگدانەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە ئەویش زانستی جوگرافیایە بڕوای وایە ئەو ڕەنگدانەوەو سودانەش کە خەریکبوانی بواری جوگرافیا لە کتێبەکانی(بطلیموس)ەوە وەریانگرت، لە دوو خاڵدا دەیان خاتەڕوو:

یەکەمیان: لێیەوە فێری چۆنیەی و درێژی و پانی ناوچەکانی بوون.

دووەمیان: لەم کتێبەوە فێری ئەوەبوون چۆن جیهان دابەش بکەین بەسەر چەند هەرێمێکدا، بەڵام ئەگەر وردتر سەرنج بدەین دەبینین لە بواری موزیکدا ڕەنگدانەوەی کە زێتر لە بوارەکانی دانانی ئاوازو ئامێرەکانی مۆسیقا و شێوازەکانی بەکارهێنانی و گۆرانی وتن و شێوازی دانانی کتێب لەسەر بابەتەکانی موسیقا بە گشتی، لە چەند ڕستەیەکدا ناوی ژمارەیەك لە موزیکژەن و گۆرانی بێژی بردوون، لە دیاترین ئەوانەی کە زۆرترین ڕۆڵیان هەبووە لەم بوارەدا بە پێشەنگ دەناسرێن و نوێکاری و داهێنکاریان لەم بوارەدا کردووە

ئەمانەن(ابراهیم الموصلی، اسحاق بن ابراهیم الموصلی، زریاب) ئەوەی دووەمیان زۆر لە خەلیفەکانی نزیك بووە بەتایبەتی (المامون والواثق) ڕێزێکی زۆریان گرتووە بەڕادەیەکی سەرسوڕهێنەر خەلیفە شەیدای گۆرانی و ژەنینەکانی بووە کە خەلیفە الواثق گوتویەتی (هەرکاتێك کە اسحاق گۆرانیم بۆ دەڵێت وا دەزانم کە لە موڵکەکەم زیاد دەکات) ئەوەی دواییان چەندین داهێنکاریی کردووە لەوانە ژێی پێنجەمی بۆ ئامێری عود داناوە کە لە پێشدا لە چوار ژێ پێکدەهات، و بەیەکەم کەس دادەنرێ کە توانویەتی یەکەم خوێندنگای میوزیك لە شارستانیەتی ئیسلامیدا دابمەزرێنێت و خوێندکارەکانی بە شێوەی چاوپێکەوتن وەردەگیران و بۆ یەکەم جار گروپ و تیپی موسیقای دروستکرد کە سەرجەمیان یەك جۆر جلو بەرگیان لەبەردابوو.

لە کۆتایشدا لە لاپەڕەی (٢٣١)دا ئەنجامە گشتیەکەی نامەکەی بە پازدە خاڵی تێرو تەسەل دیاری کردووە، خاڵە وردو چڕەکان لە پوختەیەکی ئەکادیمیانە لە مەسەلەی ئاوێتەبونی شارستانیەتی ئیسلامی بەشارستانیەتی گریگ و ڕۆمانی کۆن بەپێی ئەو پلانەی نەخشەی بۆ کێشاوەو خستۆتەڕوو کە بە وردی لەم خاڵانەی خوارەوە چڕی دەکەمەوە:

١- تێڕوانینی هاوبەش و جۆرێك لە نزیك بونەوە لە نێوان زۆربەی زمانە زیندوەکان بەدی دەکرێت.

٢- هەموو ئەو پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی و عەقلیانەی کە دەبێتە هۆی بەرەو پێش بردنی کۆمەڵگا لە سەرجەم بوارەکاندا پێیدەوترێت شارستانیەت.

٣- بایەخداری ئەسینا وەك پایتەخت و شوێنگەی هزرڤان و داهێنکاران.

٤- لە ئەنجامی تێکەڵاوکردنی شارستانیەتی رۆژئاوا لەگەل شارستانیەتی رۆژهەلات شارستانیەی (هێللینی) لەدایك بوو کە پایتەختی ئەسکەندەریەی میسر بوو، ئەمەش لە رێگای ئەسکەندەری مەکدۆنی بوو.

٥- دوای بالادەستی کەنیسە لە سەدەکانی ناوەراست، لە سەردەمی ئیمپراتۆری رۆمانی، شارستانیەتی رۆژئاوا پوکایەوە بەلام بەهاتنی شارستانیەتی ئیسلامی لە سەردەمی عەباسەکان توانرا شارستانیەتی ئیسلامی بچێتە سەردەمی زێرینی خۆی.

٦- دەوری فتوحاتی ئیسلامی لە موسلمانبونی زۆر لەگەڵ و نەتەوەی جۆراو جۆر کە بە موالیەکان ناویان دەرکردبوو، هەندێکیشیان لەسەر ئاینی خۆیان مانەوەو پێیان دەگوترا(أهل الکتاب) وەك مەسیحیە سریانەکان و جوولەکەو صابیئەکان کە هەلگری شارستانیەتی رۆژئاوابوون لە پێش فتوحاتدا لەژێر سایەی ئیمپراتۆری رۆمانیدا بوون لە رێگای گفتوگۆ تێکەڵ بوونیان شارستانیەتی رۆژئاوایان گەیاندە شارستانیەتی ئیسلامی.

٧- (أهل الکتاب) یان بە واتایەکی دیکە (اهل الذمة) لە ناو خەلافەتدا تا کۆتایی سەردەمی عەباسیەکان، خاوەن پلەوپایەی تایبەتی بوون ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە چەند لایەنێك بالادەست بن وەك لایەنی پزیشکی و وەرگێراندا.

٨- هەندێك ناوەند لە رۆژهەلاتدا کاریگەری راستەوخۆیان هەبوو لە گەیاندنی شارستانیەتی رۆژئاوا بۆ شارستانیەتی ئیسلامی وەکو شارەکانی (ئەسکەندەریە) لە میسر کە جێگەی ئەسینای گرتبۆوە، هەروەها چەند ناوەندێکی بەهێزی دیکە هەبوون، لەوانە (انطاکیا، نصیبین، روها).

٩- لەسەردەمی عەباسیەکاندا بزوتنەوەی وەرگێران گەیشتە قۆناغی بە دەزگاییون و لەو سەردەمەدا (بیت الحکمە)یان دامەزراند، هەرچی پێشتر هەوڵی وەرگێران تاکەکەسی بوو.

١٠- ئەو هۆکارانەی کەوایکرد بزاڤی وەرگێران، لە چەرخی عەباسیەکاندا بەرەوپێش بڕوات، بریتی بوو لە پاڵنەری ئاینی، کە ئاینی ئیسلام زۆر جەخت دەکات، لەسەر گەڕان بەدوای زانست و زانیاری وەك یەك لە هۆیەکانی دیکە دەرکەوتنی چەند بنەماڵە و کەسایەتی جۆراوجۆر.

١١- ئامانجی بزوتنەوەی وەرگێران لە سەردەمی عەباسیەکان پێکهاتبوو لە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی سەرچاوەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاواو وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی عەرەبی وەك هەوڵی خەرجکردنی پارەیەکی زۆر بۆ کڕینەوەیان و ناردنی چەندین نوێنەر بۆ ناوچەکانی ئیمپراتۆری ڕۆمانی و بە سەرنجدان لە ڕێگای دبلوماسی.

١٢- کاتێك باسی وەرگێران دەکرێت لە سەردەمی عەباسیەکان، پێویستە ناوی چەند وەرگێرێك ئاماژەی پێ بکەین کە چەندین جار خەڵات کراون لە کارەکانیدا وەك (یوحنا بن ماسویە، حجاج بن مصر، حنین بن اسحاق، اسحاق بن حنین، حبیش بن اعسم، الکندی).

١٣- شارستانیەتی ڕۆژئاوا ڕەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو لە ڕۆژگاری عەباسیەکان چونکە ئەو کات شارستانیەتی ڕۆژئاوایان وەرگرت و بەدەستیان هێنا.

١٤- ئەو زانستانەی کە بەدەستهێنرا لە رۆژئاوا بریتی بوو لە پزیشکی، بیرکاری، گەردوونی، فیزیا، میکانیك، زیندەوەرزانی کە تیایدا زانیاریە وەرگیراوەکان کە داهێنانی گەورەیان تیایدا وەرگیرا لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە.

١٥- لە چەرخی عەباسیەکاندا فکری ئیسلامی کرانەوەی زیاترو پێشکەوتنی گەورەی بەخۆیەوە بینی کە بریتی بوو لە فەلسەفەو میوزیك و جوگرافیا بەوەدا پێشتر شارستانی ئیسلامی لەم بوارەدا لە پاشەکشەدا بوو.

سەرچاوەو پەراوێزی باسەکەی بە فۆرمێکی زانستانەو ئەکادیمی رێکخستووە، لە پاشکۆو پاشبەندی لاپەڕەکانی کۆتایدا کورتەی نامەکەی بە زمانی عەرەبی بڵاوکردۆتەوە و دوای ئەویش لە پاشکۆکاندا چەندین نەخشەو وێنەی ئامێرو هێلکاری نایابی مێژووی تێدا دەرخستووە بۆ ناساندن و ڕوونکردنەوەی بابەتەکانی.

لە دوا دوایدا ئەم کتێبە هێشتا مایەی قوڵبوونەوەو تێڕامانی زێترو زێترن وەکو ڕوون و ئاشکرایە ئەم لێکۆڵینەوە مێژووییانە چەند پێویست بوو بۆ بواری کەلتوری و ژیاری و کایە جیا جیاکانی مەعریفە، ئەم کتێبە شایستەی ئەوەیە بە یەکێ لە کتێبە دەوڵەمەندو پڕ بابەخەکانی لە قەڵەم بدەین چونکە چەندین دیراسەتی لە دەلاقەی جۆراوجۆرەوە لەخۆگرتووە، هەر بۆیەش ئەوە هەڵدەگرێ وەکو مەنهەجێکی سەرکەوتوو لە زانکۆکان وەکو سەرچاوەیەکی بەهێزو ئەرشیفێکی بە بڕشت و ئەکتیف سوودی لێوەربگیرێت و بخوێنرێت لەبەر ئەوەی لە زانکۆکاندا لە خوێندنی مێژووی دەوڵەتی عەباسی نوقسانی و کەمتەرخەمیەکی گەورە بەرچاو دەکەوێت بەدەر لەوەش دەبێتە کار ئاسانی و سەرچاوەیەکی

مێژووی ڕەخنەگرانە بۆ بارودۆخی عەباسیەکان تا بەو هۆیەوە قوتابیانی خوێندنی ئەکادیمی بۆ نوسینی تێزو ئەتروحە بە بایەخەوە لێی دەڕوانن ئەم جۆرە توێژینەوانە بە ناوەڕۆك تەرزانە بابەتی تازەن لە کتێبخانەی کوردیدا، بەڕاستی هەوڵی ئەو بەرێزە لە جێی خۆیدایە بۆ زیاتر شارەزاو پەیداکردنی زانیاری لە مەڕ فەرهەنگ و ڕۆشنبیری و شارستانیەتی گریکی لە نێو شوێنگەی خەلافەتدا کە هێشتا پسپۆڕی ئەو بوارەمان هەر نیە ئەوەی هەشمانە هەر بە خولیاو ئارەزووی نوسین دور لە چەمك و دیدێکی ئەکادیمی بە دوای ئەو لایەنە کەوتووە کە بە هەق ئەو کارەی کاك زریان حاجی بێگومان بەدڵنیاییەوە کارێکی تا بڵێی شایان و مایەی دەستخۆشی و ڕێزلێنان و دڵخۆشی هەموو لایەکمانە و نەخشەش لە دکتۆراکەی، بە ئومێدی سەرکەوتن و سەرفرازی و بەرهەمی بە برشترو سوود بە مێژوو و ڕۆشنبیری کورد بگەیەنێ.

# کتێب فرۆشییەك بۆ مێژوو

د.محمد عبدالله کاکەسور

کتێبخانەی گشتی و کتێبخانەی زانکۆ و کۆلێژ و بەشەکان و کتێبخانەی کەسەکان لە کوردستان بوونیان هەیە. کتێبخانەی گشتی لە شارەکانی هەولێرو کەرکوك و سلێمانی مێژووەکەیان بۆ ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. زانکۆی سەلاحەددین کتێبخانەیەکی ناوەندی دەوڵەمەندی هەیە هیوادارین بە بەردەوامی پتریش دەوڵەمەند بکرێت کتێبی زیاتری بۆ بکڕێت و پێشکەش بکرێت. کۆلیژی ئادابی زانکۆی دهۆك خاوەن کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندە. بەشی مێژووی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین خاوەن کتێبخانەیەکی مێژوویی زۆر دەوڵەمەندە لەوانەیە تاکو ئێستا گەورەترین کتێبخانەی تایبەت بە بواری مێژوو بێت لە کوردستانی عێراقدا.

لە کتێبخانە کەسی و تایبەتیەکاندا کەسانێکی زۆر لە کوردستاندا جێگایەکیان لە ماڵی خۆیان بۆ کتێبخانە تەرخان کردووە لەم ڕووەوە دەکرێت لە هەولێر ئاماژە بە کتێبخانەی مامۆستایان(ممتاز حیدری و طارق جمبان) بکەین کە خاوەن کتێبخانەی گەورەو دەوڵەمەندن و دەرگایان کراوەیە بۆ خەڵکی بەتایبەتی قوتابیانی خوێندنی باڵا لە بوارە مرۆڤایەتییەکان سوودیان لێ ببینن.

ئەوانەی ئاماژەیان بۆ کرا بە کتێبخانە ناونراون بەڵام لە کوردستان وەکو شوێنانی تریش چەند دوکانێك هەن کە کتێب دەفرۆشن بە باش دەزانرێ ئەمانە بە کتێب فرۆش بناسرێن بۆ جیاکردنەوەیان لە کتێبخانەکان کە ئاماژەمان

پێکردن. بە شێوەیەکی گشتی شوێنەکانی فرۆشتنی کتێب لە کوردستان بچووکن و پسپۆڕیەتیان لە فرۆشتنی جۆرێك لە کتێب کەمە بێجگە لە هەندێك دوکانی کتێب فرۆشی لە هەولێر تایبەتن بە فرۆشتنی کتێبی ئاینی.

سوپەرماکێتەکانی کوردستان شوێنی زۆر بچووکیان بۆ کتێب فرۆشتن تەرخان کردووە لە ڕاستیدا پتر ڕۆژنامەو گۆڤارو هەندێك کتێبی بازرگانی لێیە.

لەم ڕووەوە پێشنیاز دەکەین سوپەرمارکێتەکی کتێب فرۆشی تایبەت بە فرۆشتنی کتێبی مێژوویی لە کوردستاندا بکرێتەوە ئەمەش لەبەر ئەوەی ئارەزوویەکی زۆری خوێندنەوەی کتێبی مێژوویی لە کوردستان دا هەیە و لەبەر گرنگی ئەم بوارەو پەیوەست بوونی بە سیاسەت و هەستی نەتەوایەتی کوردییەوە. یان بە لانی کەم یەکێك لە دوکانەکانی کتێب فرۆشی تایبەت بکرێت بە فرۆشتنی کتێبی مێژوویی بەتایبەتی و بەرهەمی مێژوویی بە گشتی.

ئەگەر پسپۆڕی لە بوارە جۆربەجۆرەکان گرنگ بێت ئەوا بێگومان پسپۆڕی لە بواری کتێب فرۆشتنیش گرنگە چ بۆ کتێب فرۆش و چ بۆ کڕیاری کتێب. هەروەها دیاردەیەکی شارستانیش دەبێت ڕوویەکی گەشی کوردستانی ئەمڕۆ پیشان دەدات. هیوادارین وەزارەتی ڕۆشنبیری ئاسانکاری بۆ کتێب فرۆش و چ بۆ کڕیاری کتێب بکات. هەروەها دیاردەیەکی شارستانیش دەبێت ڕوویەکی گەشی کوردستانی ئەمڕۆ پیشان دەدات. هیوادارین وەزارەتی ڕۆشنبیری ئاسانکاری و یارمەتی کارێکی وا بدات. هیوادارین شارەوانی هەولێر یان پارێزگای هەولێریش دەستپێشخەریەکی گرنگ بکەن بە تەرخانکردنی پارچە زەویەکی گونجاو لە شوێنێکی باش بۆ کارێکی ڕۆشنبیری شارستانی کە پایتەخت جوانتر دەکات و پاڵنەرێکیش دەبێت بۆ ئەوەی لە شارەکانی تری کوردستان پرۆژەی هەمان شێوە ئەنجام بدرێت.

# چۆنیەتی گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کوردی و ساڵی کۆچی بۆ زاینی و کوردی بو کۆچی و بە پێچەوانەوە

م. ئارام مەجید عەلی

ئەم بابەتەی بەردەستت لەم سەردەمەدا گرنگیەکی پڕبایەخی خۆی هەیەلەتوێژینەوە مێژووییەکاندا،چونکە زۆرجار لەکاتی نوسینی توێژینەوەیەك وئامادەکردنی بابەتێکی ئەکادیمی مێژوویی، توێژەر یان خوێندکار ڕووبەڕووی کێشەیەکی گەورە دەبێتەوە کاتیك ساڵێکی کۆچی یان کوردی دێتە بەردەستی،ئەمەش بەوەی کە نازانێت چۆن ساڵێکی کۆچی یان کوردی بگۆڕێت بۆ زاینی یان بەپێچەوانەوە یان نازانێت ساڵێکی زاینی بگۆڕێت بۆ کوردی یان کۆچی بگۆڕێت بۆ زاینی یان کوردی بگۆڕێت بۆ کۆچی ،بۆیە لێرەدا بەگرنگم زانی ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ئەوە بدەم و بیخەمەڕوو چونکە خوێندکاری بەڕێز زۆر جار لەماوەی خوێندن و تەنانەت دوای تەواوکردنی خوێندنیش شارەزاییەکی تەواوی لەسەر ئەم ڕاستییە زانستیە نیە،وەکاتێك ساڵێك یان سەدەیەك دێتە پێش چاوی نازانێت لەکەیەوە دەست پێدەکات و تا چ ساڵێك دەگرێتەوە یان نازانێت نیوەی یەکەم و دووەمی سەدەیەك چۆن دیاری بکات، بۆیە بەشێوەیەکی گشتی هەوڵم داوە ئەم کارە لەچوار چێوەی چەند یاسایەکدا کۆبکەمەوەو ئامادەی بکەم وبخەمەڕوو بۆ توێژەران و خوێندکاران و ئەو کەسانەی سەرقاڵی توێژینەوەن لە مێژووی ئیسلام یان لەمێژووی کورد یان هەربابەت و سەردەمێکی دیکەی مێژوو، ئەمەش بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی توێژینەوەکەیان دەبێت و لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەمەی کەنوسراوە بۆ هەموو مامۆستایەکی بەشی مێژوو

یان کۆمەڵایەتی پێویستەیەکی گرنگە چونکە ڕووبەڕووی ئەم پرسیارانە دەبێتەوە،ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە لەگۆڕینی هەموو ئەم یاسایانەدا تەنها ساڵەکەت دەست دەکەوێت نەك ڕۆژ و مانگ،ئەگەر دەتەوێت ڕۆژ و مانگیشت دەست کەوێت ئەوا سەردانی ئەو سایتە بکە کەلەخاڵی(٧و٩)ی سەرچاوەکان نوسیومانە ئەمەش ئاسانکاری و گرنگیەکی باشە بۆ توێژەران.ئەوەی شایەنی ئاماژە پێکردنە ئەم کارە یەکەمین جارە بەم شێوەیە کۆی یاسا هزریەکانی کۆکردبێتەوە لەیەك چوارچێوە کۆی کردبێتەوە.

## بەشی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کوردی

### یاسای یەکەم : برگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کوردی

**یاساکە:** ( ٧٠٠پ.ز+ساڵی زاینی = ساڵی کوردی )

**٧٠٠+٢٠٠٩= ٢٧٠٩کوردی**

هەموو نەتەوەیەك ساڵنامەیەك یان ڕۆژی سەری ساڵی خۆی هەیە کەسەرەتای ساڵی نوێیە شانازی پێوە دەکەن،لەساڵنامەی زاینیدا ڕۆژی ١\١ واتە (١)ی کانونی دووەم سەرەتای هەموو ساڵێکی زاینیە، یان ڕۆژی (١)ی موحەڕەم سەرەتای هەموو ساڵێکی کۆچیە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا سەرەتای هەموو ساڵێکی کوردی ٣\٢١ یە کەواتە جیاوازی هەردوو ساڵی زاینی و کوردی دوومانگ و ٢٠ ڕۆژە، بۆیە ئەم یاسایە تەنیا بۆ مانگەکانی کانونی دوەم و شوبات نابێت، بەڵام لە (٩) مانگ و (١١) ڕۆژەکەی تردا ئەم یاسایەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت لەساڵی زاینیدا واتە لە٣/٢١ی ئازار تاوەکو ١٢/٣١کانونی یەکەم، مەبەستمان لەساڵی (٧٠٠)لەیاساکەدا ئەو ساڵەیە کە (دیاکۆ)کورد هەموو تیرەو هۆزەکانی نەتەوەی مادی یەکخست و لەدەوری دەسەڵاتەکەی خۆی کۆیکردنەوە و ئیمپراتۆریای مادی دامەزراند و ڕۆڵیان لەمێژووی کورددا

## بەشی دووەم: گۆڕینی ساڵی کوردی بۆ زاینی

### یاسای یەکەم :بڕگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی کوردی بۆ زاینی

**یاساکە: ساڵی کوردی-٦٩٩=زاینی**

**٢٧١٠-٦٩٩= ٢٠١١ زاینی**

## بەشی سێیەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زاینی

### یاسای دووەم: بڕگەی یەکەم : گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زاینی

**یاساکە: ( ساڵی کۆچی × ٩٧ + ٦٢١٥٦ )**

لەم یاسایەدا پاش کۆکردنەوەو لێکدان ژمارەیەك دەردەچێت لێرەدا ئەگەر :

یەکەم : ئەگەر دوو ژمارەی یەکەمی ژمارەکە لەنیوە واتە (٥٠) زیاتر بوو ئەوا دوو ژمارەکە دەکەین بە ژمارە (١) و لەگەڵ ژمارەکەی تر کۆی دەکەینەوە

**ساڵی کۆچی × ٩٧ + ٦٢١٥٦**

**٦٥٦ × ٩٧ + ٦٢١٥٦ =١٢٥٧٨٨**

دەبینین دوو ژمارەی یەکەمی(٨٨) هو لە نیوە گەورەترە ئەوا ئەوە دەکەین بە ژمارە (١) و لەگەڵ ١٢٥٧ کەدا کۆی دەکەینەوە دەبێت بە ١٢٥٨ی زاینی.

دووەم : بەڵام ئەگەر دوو ژمارەکەی یەکەمی لەنیوە کەمتر بوو واتە(٥٠) ئەوا دوو ژمارەکە لادەبەین و ژمارەکەی تر وەك خۆی دەنوسینەوە

**ساڵی کۆچی × ٩٧ + ٦٢١٥٦**

**١٠٤٩ ×٩٧ + ٦٢١٥٦ =١٦٣٩٠٩**

لێرەدا دەبینین دوو ژمارەی یەکەمی ژمارەکە لەنیوە واتە (٥٠) کەمترە ئەوا لێرەدا دوو ژمارەکە لادەبەین و ژمارەکەی تر وەك خۆی دەنوسینەوە ئەوەش دەبێتە ١٦٣٩ی زاینی.ئەم یاسایە کەمێك گۆرانکاری و وردەکاری دەوێت.

**یاسای دووەم : بڕگەی دووەم : گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زاینی**

**یاساکە : ساڵی کۆچی×٠/٩٧+٦٢٢**

**١٢٠٠×٠\٩٧+٦٢٢=١٧٨٦**

تێبینی: ئەم بڕگەیە لە هەردوو بڕگەی (١و٢)ئەم یاسایە ئاسانترە.

یاسای دووەم بڕگەی سێیەم : گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زاینی(ساڵی کۆچی×٣÷١٠٠)

١٢٠٠×٣÷١٠٠=٣٦ ئەو ژمارەیەی ماوەتەوە(٣٦) دیسانەوە دەری بکە(-) لەساڵە کۆچیەکە ژمارە(٦٢٢) لەگەڵ کۆمەڵەی یەکەم بکەرەوە بەم شێوەیە

١٢٠٠-٣٦+٦٢٢=١٧

**یاسای دووەم: بڕگەی سێیەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زاینی**

**یاساکە: ساڵی کۆچی+٦٢٢-ساڵی کۆچی÷ ٣٣**

**١٣٠٠ +٦٢٢ - ١٣٠٠÷ ٣٣**

**١٩٢٢ - ٣٩ = ١٨٨٣زاینی**

**یاسای دووەم: بڕگەی چوارەم: گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ زاینی**

**یاساکە: ساڵی کۆچی+٦٢٢-٤٣ = ساڵی زاینی**

**١٤٣٣+٦٢٢-٤٣ =٢٠١٢**

## بەشی چوارەم:گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کۆچی

**یاسای یەکەم:بڕگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کۆچی**

**یاساکە: (٦٢٢- ساڵی زاینی÷٠/٩٧)**

**٦٢٢-٢٠٠٩÷٠/٩٧ = ١٤٣٠کۆچی**

**یاسای دووەم:بڕگەی یەکەم: گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کۆچی**

یاساکە : زاینی-٦٢٢ + زاینی-٦٢٢÷٣٣

١٨٨٣-٦٢٢ + ١٨٨٣- ٦٢٢÷٣٣

١٢٦١ + ٣٩ = ١٣٠٠کۆچی

یاسای سێیەم : گۆڕینی ساڵی زاینی بۆ کۆچی

ساڵی زاینی- ٦٢٢ +٤٣ =ساڵی کۆچی

٢٠١٢-٦٢٢+٤٣ = ١٤٣٣

## بەشی پێنجەم: گۆڕینی ساڵی کوردی بۆ کۆچی

یاساکە : ( ساڵی کوردی-١٣٢١,٦ ) ×١٠٠÷٩٧

٢٧١٢-١٣٢١,٦×١٠٠÷٩٧

١٤٣٣,٤٠٢١

ئەو ژمارەیەی دوای فاریزەکە ماوەتەوە لە ٥٠٪ کەمترە لای دەبەین و ساڵەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە

وەك: ١٤٣٣کۆچی

## بەشی شەشەم : گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ کوردی

یاساکە : ساڵی کۆچی- ( ٣×ساڵی کۆچی )÷١٠٠+١٣٢١,٦

١٤٣٣-( ٣×١٤٣٣÷١٠٠ ) + ١٣٢١,٦

١٤٣٣- ٤٢,٩٩+١٣٢١,٦

٢٧١١,٦١

**ئەو ژمارەیەی دوای فاریزەکە ماوەتەوە لە ٥٠٪ زیاترە ئەکرێت بە (١) و ئەخرێتە سەر ژمارەکە**

**وەك: ٢٧١٢**

**بەشی حەوتەم : گۆڕینی ساڵی ئیرانی( هیجری شەمسی ) بۆ ساڵی زاینە**

**یاساکە : ساڵی ئێرانی+٦٢١= ساڵی زاینی**

**١٣٩١ + ٦٢١ = ٢٠١٢زاینی**

## بەشی هەشتەم: دۆزینەوەی ماوەی سەد ساڵی سەدەیەك

بۆ ئەوەی خوێندکار بزانێت ماوەی سەد ساڵی هەر سەدەیەك لەساڵی چەندەوە دەست پێدەکات و تا چ ساڵێك دەگرێتەوە ئەوا ژمارە (١) لەسەدەکە کەم دەکەینەوە ئەوکات دوو جار ساڵی سەدەکە دەنوسینەوە ئەوەش یەکێکیان لای دەستەڕاست و ئەویتریان لای دەستە چەپ پاشان دوو سفر(٠٠) لەپێش ژمارەی دەستەڕاست زیاد دەکەین، وە ژمارە (٩٩) بۆ ژمارەی دەستە چەپ زیاد دەکەین بەم شێوەیە:

سەدەی (١٦)ی زاینی ژمارە (١) لەسەدەکە دەردەکەین و دەبێت بە (١٥) ئەوکاتە ژمارەکە دوو جار دەنوسین

( ١٥ — ١٥ )

دواجار دوو سفر بۆ دەستە ڕاست زیاد دەکەین دەبێتە (١٥٠٠) و ژمارە نەوەد و نۆ بۆ دەستە چەپ زیاد دەکەن و دەبێتە (١٥٩٩)

کەواتە سەدەی شازدە ماوەی ساڵانی (١٥٠٠–١٥٩٩) دەگرێتەوە.

## بەشی نۆیەم: زانینی ساڵێك کەدەکەوێتە چ سەدەیەك

لەم یاسایەدا خانەی یەکان و دەیان یان بەواتایەکی تر دوو ژمارەی یەکەمی ژمارەی ساڵەکە لادەبەین و ئەوکات ئەو ژمارەیەی کە دەمێنێتەوە لەگەڵ ژمارە (١) کۆی دەکەینەوە بۆ زانینی ساڵی سەدەکە: نمونە

ساڵی (١٩٨٨) دەکەوێتە کام سەدەوە؟

**١٩٨٨ دوو ژمارەی یەکەم دەبەین دەمێنێتەوە ژمارە (١٩)**

**١٩ + ١ = ٢٠ کەواتە ساڵی ١٩٨٨ دەکەوێتە سەدەی بیستەمەوە**

## بەشی دەیەم: نیوەی یەکەم و دووەمی سەدەیەك

کاتێك دەڵێین نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم مەبەستمان ئەوە یە لەسەرەتای ساڵی ١٩٠٠ وە دەست پێدەکات تا ناوەڕاستی ساڵەکە واتە ١٩٥٠واتە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دەکەوێتە نێوان (١٩٠٠_١٩٥٠). بەڵام کاتێك دەڵێین نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ئەوا مەبەستمان ئەوەیەلەنیوەی دووەمی ساڵی ١٩٥٠وە دەست پێدەکات تا کۆتایی ساڵەکە واتە ١٩٩٩،ئەمەش واتە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەکەوێتە نێوان(١٩٥٠_١٩٩٩) ئەمەش بۆ هەموو سەدە و ساڵەکانی زاینی بەهەمان شێوەیە.

تێبینی(١) کاتێك لەیاساکاندا دەڵێین ساڵی کۆچی یان ساڵی زاینی یان کوردی مەبەستمان هەموو ساڵێکی کۆچی و زاینی و کوردیە.

تێبینی(٢) ساڵی کۆچی(مانگی) کەمترە لەساڵی زاینی(خۆری) هەر ٣٣ساڵی کۆچیەك یەکسانە بە ٣٢ساڵی زاینیەك، وەپێوستە ٣ ی لێدەربکەیت و لەگەڵ ٦٢٢ دا کۆی بکەیتەوە

تێبینی(٣) توێژەری بەڕێز ئەگەر هاتوو بەئاسانی لەم یاسایانە تێنەگەشتی بەکرداری یان بەئەنجام گەشتنی ئاسان نەبوو بۆت ئەوا دەتوانی سەردانی ئەو

سایتانە بکەیت لە(خاڵی حەوتەم و نۆیەم) کەلەخوارەوە سایتەکەی نوسراوە وەك خۆی کۆپی بکەو لەئینتەرنێتەوە بەیستی بکە و دەجێتە سەربەرنامەکەبەلاَم ئاگادار بە ژمارە(٧) کەریزبەندی ژمارەکانە لایبە و ئەوکات تەنها سایتەکە کۆپی بکە و دینیّ لەئینتەرنێتەوە، ئەمەش زۆر کار ئاسانیت بۆ دەکات چونکە هەر ساڵێکی بدەیتیّ راستەو خۆ بۆت دەگورێت بۆ ساڵی هەتاوی و کۆچی و زاینی و لەوەش گرنگتر رۆژ و مانگی ساڵەکە دیاری دەکات، ئەمەش پێویستە لەبەدەستی هەموو توێژەرێکدا بێت کاتێك توێژینەویەکی مێژووی ئەنجام دەدات

## سەرچاوەکان


١. شێرزاد سەعید محەمەد:بنەماکانی پێرست و پۆلێن لەکتێبخانەو بنکە زانیارییەکاندا،چاپی دووەم،٢٠١١

٢. وریا عومەر ئەمین: ساڵنامەی کوردستان_ دەزگای ساڵنامەی کوردی،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٢

٣. گۆڤاری چەرمۆ:ژمارە (٦) زستانی ٢٠٠٩،رووپەری ناوەوەی بەرگی یەکەمی

٤. گۆڤاری چەرمۆ:ژمارە (١٤) زستانی ٢٠١١،رووپەری ناوەوەی بەرگی یەکەمی

٥. گۆڤاری مێژوو:ژمارە(٥)زستانی ٢٠٠٨،سەروەر جەبار:چۆنیەتی زانینی ماوەی ساڵانی سەدەکان و سەدەی ساڵەکان

٦. گۆڤاری مێژوو،ژمارە(٦)بەهاری ٢٠٠٨،سەروەر جەبار: ئایا لەهەموو کاتێکدا راستە ژمارە(٧٠٠+ساڵی زاینی)= ساڵی کوردی؟

٧. http://www.elib.hbi.ir/persian/CLINICAL-EPIDEMIOLOGY/calendar٪٢٠converter٤.htm

٨. http://www.kurdzhin.net/forum.php/viewtopic.php?id=٨١٣٦٥

٩. http://www.٩ate.com/hijri-converter.php

١٠. www.rwgash.info/meko/viewtopic.php

# یەکێك لەو ئاینانەی لە کوردستان سەریهەڵداوە و بنکەو بارەگای سەرەکی ئەم ئاینە کوردستانە ئێزیدن سی

بژار عثمان احمد

## ناوی ئێزدی لە چیەوە هاتووە؟

بەر لە هەموو شتێك وشەی (یەزیدی) هەڵەیە کە هەندێ کەسی ئەم گروپە ئاینیە دەگەڕێنێتەوە سەر (یەزیدی کوڕی معاویە) کە گوایە لەوەوە هاتوە هەروەها بەشەیتان پەرستیان ناودەبەن بەڵام ئەوان شەیتان ناپەرستن وە دەڵێن ئەمانە بەندەی شەیتانن.

هەندێ دەڵێن وشەی (ئێزید) لە (ئێزدان) یاخود (یەزدان) هاتووە، کە بە شێوەی جیا مانای لێکدراوەتەوە.

ڕۆژنامەنوس و دکتۆر جەمال نەبەز دەڵێ: ئەمانە یەزیدی نین بەڵکو لە (ئەیزید) هاتوون کە بەمانای خواوەند دێت کە خواوەندێکی کۆنی ناوچەکەیە.

هەندێ لە نوسەرە عەرەبەکان کە لەم ئاینەیان کۆڵیوەتەوە ئەوا بڕوای جیاوازیان هەیە کە هەندێك پێیان وایە ئەم ئاینە لە وشەی (یەزید) هاتووە کە بۆ ئەمەش دوو بۆچوونی جیاواز هەیە.

وشەی یەزید لە ناوی یەزیدی کوڕی معاویە هاتوەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە کۆمەڵێك داب و نەریت و بۆنەی ئاینیان هەیە پەیوەندی بە کەسایەتی یەزید هەیە وەکو جەژنی یەزیدی یەکەم کە دەکەوێتە جومعەی یەکەمی مانگی کانونی

یەکەمەوە کە گوایە ئەم جەژنە بە بۆنەی مژدەی لەدایکبوونی ئەو کەسەوە دەگێڕن هەروەها جەژنی دوەمی ئێزدی کە دەکەوێتە ڕێکەوتی چوارشەممەی یەکەمی مانگی نیسان بە بۆنەی هاتنە سەر حوکمی یەزید لە ساڵی ٦٠ك دا.

بۆ ئەم لێکدانەوەیە (عباس محمود عقاد) بە دوری نازانێ کە کوردەکان لە رقی فارسە شیعەکان ئەم مەزهەبەیان دروست کردبێ و لە ڕقی عەلەویەکانیش یەزیدیان تاکو پلەی خواوەند بردبێت.

کۆمەڵێ نوسەری تری عەرەب دەڵێن (یەزیدی) لە (یەزدانەوە) هاتووە چونکە ئەمانە خواپەرستن.

هەمان ڕا لە لای (سعید الدیوەچی) دوپات کراوەتەوە و دەڵێ: دوای ئەوەی شێخی عەدەوی کوڕی مسافر هاتوەتە ناوچەکەو بیروباوەڕی خۆی بڵاوکردۆتەوەو خەڵکی ناوچەکە بە کوردی عەدەوی ناوبانگی دەرکردوە، سەرەڕای ئەوەی چەندین واتا بۆ وشەی ئێزدی لێکدراوەتەوە ئەوا هەندێك لە سەرچاوە (فارسیەکان)دا، وشەی ئێزدییان بە واتای (فریشتە) لێکدراوەتەوە.

هەندێك لە زمانی پەهلەوی دا بە واتای (لە خوداچوو)یان لێکداوەتەوە. هەندێکی تر لە (سانکرێتیەوە) وەك واتەی (شایستەی خزمەتکاری خوداییان) لێکداوەتەوە.

هەروەها لە لای نوسەر (ن.مار)دا وشەی (یەزیدی) لە وشەی (ئێزدی) پارسیەوە هاتووە کە واتەی (خودا) دەگەیەنێ. هەروەها پرۆفیسۆر( Henri Karinen) پێی وایە وشەی (ئێزدی) هەر تەنها وەك فریشتە پەرستان تەرجەمە دەکرێ نەوەك وەکو شەیتان پەرستان، (بەتایبەتی لە لای موسڵمانان ئێزدی بەمە ناسراون)، بەڵام هەندێ سەرچاوەی تر دەڵێن وشەی ئێزدی واتای خودا یان خواوەند دەگەیەنێت.

هەندێك دەڵێن پێغەمبەری كوردی (زەردەشت) بەوانەی گوتوە (دەئیڤە پەسن) واتە (دێوەپەرست) دواتر ئەم ناوە گۆڕاوەو بووە بە (داسنی) کە ئێزدیەکانیش لەم بڕوایەدان کە ئەم تایفەیە لە سەرەتادا ناوی (داسنی) بوەو دواتر بوە بە(ئێزدی).

## دەرکەوتنی ئاینی ئێزدی

هەندێك پێیان وایە تاوەکو شێخی ئادی کوڕی مسافر نەهاتۆتە ناوچەکە ئەوا ئەم ئاینە بوون و باوی نەبووە. هەندێکی تر دەڵێن لەوانەیە بچنەوە سەر(ئاینی زەردەشتی)، ئەمەش لەبەر دوو هۆکارە:

– گەورە پیاوانی ئێزدی داوایان لە خەڵکی کردوە نوسراوی خۆیان نەخەنە دەستی بێگانە و نهێنی و بڕوایان نەدرکێنن.

– ئەم ئاینە لەژێر کاریگەری ئاینەکانی تردا گۆڕانکاری زۆری بەسەر داهاتووە.

– جا لەم بارەیەوە (دەپیر مەمۆ فەرمانی ئێزدی) لەو باوەڕەدایە کە ڕەگی سەرەکی ئاینی ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ ئاینی(هیندی جەرمانیەکان) کە دەوروبەری (٢٠٠٠پ.ن) لە هیندەوە بۆ ئێران و بۆ کوردستان هاتون.

ئاینی ئێزدی وەکو باسی دەکەن زۆر لە ئاینی زەردەشتی کۆنترە و لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان یەکێك بوبێ لە ئایندیاوەکانی چیای زاگرۆس بەڵام بە درێژایی مێژوو تێکەڵ بە ئاینەکانی تر بوبێت.

بە بەڵگەی ئەوەی کە وشەی ئێزدی درونیە وەکو بنەچەیەکی سۆمەری هەبێت و لە وشەی (E-zi-da)وە هاتبێ کە واتای (گیانی پاك و بێگەردە ڕێی ڕاست، دەستی ڕاست، خواوەندی ئاسمان بوە) دێت.

واتە ئێزیدا ناوی خواوەندێکی سۆمەریەکانە، جا ئەم بۆچونە ڕێی تێدەچێت چونکە هەندێ سەرچاوە لە کۆن دا باسی پەرستگایەکیان کردوە کە ناوی (ئێزیدا) بوەو نزیکەی (٢٠٠٠پ.ز) خەڵکی بە هەمان شێوەی لالش نوێژیان تێداکردووە.

جا ناوی ئەم خواوەندو پەرستگایە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەسەر بنەمای فرەخواوەندی دامەزراوە، سەرەڕای ئەمانە لە کۆن دا ئێزدیەکان فرەخواوەندیان پەرستوە وەکو خواوەندی (با، باران، شەو، ڕۆژ، ..هتد).

بەتایبەت ئێزدیەکان لە کۆن دا خواوەندی (ڕۆژ واتە هەتاو)یان پەرستوە چونکە هەمو کات روناکیان خۆشویستوەو لەبەر ترسی سەرماو تاریکیدا خواوەندی ڕۆژیان پەرستوە.

تەنانەت دوای هاتنی ئیسلام و زەردەشتی ئەوا ئەم دیاردەیە تاکو ئێستاش هەر ماوە لە نوێژکردنی بەیانیان و ئێواران دا ڕوو لە هەتاو دەکەن و نوێژدەکەن.

### ئەم سروده بەڵگەیە لەسەر کۆنی ئێزدییەکان:

سلتانی ئێزدی ب خۆ پادشایە

هەزارو یەك ناڤ ل خۆ دانایە، ناڤێ مەزن هەر خودایە،

سلتانی ئێزدی دزانە لە بەحرا چەند کەشکۆڵ ئاڤە،

ئەڤ دنیایە ل یاوی وی بەعەن و گاڤە، ئەوی حەوا کرە بوك ئادەم کرە زاڤە،

خودانێ ئافرەتێ و دنێ، حاسلێ مرازو منێ، یەزدانێ منۆیێ بتنێ،

هەکە خودێ کر ئێزدینە، سەرناف سلتان ئێزدینە،

ڕاستی یە ڕێ زانە، ڕۆنایا دلانە، راستی ڕێیا یەزدانە.

سەرەڕای ئەمەش ئێزدیەکان هەندێ بیروباوەڕیان وەکو بیرو باڕوەی ئاینە کۆنەکانی عێراق وەکو بابلی، ئاشورییە، بۆ نمونە جەژنی سەری ساڵ دەکەوێتە یەکەم چوار شەممەی مانگی نیسان کە ئەمە لەگەڵ ئاینە کۆنەکانی عێراقدا هاوبەشە، سەرەڕای هاوبەشیان لە بیرو باوەڕی زیندوبونەوەی پاش مردن و ژن نەهێنان لە مانگی نیسان دا، ...هتد کە ئەمانە کۆمەڵێك بیروباوەڕی کۆنن.

سەرەڕای خۆ گونجاندن لەگەڵ باوەڕی زەردەشتی کە ئاو، خاك، ئاگر، هەوا لە لای ئێزدیەکانیش بە پیرۆز دانرا، وە کاریگەربوون بە ئاینی ئیسلام .. دواتر ئاوی زەم زەم و حەج و دانراوە.

## چەوسانەوەی ئێزدییەکان

ئێزدیەکان لە کۆنەوە تاکو ئەمرۆ چەندین جار چەوسێنراونەتەوە، بەگشتی ئەمە لەبەر دوو هۆکارە: ١- لەبەر ئەوەی کوردن. ٢- ئاین و بڕوایان جیاوازە.

لە سەدەی حەڤدەهەمی پ.ز بۆ ماوەی ١٠ساڵ (حامورابی) هێرشی سەربازی کردوەتە سەریان و پەرستگای (ئێزیدا) لە ناوچەی (لاریسیا) کە یەکێك بوە لە پەرستگا سەرەکیەکانی ئێزدییەکان ئەوا بە دەستی ئەم سەرکردە بابلیە روخێنراوە.

لە دوای ساڵی ٦١٢ میدیەکان ئەم ناوچەیان لە ئاشوریەکان گرت و پاشان رۆمانیەکان ئەم ناوچەیان داگیرکرد. هەروەها لە سەردەمی دەسەڵاتداریەتی زەردەشتی بەگشتی و سەردەمی حوکمی گوشتاسب کە هەوڵ دراوە بە بەکارهێنانی زەبروزەنگ بیانکەن بە زەردەشتی بەڵام هەندێ ئێزدیەکان هەڵاتن و لەناوچەی (دەرسیم، ئامەد، لالش، سنجار، شێخان) نیشتەجێ بوون. هەروەها

لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلام کەسێك بە ناوی (عتبە بن فەرقەد السلمی) بەشی زۆری ناوچەکانی فەتحکردوەو لەم کاتەدا هەندێ لە ئێزدیەکان بونە بە موسڵمان و هەندێکی تریان چونە چیای شەنگارو بەرگرییان کردوە وە لەسەر ئاینی ئێزدی مانەوە.

ئیبن بەتوتە (١٣٠٣-١٣٧٧ز) لە گەشتەکەیدا بۆ ناوچەی شەنگار دەڵێ(پاشان گەیشتینە شاری شنگار کە شارێکی فرەمیوە (هەمە جۆر میوەو دارو درەختە وە سەرچاوەی ئاوی زۆرە بەشێوەیەك لە دیمەشق دەچێ) ئینجا دەڵێ: (خەڵکی شەنگار کوردن و دەست بڵاو و ئازان).

هەروەها لە سەردەمی تەیموری لەنگ (١٤٠١ و ١٤٠٢) کاتێ کە هێرشی کردە سەر کوردستان و ناوچەی شەنگار بەتایبەتی ئەوا لە چیای شەنگار توشی شکستی هاتوە هەروەك باوکو باپیرانی خۆی (هۆلاکۆ).

دەڵێن لە کاتی هێرشی تەیموری لەنگدا لە سەرەدا (٤٠٠) خێزانی کوردە ئێزدیەکان ڕویان لە چیای شەنگار کرد و پاشان خەڵکی تریش بۆ خۆپاراستن ڕوویان لە ناوچەی شەنگار کرد.

هەروەها لە سەدەی (١٣ز) بەدرەدین لوئلوئەی شیعە مەزهەب کە ئەو کات والی موسڵ بوە هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئاینی نصیریە داوەو هێرشی کردوەتە سەر ناوچەکەو کوشتاری زۆری کردوەو تەنانەت (مەزاری شێخ ئادی) هەڵتەکاندوەو ئێستگەکانی سوتاندوە.

هەر لەم ماوەیەدا بەدرەدین لوئلئە لەلاشی دا سەد کەسی سەردەبڕێ و سەرۆکی ئەو کاتی ئێزدیەکانیشی پارچە پارچە دەکات و بەدەرگای موسڵەوە هەڵیواسیوە.

هەندێجار بە فتوای چەند زانایەکی ئاینی لە لایەن (حاکمی جەزیرەی ئیبن عمرەوە) هێرشی کراوەتە سەریان و مەزاری شێخ عادی تێك دراوە، هەروەها لە ناوەڕاستی سەدەی (١٧ز)دا ئێزدیەکان لەسەر دەستی شەمسی پاشا(میری وان) لە سەردەمی سلتان محمدی چوارەم دا کارەساتێکی گەورەتری بەسەر هێناون.

هەروەها والی دیاربەکر(مەلیك ئەحمەد پاشا) لە ساڵی ١٠٤٨ز دا بە لەشکرێکی هەشت هەزار کەسیەوە هێرشێکی دڕندانەی کردوەتە سەر کوردەکانی دیاربەکر و (١٣)هەزار کەسی لێ کوشتن.

هەروەها هەندێك لە کوردەکانیش بە مەبەستی ورگرتنی باج و سەرانە هێرشیان کردۆتە سەر ناوچەکە وەکو(عەلی سەید بەگ) میری بۆتان کە لە ساڵی (٩٩٣)کۆچی هێرشی کردوەتە سەر هۆزو تیرە کوردیەکانی ناوچەکە بە مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکەو وەرگرتنی باج و خەراجی ئەم ناوچەیە(شەنگار).

هەروەها چەند زانایەکی کوردیش ئیسلام هانی میرە کوردەکانیان داوە بۆ هێرش کردنە سەر ئەم میرنشینە وەکو: پاشای گەورە (کۆرە) لە ساڵی ١٨٢٦ز کە لەسەر داوای (مەلا یەحیای مزوری) لە ساڵی ١٨٣١-١٨٣٢ هێرشی کردوەتە سەر ئێزدیەکان و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتون. تەنانەت (عەلی بەگی داسنی) کە میرێکی ئێزدی بوەو بە فتوای چەند زانایەکی کورد لە لایەن پاشای کۆرەوە کوژراوە. چونکە دەڵێن پاشای کۆرە داوای ئەوەی لێکردوە ببێ بە ئیسلام بەڵام عەلی بەگ پێی گوتوە: (من بۆ کەوچکێ خوێن ئامادەنیم ئاینی خۆم بگۆڕم).

کۆتایی سەدەی هەژدەی زاینی هەر لەبەر هۆکاری ئاینی (ئاوڕەحمان پاشای بابان) بە مەبەستی تەمبێکردنی ئێزدیەکانی سنجار ئەوا دەجار لە (١٧٩٤-١٧٩٩) سوپای بردوەتە سەریان.

سـەرەڕای ئەمانـە دەوڵـەتی عوسمـانی لـە پـەنای ئاینـەوە زۆری ئەزیـەتی ئێزدیەکانی داوە هەروەکو هێرشەکانی سەردەمی (حەسەن پاشا ١٧٠٨، شەریف پاشا ١٨٤٤، تەیار پاشا ١٨٤٥، عومەر وەهبی پاشا ١٨٩٢) کە لە ئـەنجامی ئـەم هێرشانە بۆ ناوچەی چەندین ناوچـەی وەکـو (باعـەدرا، سـنجار، شـێخان، لالـش، هتد) سوتێنران.

تەنانەت مەزاری پیرۆزی پیاوچاکانیان ڕووخاندن و ئێسکەکانیان دەرهێنان بۆ ڕیـسوایی کـردن و هـەروەها سـەروەت و سـامانیان بـەتالان بـردون، هـەروەها شێخەکانیان لەبەر چاوانیان کوشتون.

لـە بـارەی هێرشـەکەی شـەریف پاشـاوە لـە کتێبـی مێـژووی موسـڵدا باسـی دەکات کە ٣/٤ دانیشتوانی ناوچە چیاییەکانیش لەناوچون و ئەوانـەی کـە چـونە ئەشکەوتەکانیش ئەوا سەربازانی عوسمـانی ئابلۆقـەیان دان و ئاگریـان تێبـەردان هەندێك سوتان و هەندێك بەدووکەڵ خنکان و پاشـان ئـەم سـوپایە منداڵـەکانیان بردن و لە شارەکاندا فرۆشتیانن.

هـەروەها لـە دوای جـەنگی یەکـەمی جیهـانی کـە کوردسـتان دابـەش بـووە ئێزدیەکانیش کەوتنە سنوری (عێراق، تورکیا، سوریا) کە بەردەوام هەرجارەو لە ژێـر ناوێـك دەچەوسـێنرانەوە، بـەڵام لـە دوای سـاڵی ١٩٩١ ئێزدیـەکان زۆر بـە ئازادانە دەژین تەنانەت نوێنەریان لە پەرلەمان دا هەیە کە ناوی (کامـەران بـەگی کوڕی خەیری بەگ) کە نوێنەری ئێزدیەکان بو لە ١٩٩٩. هەروەها ئێزدیـەکان لـە پۆستی وەزیریشی دابینراون، بەڵام ئەگەر بەخۆیان غەدر لە خۆیان بکەن.

## ئێزدی ناسی

یەکەم کەس لە ئەوروپییەکان کە زانیاری دەربارەی ئێزدییەکان بە دەستەوە دابێن ئەوا (Michel febrer)یوە کە کتێبی (Teatrodellaturchia) کە ساڵی (١٦٨١) لە میلانۆ بە زمانی ئیتاڵی چاپکراوەو لە لاپەڕەکانی (٢٥٢) تاکو (٢٦٩) کە زانیاری و گەیاندنی دەربارەی ئێزدییەکان بە دەستەوە دەدات کە ئێزدییەکان وەك شەیتان پەرستی باس دەکات.

شایانی باسە نوسەر لەم کتێبەی خۆیدا نکۆڵی لەوەدا دەکات کە ئێزدیەکان هیچ کتێبێکیان نیە، هەروەها (P.lanzq) لە ساڵی (١٧٦٩) تێبینی ئەوە دەکات کە ئێزدیەکان شەیتانیان لەلا پیرۆزە و باوەڕی وایە کە ئێزدی نەوەی مانەوییەکانن.

هەروەها کەسێکی تر بەناوی (کارزۆنی) لە ساڵی (١٧٨١)ەوە پەیوەندی لەگەڵ ئێزدیەکان دا هەبوەو لە ساڵی (١٨٠٧)دا بە ئیتاڵی وتارێکی لەبارەی ئێزدییەکان نوسیوە.

هەروەها کەسێکیتر بە ناوی (Forbre) لە ساڵێ (١٨٣٨) گەشتێکی بەرەو شەنگار دەکات و دواتر یاداشتەکانی خۆی لە گۆڤاری کۆمەڵەی جوگرافی شاهانە بڵاودەکاتەوە و هەر لەوێدا دەردەکەوێت و باسی دەکات کە ئێزدییەکان دوو کتێبیان هەیە بە ناوی (جیلوە و مەسحەفارەش) کە ئەوانە هی شێخ ئادییە.

بەڵام ئەوەی گرینگە کە یەکەمین هەوڵی ڕاستەقینەی ئێزدی ناسی لە لایەن دیبلۆمات کاری بەریتانی (هینری لایارد) بوبێ کە لە ساڵی ١٨٥٢ گەلێك زانیاری دەربارەی جەژنە ئاینیەکانی ئێزدییەکان تۆمارکردوە.

لە هەموویان گرینگتر (ئەنستانس ماری کەرمەلی) لە کتێبەکەیدا لەساڵی ١٩١١ لە بەشی شەشەمی دا کە لە ڤیەننا بڵاوکرایەوە، کتێبەکە بە ناوی

(دۆزینەوەیەکی تازەی دوو کتێبی پیرۆزی ئێزدییەکان) کە زانیاری دەربارەی نوسراو نوسینی ئێزدیەکان تێدایە بەڵام ئێزدیەکان دان بەمەش دانانێن.

## هەندێ داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و ئاینی ئێزدییەکان:

### یەکەم/ برایەتی و دۆستی هەڵبژاردن

ئەمە یەکێکە لە نەریتەکانی ئێزدیەکان کە ئێزدییەك بۆی هەیە کەسێك لەسەر دینێکی جیا لە ئێزدی ببێتە دۆست و برایان جا لەسەر هەر ئاینێك بێت بەڵام ئەگەر ئەم دۆستە کوردبێت ئەوا باشترە.

جا بۆ ئەمەش دەبێ ئەم ئێزدیە لە کاتی خەتەنەکردنی منداڵێکی خۆیاندا ئەو برادەرە (دۆستە) بهێنێتە ماڵەوەو لە باوەشی ئەم برادەرە خەتەنە بکرێ بۆ ئەوەی خوێنی ئەم منداڵە بکەوێتە سەر جەستەی (کەسە دۆستە نائێزدیەکە) کە بەمەش لە رێگای خوێنەوە دەبنە دۆستی هەمیشەیی، و ئەو کەسەش لە لای ئەم بنەماڵە ئێزدیە وەکو ئەندامێکی خێزانەکە سەیردەکرێ.

ئێزدیەکان حەز ناکەن کەسێکی هاو ئاینی خۆیان(ئێزدی) بە براو دۆستی خۆیان هەڵبژێرن ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

١- هەموو ئێزدیەکان دۆستی یەکترن بەڵام بۆ ئەوەی ژن و ژنخواستن لەناویان حەرام نەبێت ئەوا ناکرێ هاوئێزدیەك بکەنە برای خۆیان چونکە بەپێی نەریتی ئێزدی نابێ تا حەو پشت ئەم برایە ژن لە یەکتری بخوازن.

٢- ئێزدیەکان هەوڵ دەدەن زیاتر لەرێی ئەم پەیوەندیەوە ببن بە دۆستی موسڵمانەکان تاوەکو لە کاتی تەنگانەدا داڵدەیان بدەن.

## دووەم/ ژن و ژنخواستن

کۆمەڵگای ئێزدیش وەکو زۆربەی کۆمەڵگاکانی تر باوك سالاریە کە پیاو بۆی هەیە چەند ژن(زیاتر لە ژنێك) بخوازێ و هەروەها دەتوانی ژن تەلاق بدات و ژنی تر بهێنێت، بەڵام ژنی تەلاقدراو لەبەر هەر هۆکارێك بێت کە تەلاق دراوە ئەوا بۆی نیە جارێکی تر شوبکاتەوە.

ئاینی ئێزدی ڕێگا بە کوڕ و کچ نادات کە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسانی غەیری ئاینی خۆیان بکەن ئەمەش بە مەبەستی پاراستنی ئاینەکەیانە. هەر کچێك شو بە کەسێکی نائێزدی بکات ئەوا چارەنوسی بەس(کوشتن)ە ئەگەر لەسەر ئاینی خۆشی مابێتەوە یان گۆڕابێت هەر دەکوژرێت.

ژن خواستن کە لە کۆمەڵگاو ئاینی ئێزدی دا پەیوەندی بە هەرەمی چینایەتیەوە هەیە کە چەند چینێك هەیە لەناو ئاینی ئێزدی دا بەهۆی ئاینەوە ئەم پلەو چینە دروست کراوە کە هەرکەسەو دەبێ لە چینەکەی خۆی هاوسەرگیری بکات و نابێ لە چینەکی تری خوارووی خۆی یاخود سەرووی خۆی هاوسەرگیری بکات.

ئێزدییەکان ئاهەنگی تایبەت بۆ بوك و زاوا دەکەن و لەم ئاهەنگەدا دەهۆڵ و زوڕنا لێدەدەن، مەبەست لەم ئاهەنگ گێڕانە ئەوەیە کە ئەم کوڕ و کچە بە گوێرەی داب و نەریت بڕیاریان داوە ژیانی ژن و مێردایەتی بەسەربەرن.

## سێیەم/ مۆرکردن( التعميد )

یەکێ لە نەریتەکانی ئێزدی ئەوەیە کە هەموو ئێزدیەك دەبێ بە منداڵی ببردرێتە (کانی سپی) وە لەوێ لە لایەن پیاوێکی ئاینی مۆر بکرێ، کەسوکاری ئەم منداڵە دەبێ (چوارنان و مریشکێکی سورکراوەو هەندێ پارەو شیرنەمەنی)

لەگەڵ خۆیان داببەن، پاش ئەوەی سەرپەرشتیاری کاتیە کە (سێ جار) ئاوی بەسەر منداڵەکەدا کرد ئینجا کەسوکاری ئەم منداڵە دەست دەکەن بە چەپڵە لێدان و هەلهەلە لێدان و بەخشینەوەی شیرینی.

خودی ئەم ئاوە لە کانی سپیەوە دەرژێت و دەکەوێتە ناو دوو حەوزی جیاواز کە یەك بۆ کوڕ و ئەوی تر بۆ کچ. ئەم دیاردەیە لە ئاینی مەسیحی و یەهودی دا هەیە، هەروەها لە ئاینی یۆنانی کۆن دا هەیە کە گەورەو بچووك لە پەرستگای ئەپۆلۆی تەعمید دەکران هەروەکو فلیمەکەی ترۆی (ئەخیل).

## چوارەم/ قەدەغەکراوەکانی ئاینی ئێزدی

هەروەکو سەرجەم ئاین و داب و نەریتەکانی تر ئەوا چەند تایبەتمەندیەکیان هەیە وەکو (جلی شینی لەبەر ناکەن و خاس و پاقلەو ماسی) ناخۆن، هەروەها تف ڕوکردن لەسەر زەوی بەکارێکی خراپی دەزانن و وا دادەنێن ئەوە (تف لە شەیتان)دەکەن.

لە بڕوای فیناگزسی دا(خواردنی گۆشتی ئاژەڵ و پاقلە) قەدەغەکراوە، هەروەها شیعەش گۆشتی کەروێشك و ماسی (جوری) ناخۆن.

**پێنجەم**/ ئێزدیەکانیش وەکو هەر ئاینێکی تر ڕێورەسمی تایبەتی و ئاینی خۆیان هەیە وەکو حەجکردن، بەڵام ئەگەرچی ئێزدی کە هەموو شتێك کاریگەری ئاینەکانی تری وەکو (زەردەشتی، مەسیحی) پێوەدیارە، بەڵام لە هەموویان زیاتر کاریگەری ئاینی ئیسلامی لەسەرەو پێوە دیارە... ئەمەش لەبەر زۆربەی ناونانی شوێنە پیرۆزەکانیان بە عەرەبی و هەمان شێوەی ئاینی ئیسلام.

بۆ نمونە کردنی لالش و تەکیەی (شێخ ئادی) بە ماڵی خواو قیبلەی خۆمان وە گۆڕینی ناوی چیای لالش بۆ چیای عەرەفات وە ناونانی ئەو کانیەی کە لە چیای لالشەوە هەڵدەقوڵێ بۆ ناوی زەمزەم.

ئێزدیەکان پێیان وایە زمانی کوردی پیرۆزە و خودایە زمانی کوردی قسەی لەگەڵ کردون بۆیەش هەر بەو زمانە(کوردی) نوێژ دەکەن و دوعا دەکەن.

أ- دوو نوێژیان هەیە: ١- نوێژی بەیانی. ٢- نوێژی ئێوارە(پێش خۆرئاوابون).

ب- دوعاکانیشیان هەر بە کوردی دەکەن، کە ڕۆژانە دەبێ جارێك دوعا بکەن و پێشی دەست چاویان بشۆن و بە دڵەوە دوعا بکەن کە دەڵێن: ئامین ئامین، تەیارەك ئەلدین، ئەڵلا ئەحسەنل خالقین، حەق حەمدلله یارب عالمین، خێرا .. شەرا وەرگەڕێن، مەهدەرەکێ دخوازین.

ج- زەکات: ئێزدیەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان لە ناو تایفەی خۆیان پشتیان بە زەکات بەستوە کە ساڵانە بڕێك پارەو سامان لە ئێزدیەکان وەردەگیردرێ بەڵام دواتر لە لایەن میرەوە بۆ قازانجی گشتی تایفەکە خەرج دەکرێت.

## تێبینی:

١- زەردەشتیەکان: (ئاهورامەزدا) (خودای چاکە) دەپەرستن.

٢- ئێزدیەکان: ئەهریمەن(خودای شەڕە شەیتان) دەپەرستن گوایە بۆیە وادەکەن بۆ ئەوەی خودای شەڕ لە خۆیان ڕازی بکەن و توشی بەڵاو کێشەیان نەکات و گوناهبار نەبن و (خودای خێریشی) خودایەکی باشەو دەیانخاتە بەهەشتەوە.

تەنانەت (ئێزدیەکان) پێیان وایە شەیتان کارێکی باشی کردوە کە سجدەی بۆ (ئادەم) نەبردوە چونکە ئەو بەس سجدە بۆ خودا دەبات.

(ناوی فریشتەکان و نوێنەریان لەسەر زەوی دا) (دەردائیل: شێخ حەسەن، ئیسرافیل: شێخ شەمسەدین، میکائیل: شێخ ئەبوبەکر، جبرائیل: سەجاددین، شەمنائیل: ناسرەدین، نورائیل: فەخرەدین).

حەرامکراوەکان: ١- فاسۆلیا. ٢- ماسی لەبەر پێغەمبەر یونس قەدەغەیە.

٣- ئاسك لەبەر ئەوەی ڕانەمەڕی یەکێك لە پێغەمبەرەکان بووە.

٤- گەرماوی گشتی(حمام) بە هەموو شێوەیەك قەدەغەیە.

٥- ناوهێنانی شەیتان قەدەغەیە چونکە ناوی خوایە.

٦- هەر وشەیەکی هاوشێوەی شەیتان بێت نابێ بەکاری بهێنین، وەك(قەیتان، شەت، شەڕ، ..هتد).

٧- نابێ هیچ وشەیەکی هاوشێوەی ئەم وشانە بەسە زمانمان دابێت، وەکو(مەلعون، نەعلەت، ناڵ، حەرام، ..هتد).

## نڤیژا سپیدەیی

## بناڤێ یزدانی پاك و دلۆڤان و میهرەبان

خودێ ئەڤ ژ بونا شاقی تە، شوناتە، ژ بونا پادشا هیپانە یاربی توکریمی، تو رحیمی، تو خودایی، تو کریمی تو ملکی مولکی جیهانی ملکی سوق و سمایی، ملکی عەرشی، عەظیمي یاربی تو ژ ازلدا قدیمی، یاربی تا إبدا توکا ماروحایی یاربی تو ملکی جن و إنسی، ملکی عرشی و کریمی، یاربی تو سمدو نوێ و نمایی یاربی تو سمدو حی الحمیدی یك و یکتابی أنبازی یاربی هە تو لائقی مدح و تنایی.

یاربی تو خوداوندی سبهری، خدانی ماء و سبری، خدانی چم نهری یاربی تو داوندی عفایی

یاربی تەنالوما، تەنا ژمدادی، تەنا اوازا، تـەنا ڕێگـا، تـەنا چـنگا یـاربی کـسی نزانە تو کشایی.

یاربی تو کبرندەبی حـوقی، منـدرایی قـوتی، تـو حلیمـی، ملکـوتی یـاربی تـو حاکمی شەو گدایی.

یاربی هری هابی، هری هابی، هری هابی.

## جەژنی ئێزدییەکان

١- جەژنی ڕۆژوان: ئێزدیەکان سێ ڕۆژ بەڕۆژو دەبن لە سەرەتای مانگی کـانونی یەکـەم بـەڕۆژ و دەبـن و دواتـر دەیکـەن بـە جـەژن، گـەردەن ئـازای و سـەردانی یەکتری دەکەن.

٢- جەژنی بیلندە: ئەمە جەژنی لە دایکبونی (یەزید)ە کە لەم ڕۆژەدا هـەم ماڵـە ئێزدیەکی وەزع باش نان دروست دەکەن و دەیبەخشنەوە بەسەر هەژارەکاندا.

٣- جـەژنی مـردوان: ئـەم جەژنـە دەکەوێتـە ڕۆژی دەیـەمی مـانگی دوازدەمـی سـالنامەی ڕۆژهـەڵاتی کـە لـەم ڕۆژەدا جـۆرە کولیـچەیەك دروسـت دەکـەن و ئەیبەخشنەوە بەسەر هەژاران، هـەروەها ئەسـتورکێك دروسـت دەکـەن و دەنکـە مێـوژێکی تێئەخـەن و لەسـەر پـشتی یـەکێك لـە کوردەکـانی ئـەم بنەماڵەیـەدا دادەنرێن جا کەسێکی بێگانەی ئەم خێزانە دەبی بێت و (ئەستورکێکەکە) پارچە پارچەی بکات و دابەشی بکات بەسەر ئەندامانی ماڵەکـە جـا کـێ بـەختی هـەبوو دەنکە مێژوەکەی تێدابو ئەوا بەختی یار ئەبێ و دوا ڕۆژێکی باشی دەبێت.

٤- جەژنی خضر ألیاس: ئەم جەژنە لە یەکەم پێنج شـەمەی مـانگی ڕەشـەمێی ساڵنامەی (ڕۆژهەڵاتی) دایە کە هەندێجار ڕۆژێك یان سـێ ڕۆژ لـەم مانگـە بـەڕۆژو دەبن.

٥- جەژنی چلە: کە چلەی ڕۆژ لە زستان ڕۆیشت ئەم جەژنە دەکەن هەروەها بۆ چلەی هاوینیش هەمان جەژن دەکەن، دەڵێن ئەمە لە شێخ عەدیەوە داهاتوەکە هەر جارەو چل ڕۆژ بە ڕۆژو بووە.

٦- جەژنی سەری ساڵ: ئەم جەژنە یەکەم ڕۆژی چوار شەممەی مانگی گوڵانی ساڵی کوردی (نەورۆز) وایە کە لەم ڕۆژەدا کوڕان و کچان گوڵەکانی دەشت ئەچننەوەو بەسەر دەرگای ماڵیان هەڵیدەواسن و خواردەمەنی دروست دەکەن و بەسەر هەژاران دا دابەشی دەکەن و کوڕان و کچان سەیران دەکەن و هەڵپەرکێ دەکەن و گۆرانی دەڵێن و سەرتاپای ئەم مانگە میوانداری بۆ دیاری یەکتری دەکەن.

٧- جەژنی کوشتی(حاجیان) کە لە جەژنی (قوربانی موسڵمانان) ئەکات لە ڕۆژانی ٧و ٨ی مانگی قوربان (ذي الحجة) کە ئێزدیەکان دێنە سەر گۆڕی شێخ عەدی کە لە ئێوارەی ڕۆژی نۆ سەردەکەونە سەر شاخی عەرەفات و لە کاتی ڕۆژئاوابون دا لە شاخەکە دێنە خوارەوە سەرێك لە (بەردەڕەش) دەدەن و دواتر دەچنە ناو هەوارگەی شێخ عەدی و پاشان دەست و دەموچاویان بە ئاوی زەم زەم دەشۆن و دواتر تا بەرەبەیان دەست دەکەن بە بەزم و ڕەزم و بەیانی زوو جەژنە پیرۆزە لە یەکتری دەکەن و گەردەنی یەکتری ئازا دەکەن و دەستی پیاوە ئاینیەکانیان ماچ دەکەن.

٨- جەژنی کومدلی: ئەمە یەکێکە لە جەژنە گەورەکانی ئێزدی کە لە ١٥ تا ٢٠ی ئەیلول ئێزدیەکان لە هەر ناوچەیەکەوە دێنە گۆڕستانی شێخ ئادی و بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ دەست دەکەن بە بەزم و ڕەزم شەو و ڕۆژ بە گۆرانی و هەڵپەرکێوە خەریك دەبن و چەند جۆرە یارییەکی خۆیان ئەنجام دەدەن کە پێستەگایەکیان پێیەو بەپەلەکردن دەچنە سەر شاخێك و دەگەڕێنەوە.

٩- جەژنی لیلە القدر: ئەم جەژنە بەر لە شەوی ١٥ی مانگی شعبان کە پێی دەڵێن (لیلە القدر) لەم شەوەدا ئێزدیەکان کۆدەبنەوە لە نزیك گۆرستانی شێخ عەدی کە لەوێ گەورەی شێخی ئێزدیەکان دێت و پێش نوێژیان بۆ دەکات کە (٦)رکاتەو رکوعی تێدانیەو یەك سجدەی تێدایە کە لەم شەوەدا هەموو ئێزدیەکان کۆدەبنەوەو ئەم شەوە بەقسەی خۆش و سرودی ئاینی تایبەت بە خۆیان بەسەردەبەن.

١٠- جەژنی سەمای ئاینی: جەژنێکی نهێنیە بەدزی بەس ئێزدیەکان دەیکەن.

## چینە ئاینیەکان و کۆمەڵایەی ئێزدی:

١- سەرداری شێخان(میری شێخان).

٢- پێشەوای باڵا.

٣- بابە شێخ.

٤- شێخەکان.

٥- پیر.

٦- هەژار.

٧- گفتوگۆکار.

٨- دەروێش.

٩- کوچەك.

## لیستی سەرچاوەکان

١- شاکر فەتاح، یەزیدییەکان و ئاینی یەزیدی، چ١، کامەران، سلێمانی، ١٩٦٩.

٢- ئەنستانیس ماری کەرملی، کتێبی ئێزدییەکان (جیلوەو مەسمەفارەش)، و.نەجاتی عبدالله، چ١، شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٣- سەعدوڵلا شێخانی، مێژوو و هەندێ لە ناودارانی هۆزی شێخان، چ١، ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٢.

٤- نەجم ئەڵوەنی، ئاینی ئێزیدی لە نێوان چەند جەمسەری و بڕوای یەکتاپەرستی دا (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتیە)، چ ، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٩.

# زەردەشت و ئاینی ئێران

وەرگێڕانی لە فارسیەوە/ قارەمان مستەفا

لە دوای بەهێزبوونی خێڵەکانی ئاریایی، لەو سەردەمەی کە کاویەکان لە هەموو جێگایەك دژایەتی یەکتریان دەکرد بۆ پێکهێنانی یەکگرتنێکی گەورە، ئاسایش و ئارامی ئاریایەکان لەناوچوو بوو، زرەت ئەوشتر کوڕی پورِوش ئەسپە لە خێزانی ئەسپیتامە لە ناوچەی خوارزم (باکوری ئۆزبکستانی ئێستا) پەیدابوو و ئالای ئامادەباشی بۆ شەڕ و داواکاری بەرزکردەوە.

دەربارەی ناوی زەردەشت دەبی بڵێین، کە زرت ئەوشتر بە مانای حوشتری زێڕینە. حوشتر لە خوارزم و بیابانەکانی ئاسیای ناوەڕاست بە گیانداریکی بەسوود دادەندرا لەبەر ئەوەی بۆ سواربوون بەکار دەهات، و باری لێ باردەکرا، و شیری بەکاردەهات بۆ خواردن، و گۆشتەکەشی دەخورا، لە خوری یەکەشی جلوبەرگ و خێمە دروست دەکرا، و لە پیستەکەشی فرش و حەشارگە و کەلوپەل دروست دەکرا، لەبەر ئەو هۆیانە حوشترە بەنرخ بوو، و ناوی حوشتریان لەسەر منداڵەکانیان دادەنا، وەکو ناوی (زرت ئەوشتر) واتا (حوشتری زێڕین) کە پوروش ئەسپە، پوروش ئەسپە و کرش ئەسپە) هەموو ئەو ناوانە بۆ ئەسپ دانرابوون، ئاریایەکان ڕێزی تایبەتیان هەبوو بۆ مانگ، لەبەر ئەوەی شیری دەدا و زەوی دەکێڵاو باری دەبرد و گۆشتەکەشیان دەخواردو لە پێستەکەشی جلوبەرگ و پێڵاو و فەرشیان دروست دەکرد، لەبەر ئەوە ناوی مانگ و میمونیان لە لایان بەڕێز بوو ئەو ناوانەیان لە منالەکانیان دەنا، و ئێمە گوێمان لە ناوی وا دەبێت کە پەیوەندی هەیە بە ناوی مانگا، لەوانە(گائۆماتا) ناوی بەناوبانگترین چاکخوازی مێژووی کۆنە،

گائۆمادپانبە بە زمانی عەرەبی(قمادبان) ناوی ئێرانیەکی بەناوبانگە شاری (مەدینەیە) لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا ژیاوە. و گوێمان لەو ناوە دەبێت لە کاتی تیرۆرکردنی خەلیفەی دووەم(عمری کوڕی خەتاب)دا.

لەبەر ئەوە (سەگ) گیانەوەرێکی پەسند کراو بوو هەندێك لە ناوەکانی ئێرانی بە ناوی (سەگ) دانرابوون، و ئێمە ناوی (ئەسپەکە) (سەگ) لە ناو ناوی سەرکردەکانی خێڵی ئەشکیلا(ئەسکێت)دا دەبینین لە باکوری ئازربایجاندا، و ناوی منداڵە شیرخۆرەکانیان دادەنا بە ناوی گیانداریك، نەریتێکی ئاسایی بوو لە ناو هەموو گەلەکانی جیهاندا شتی وا هەبووە.

لە عەرەبیدا زۆر گوێمان لە ناوی شێر(أسد)و فەهد و شاهین دەبێت، و دەزانین کە (کلب) سەگ نمای یەکێك لە خێڵە گەورەکانی عەرەب بووە، و خێڵ هەر بەو ناوە دەخوێندراوە هەر بەو ناوەش چەند سەدەیەك ژیاوە، و ئەو کەسەی کە ئەندامی ئەو خێڵە بوایە بە (کلبی) (کە لە خێلی کلبە) دەگوترا بۆ کچە شیرەخۆرەکانیش لە ئێران ناوی گیانەوەر و باڵندە و گول دادەنرا و گەلێك لەو ناوانە تا ئەمڕۆش ئاساییە. وەکو هەندێك لەو ناوانە لە تەنیشت یەکتر دابنێین، ئیتر لە لامان سەیر نییە دیتنی ناوی زەردەشت کە پەیوەندی هەیە بە حوشتر، و زۆر ئاسان قبول دەکەین کە (زرت ئەشتر) مانای حوشتری زێڕینە و مانای تری نییە، و پێویست نییە بیر بکەینەوە هەروەکو زانایان (پورداود و ازر گشسپ) دەڵێن ناوی وا ناتوانێت شایستەی پێغەمبەری گەورەی ئێرانیان بێت. و بگەڕێن بۆ ئەوەی مانایەکی تری بۆ بدۆزینەوە. (دیاکۆنۆف) دەربارەی ناوی زەردەشت بیروباوەڕێکی تری هەیە، ئەو دەڵێ کە ناوی زەردەشت باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستیەیە کە ئەو کەسایەتێکی مێژووییە نەوەك چیرۆکی، بەڵکو ئەگەر لەوانە بوایە دەبوایە ناوێکی پیرۆزی بۆ دابندرێت، ئێستاکە کە دانەری ئاینی مەسیحیەت کەسایەتیەکی ئەفسانەیە ناوەکەشی لێوەشاوەیەتی ئەو ئەفسانەیە کە ناویان ناوە (ئیوشع) واتا

(دەربازکەر). ئەو باس دەکات کە (ناوی زەردەشت یەکێك لە ناوە ئاساییەکانی ئەو سەردەمی ئێران و ئەوە خۆی وادەگەیەنێت کە خاوەن ناو بەڕاستی لە مێژوودا هەبووە. ئەگەر هەبوونی ئەو تەخێلی بوایە ناویشی بەبێ گومان هەڵدەبژرا لە ناوە ئاینیەکانی و یان وشەکانی کە مانای ئاینی دەگەینن.

لێکۆڵەرەوانی مێژووی کۆنی ئێران دەربارە مێژوو و جێگای پەیدابوونی زەردەشت بیروڕای جیایان هەیە، هەندێك باس دەکەن دەڵێن زەردەشت شەش هەزار ساڵ پێش لەدایك بوونی مەسیح بووە، و هەندێکی تر دەڵێن کە ئەو لە سەردەمی داریوشی گەورە بووە. لە سەردەمی شاپوری دووەمی ساسانی (سەدەی چوارەمی میلادی). و بە بەڵگەی (موغانی ئازربایجان) ئەویان بە خەڵکی ئازربایجان داناوەو زەردەشتیان داناوە لە سەدەی حەفتەم یان شەشەم. ئەو بەڵگەیە لەو کاتە باوەڕپێ نەکرا کە لە دوای لەناوچوونی پاشای هەخامەنشی ئاتۆرپاتیك (شهریاری سەردەمی ما) لەگەڵ (ئەسکەندەری مەقدونی) ڕێکەوتن کە بکرێتە بە شهریاری باکوری ماد، و لەو کات بەدواوە ئەو بەشە بە ناوی ئەو دانراو ناوی (ئاتۆرپاتیکان) کرد بە ئازربایجان.

لە دوای سەردەمی ئەسکەندەر ئازربایجان سەربەخۆیی وەرگرت لە بەرامبەر سلوکیەکان، و لە کۆتایی (مۆغەکان و ئاگرپەرستەکانی ئازربایجان) توانیان ژیانی خۆیان بەسەر بەرن، ئەگەر ناوچەیەك لە دەرەوەی پارس دینی ئێرانی لە سەردەمی سلوکیەکان پاراست بێت ئەوا خەڵکی ئازربایجان کە ئاینێکی تایبەت بەخۆیانیان هەبووە. واتا ئاینی(مزدائیسنا) لە ئازربایجان کە شێوەیەکی تایبەتی هەبوو لە ئازربایجان و ئاینێکی زۆر کۆنی ئازر پەرستانە (ئاتۆرپاتیکان یەکسان بوو بە پارێزەرانی ئازر).

دوای (مۆغان) زۆرترین دەوریان هەبوو لە زیندوکردنەوەو هەڵسوڕانی ئاینی(مزدائیسی) هەر لەبەر ئەوەش بووە کە زەردەشتیان لە خۆیان داناوەو

جێگای لە دایك بوونیشیان بە ئازربایجان داناوە، و خۆشیان بە ڕێبازی ئەو زانیوە. هۆی ئەوەی کە زەردەشتیان بە کۆتایی سەردەمی مادەکان دادەنا دەبێ لێکۆڵینەوە کە ئاینی زەردەشت لە سەردەمی مادەکان بە هۆی ڕاگەینەرانی کە لە ڕۆژهەڵاتی فلاتی ئێران گەیشتنە ڕۆژئاوای لە ئازربایجان و همدان گرنگی پێدرا و لەوانەیە ڕواڵەتی وەرگرتبێت.

بەڵام بەڵگەی سونەتی دەربارەی سەردەم و جێگای پەیدابوونی زەردەشت کە(مۆغان)ی ئازربایجان لە سەدەی چوارەم میلادیدا هاتنە (ئاوەستا) ناتوانێ ڕاست بێت. لەبەر ئەوەی بێگومان زەردەشت پەیوەندی هەیە بە سەردەمێکی زۆر پێشتر لەو ڕێکەوتە بەو سەردەمەی کە هێشتا کۆچی ئاریایەکان بۆ ناو ئێران دەستی پێ نەکردبوو. لێکۆڵەرانی مێژوویی لەو باوەڕەن کە ئەو زمانەی کە گاتای زەردەشت سرودیان پێگوتووە زمانێکیە کە زۆر پێشترە لە سەردەمی مادەکان، و ئاوەدانکراوەکان و ڕووداوەکانی کە لە (گاتا)دا باسکراوەیە وا نیشان دەدات کە پەیوەندی بە زەردەشتەو لە ڕۆژهەڵاتی فلاتی ئێراندا ڕوویداوە. ئێرانیەکان لە سەدەی نۆیەمی پێش میلاد بەدواوە لە ڕۆژئاوای فلاتی ئێران شارەزایان هەبووە لەگەڵ دەوڵەتەکانی (عیلامی و ئاشوری)، و ئەگەر ئەو جۆرەی کە (مۆغان)ی دەرکەوتبایە، بەڵگەی (مۆغانەکان)ی سەردەمی زەردەشتیان هێنایتە پێشەوە بۆ سەدەی شەشەمی پێش میلادی مەسیح، و ئەو سەردەمە بوو کە دەوڵەتی ماد لەوپەڕی بەهێزی دابوو، و زەرەشتیش بەو بەڵگە نادروستانە لە دەوڵەتی ماد دا ژیاوە، ئەگەر شتێکی شاراوە لەو بەڵگانەدا هەبوایە دەبوا زەردەشت لە سرودەکانیدا ئاماژەی پێ بکردبایە بە دەوڵەتی ماد یان باسی پادشای مادی بکردبایە، لەو کاتەدا شتی وانییە.

لە وتەکانی زەردەشتدا هیچ نیشانەیەك یان دیمەنێك لە سیاسەتی سەردەمی ماد بەرچاو ناکەوێت. زەردەشت باسی سیفەتی دەوڵەتەکانی (کاوی) و (کرین)و

(ئاوسیج)ی ئێران دەکات، بەس ئەو سەرکردەیەکی بە توانایە وا باسی دەکات (ییما) کوڕی (وی ونگهان) (جمشید کوڕی هۆشەنگ)ـە کە پەیوەندی هەیە بە سەردەمی پێش کۆچکردنی ئارییەکانە بۆ هیندستان. ئەو وا باسی جمشید دەکات وەکو بڵێت کەمێك پێش ئەو ژیابێت و ئەو خێزانەکەشی دەناسی.

ناوی ئەو شوێنانەی کە زەردەشت لە (گاتا)دا باسی کردوە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێت لەگەڵ ئەو ناوانەی کە لە ڕیزی ئەو ناوانەی کە لە سەردەمی مادەکاندا هەبووە. بەڵگەی سونەتەکان دەڵێن زەردەشت لە ئازربایجان چووە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئێران، ئەوە هیچ ڕاست نییە کە باسی کراوە لە مێژوودا. زەردەشت خۆی باس دەکات کە سەرەتای دەستپێکردنی لە (خوارزم) بووە و دوای چووە باختر(بلخ). چ ڕاستیەك باشتر لە ئەوەی کە زەردەشت خۆی باسی دەکات؟

ناوچەی پەیدابوونی زەردەشت لە ڕۆژئاوای ئێران و لە نێوان دوو ڕووبار و ئاسیای بچوکی دور بووە، لەبەر ئەوەی باسی هیچ خێڵێك ناکات کە لەو جێگایەدا ژیاون واتا ئەو خێڵانە هێشتاکە نەچووبوونە ئەو شوێنە. لە کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش میلاد دا تەنیا پەیوەندی هەبووە لە نێوان ڕۆژئاوای فلاتی ئێران لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا و پەیوەندی (عیلامیەکان) بوو بەو ناوچەیە کە بۆ بازرگانی دەڕۆیشتن تاکو دورترین ناوچە لە ڕۆژهەڵاتی فلاتی ئێران، و دروستکراوەی شارستانیەکانیان بار دەکرد بۆ ناوچەکە. زەردەشت وەکو دەیەوێت باسی دەوڵەتی (عیلام) بکات (عیلامی) بە ناوی(ئقلیمی حەفتەم)و (خوانیرپ) ناو دەبات و ئاماژە دەکات کە لەو جێگایە بێ عەدالەتی فەرمانڕەوایی دەکات و فەرمانەکەش لە ژێر دەستی(ئەنگرە منیوی ئەهریمەنە)، و حاکمەکانیشی گوێڕایەڵی (ئەنگرەمینۆدۆنە). زەردەشت کاویانەکانی کە دەیانویست سەندیکای تایبەت بۆ شەڕ دروست بکەن وەکو ئەو شاهانەی دادەنان کە لە (خوارنیرپ) دەژیان و (ئەهۆرامزدایان) دەناسی و (دیواپەرست) بوون: ئێوە (دیواکان) لە ڕەگەزی(ئەنگرەمنیوایدێت) ئەو کەسانەی

کە ئێوە دەپەرستن وەکو ئێوەن. ئێوە ماوەیەکی زۆرە لە ناوچەی (خوانیرپ) ئیشی وا دەکەن کە لە هەمووان دیارە. ئێوە فەرمانی دەدەن، و ئەوانەی کە لە ژێر فەرمانی ئێوەن، و ئەوانەی کە بە هۆی ئێوە پلەو پایەیان بەدەست هێناوە کاری خراپ دەکەن، و لە فەرمانی (ئەهورامزدا)و چاکەکاری ئەو خۆیان دور دەکەنەوە. ئێوە خەڵکتان لە خۆشی دورکردۆتەوە، لەبەر ئەوەی (ئەنگرەمینو) ئێوەو فەرمانبەردارەکانی کە ئێوەیان دوورکردۆتەوە لە چاکە، و ڕێنماییان دەکات بۆ درۆ تاکو مرۆڤایەتی لەناوببات.

ناوی ئەو شوێنانەی کە لە کتابی (ئاوەستا)دا هاتووە لە پەڕاوگەکانی مێژوودا نییە، و بێگومان تاکو سەدەی شەشەمی پێش زایین بە تێپەڕینی کات ناوەکان گۆڕاون. لە سرودەکانی زەردەشت هەتاکو باس لە خێڵە بە تواناکانی وەکو (سکا)و (داهە) کە لە سەدەی حەوتەمی پێش زایین ژیاون نەکراوە، یەکەمیان لە ناوچەی دەریای (سیحون) و دووەمیان لە ڕۆژئاوای خوارزم و سەحراکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەر نیشتەجێ ببوون، ئەو لە جیاتی خێڵی (سکاها) باس لە خێڵی (تورهیا) (توران) دەکات، (تورهیاکان) ئەوان بەشێك لە ئاریاکان بوون کە لە سەدەکانی دوایی خێڵی (سکائی) یان لێ دروست بوو دەکات، هەندێك لە خێڵی سکائیەکان دوای ماوەیەك کۆچیان کرد بۆ ناوچەی (فلاتی ئێران) و ناوچەی (سیستان) بە ناوی ئەوان کرا.

بەڵگەکان دورەی هەخامەنشی سەردەمی زەردەشتیان گەڕاندوە بۆ (٦٠٠٠) ساڵ پێش ئەو بەڵگانە هەندێك لە مێژوونوسانی یۆنانی بە قسەی ئێرانیەکانی ئەو سەردەم نوسراو بوون، باشترین ڕاستی کە دەسەلمێنی بەڵگەی (مۆغانی ساسانی)دورە لە ڕاستی، وەکو باس دەکەن زەردەشت لە کۆتایی سەردەمی حوکمڕانی ماد و سەرەتای حوکمڕانی هەخامەنشینە.

ڕاسترین بەڵگەی باسکراو بۆ سەردەمی زەردەشت بەکارهاتووە نیشان دەدات کە زەردەشت لە سەردەمی سەدەکانی (١٢ و ١٣)ی پێش میلاد بووە لە دەوروبەری باشوری دەریاچەی (ئارال) لە ناوچەی خوارزم پەیدابووە. بۆ سەلماندنی پەیدابوونی زەردەشت لە ناوچەی (خوارزم)و لە سەردەمی پێش (ماد) دەبێ چ بەڵگەیەك باشتر لە قسەکانی زەردەشت هەبێ کە بە باشی ئاشکرایە خەڵکی (خوارزمە)و ڕاگەیاندنەکەی لە خوارزم دەستپێکردوەو لە بلخ درێژەی پێداوە. واتا سەرەتای ڕاگەیاندنەکەی زەردەشت لە باکوری دەریاچەی (ئارال) بووەو ئەو پەڕەی کارگەرێکەشی لە (بلخ) بووە.

## فێرکاریەکانی زەردەشت

هەروەکو پێشتر باسمان کرد، شەڕەکانی دنیای پێشوو بە گشتی شەڕی ژێر ئالآی (ئێزدان) واتا (الهە) بوون. خەڵکی کۆمەڵگای ئەو سەردەم ترسێنرابوون لە ئازارەکانی ئاسمانی بەهۆی گوێگرتن لە وتەی پیاوە ئایینیەکانیان کە بەدەست فەرمانڕەواکان و سەرکردە ئاینیەکانیان چاو و گوێیان بەسترابوو و بە دەرکردنی فەرمانی جیهاد لە هێرشەکان ڕێگەی خودا بەشداریان دەکرد تاکو خەڵکی دەوروبەری خۆیان ناچار بکەن کە فەرمانبرداری فەرمانڕەوایەکانی خۆیان بن و بە گیان و دڵ لە ناکاو هێرشیان دەکرد و خەڵکیان دەکوشت. بە بیانوی چەند خودائی و بیروباوەڕی جیاوازی ئایینی شەڕیان هەڵدەگیرساند هەریەك لە فەرمانڕەوایەکانی ئایینی سیاسی گومانیان دەکرد کە بیروباوەڕی خۆیان ڕاستە و بیروباوەڕی ئەوانی تریش ڕاست نییە، واتا بەس خودای ئەوان ڕاستەو هەر خودایەکی تر لە جیهاندا هەبێت و بپەرسترێن ڕاست نییە، و دەبێ لە جیهان نەمێنین و لە ناوبچن تاکو جیهان چاك بێت. ئەو بیروباوەڕە هەزاران ساڵ زاڵ بوو بەسەر کۆمەڵگەی

مرۆڤایەتی بەتایبەت لە ناوچەکانی (مسر و شام عیلام) و شەڕەکان دەستیان پێدەکرد و کاول دەبوون و کوشتاری گشتی دەکرا.

زەردەشت ئاشتیخوازو ڕۆشنبیر و مرۆڤ دۆست، یەکەمین کەس بوو لە جیهان کە ئەو ڕاستیەی زانی بنەمای جیاوازی کۆمەڵگەکان و شەڕەکان و کاول بوونەکان بە هۆی چەند خودائیە لە ئایینەکاندا. ئەو بە بیرکردنەوە بۆ لابردنی جیاوازی ئایینی و چەند خودائی و نزیك کردنەوەی بیروباوەڕەکان و خوداپەرستی مرۆڤەکان، و بۆ فێرکردنی مرۆڤ بە ڕەوشتی مرۆڤایەتی بە شێوەی ڕێکەوتنی گشتی ڕێبازێکی دروست کرد نە تەنیا بەس لە سەردەمی ئەو بەڵکو تاکو دەیان سەدە دوای ئەویش لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆیشتن. ئەو کە پیاوێکی قسەزان و قسەخۆش بوو، بیروباوەڕی خۆی وا جوان بە شێوەیەکی دڵڕاکێش و سادەو ساکار بە بەڕێزی بەیان دەکرد بە خوێندنی سرودە جوانەکانی دەستی دەکرد بە ڕاگەیاندنی یەکتاپەرستی و دژایەتی کردنی چەند خودائی. ئەو دوپاتی دەکردەوە کە لە جیهاندا خودائیکی تەنیاو نادیار لە ئاسماندا هەیە کە دروستکەری هەموو شتێکەو سۆزی داناوە لە نێو دڵی خەڵك و مرۆڤی خۆش دەوێت و ئیشی چاك دەکات. بێجگە لەو خودایە تاکە هەر خودائێك کە خەڵك دەپەرستن و بە ناوی شەڕ دەکەن شێتایەتیە و فریودانی خەڵکەو دروستکەری شەڕە کە خەڵك ڕادەکێشێت بۆ لای دەردو ڕەنج و دژایەتی کردنی یەکتر.

خێڵەکانی ئاریائی خوایەکانی خۆیان بە نازناوی (ئاسورا و دیوا) بانگ دەکردو دوای (ئاسورا) بووە خودای خێڵەکانی ئێرانی و(دیو)ش بووە خودای کۆچکەرەکانی ئاریائی هیند. لە ئەو ناوچەی کە زەردەشت دەژیا ناوی (ئاسورا) دەکرا بە (ئاهورا). ئاسورا/ئاهورا بۆ ئێرانیەکان بەس مانای خودای ئاسمانی دەدا.

زەردەشت خۆی بە نێردراوی (ئاهورامزدا) ناساندو ڕایگەیاند کە خوای ڕاستی جیهان(ئاهورامزدا)یە کە دروستکەری هەموو شتێکە و خوداو پێکهێنەرو بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، و ئیتر هەر چ بە خودا دادەنرێت (دیوا)و دوژمنی مرۆڤە. ئەو ڕایگەیاند کە (ئاهورامزدا) ئەوی هەڵبژاردووە بۆ ڕێنمائی کردنی مرۆڤ بۆ لای خوداو فەرمانی پێداوە تاکو پەیامەکەی کە بۆ دەرباز بوونی خەڵکە ڕابگەیێنی و ڕێگای ڕاست بە هەموو خەڵك نیشان بدات، دوژمنایەتیەکان و شەڕەکان و کاولکردنەکان و لە سنور دەرچووەکان لە جیهان لابدات، و برایەتی و بەیەکەوە ژیان و پێکهاتنەوەو ئاسایش و ئاسایی بوونەوە لە کۆمەڵگادا دروست بکات و ئەو بەو شێوەیە پەیامەکانی بە خەڵك ڕادەگەیاند.

ئێستاکە من دەمەوێت قسە بکەم. ئێوەی کە نزیکیت و ئێوەی کە دوریت، ئەگەر دەتانەوێت فێربێت گوێ بگرن و باش تێبگەن. ئێستاکە هەموو ئەوانەی کە من باس دەکەم لە بیرتان بمێنێت، لە ئێستاوە بەدواوە خراپ فێرکراوەکان و درۆزنەکان هیچ کات بە خراپەکاریەکانیان و بیرو باوەڕیان ناتوانن دواڕۆژی مرۆڤ بخەنە مەترسیەوە.

من دەربارەی ئەو دوو گەوهەرە جمکە قسەتان بۆ دەکەم کە لە سەرەتای پەیدابوونی جیهان پەیدابوونە. ئەوەی کە پیرۆزە بۆ ئەوەی کە دوژمنیەتی و بە کورتی (بیرکردنەوەو بیروباوەڕو فێربوون و قسەکردن و ڕەوشت و نەفس کێشان و روحی من و تۆ هیچ کات وەکو یەك نابێت) من باس لە شتێك دەکەم کە (ئەهورامزدا) لەو ژیانەدا فێری کردوم هەریەك لە ئێوە ئەو شتەی کە من بیری لێ دەکەمەوە و باسی دەکەم نەبەستیتەوە بە ئیشوکار ئەوا هیچ گرفتێکی بۆ دروست نابێت من باسی شتێك دەکەم کە بۆ ژیان باشترینە... من باسی شتێك دەکەم کە ئەو کەسایەتیە پیرۆزە فێری کردووم و ئەو باسانە هەر ئەو وتانەن کە خۆشی ژیانی

ئەبەدی دروست دەکەن بۆ مرۆڤ، من دەربارەی ئەو کەسایەتیە قسە دەکەم کە باشترین کەسایەتیە و ئەو دەپەرستم.

من قسە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەم کە بیر دەکەنەوە لەو شتەی کە مرۆڤی زانا بە بیری خۆی دەهێنێتەوە، و ڕێز لە (ئەهورا و هۆمنە) بگرێت، دەمەوێت دەربارەی ئەو ڕەحمەتەی کە (فروغی ئێزدی) دەگرێتەوە قسە بکەم-ئەو ڕەحمەتە، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە زانایانە بیربکەنەوەو ڕاستی بکەنە پیشەی خۆیان. گوێتان لە من بێت و باشترین شت بزانن، بە ئەوان بڵێ بەباشی لە ئاختانە بیر بکەنەوە تاکو پێش ئەوەی کە ڕووداوی گەورە ڕووبدات هەر یەك لە ئێوە لە هەڵبژاردنی دوو ڕێگاکە، بڕیاری ڕاست هەڵبژێرێت و ئەو ڕێگایە هەڵبژێرێت کە خۆشی لە ناودا شاراوەیە.

هەروەها ئەو دوو گەوهەرەی کە لە سەرەتادا جمك بوونە و لە ناخی مرۆڤدا پەیدابوونە یەکێکیان باشترینە و ئەوی تریان خراپە، لە بیرکردنەوە و قسەکردناو ڕەفتارو کرداردا، و لە نێوان ئەو دووانە ئەو کەسەی کە زانایە ڕاستەکە هەڵدەبژێرێت، بەڵام ئەوەی کە نەزانە ئەو ڕێگایە هەڵنابژێرێت. هەروەکو ئەو دوو گەوهەرە هەر لە سەرەتاوە بە یەکەوە پەیدابوونە، ژیان و مەرگیان دروست کردووە لە کۆتایدا خراپترین ژیان بۆ ئەو کەسانەی کە کەوتوونەتە دوای درۆ و باشترینیش بۆ ئەو کەسانەی کە لەگەڵ ڕاستیدان، و ئەوەی کە باشترین گەوهەر بوو و لە ئاسمانەکاندا جلی (خواپەرستی) لەبەردابوو ڕێگای ڕاستی هەڵبژاردوەو ئەوانە ئەو کەسانەن کە بە ئیش و کاری شایستە ڕازی بوونی (ئەهورامزدایان) دەدوێن. لە نێوان ئەو دوو گەوهەرە جمکەدا، دیواها(دیوان)ی ڕاستیان هەڵبژاردوە، وەکو بەیەکەوەن بە هەوەس و خراپترین بیرکردنەوە بیردەکەنەوە، و کۆمەڵگە تورە دەکەن تاکو مرۆڤایەتی ڕابکێشن بۆ فەساد و دوبەرەکی.

فەلسفەی پەیدابوونی زەردەشت خۆی لە (گاتـا)دا وا باسـی کـردوە، وەکـو بـە هۆی ڕەفتـارێکی ناشایستە (دیـوا) پەرستـەکان پیـاوی فێڵبـاز، و زوڵـم و ڕەنـج و فەساد لە دنیادا زیاد بوو، و خەڵك دەستیان هـەڵگرت لـە خوداپەرستی و فێڵیـان لێکـرا لـە لایـەن (دیواکـان)و (دیواکانیـان) پەرسـتی، گـانۆش ئـاوڕۆن (جیهـانی مەعنـەوی کـە دایکـی هەسـتیە) دەسـتی پاڕانـەوەی بـەرزکردەوە بـۆ دەرگـای (ئەهۆرامزدا)و گللەیی کرد لە بێ کەسی و بـێ سـەرکردەی و بـێ پـشتی و داواکـار بوو لە (ئەهورامزدا) کە کەسێك ڕەوانە بکات تاکو خەڵك و جیهان ڕزگـار بکـات لـە دەست (دیواکـان)و ڕەنـج و فەسـاد لـە جیهـان لابدات. (ئـەهورامزدا) کـە (ئاشـا) فریشتەی دادپەروەری بوو فەرمووی تاکو یەکێك لە بەندە پاکدامن و چاکەکار لـە سیفەتی دادپەروەری و ڕاستی ئاگاداربکاتـەوە، و یارمـەتی بـدات تـاکو ڕووبـەڕوی درۆزنـان و زاڵمـان ڕابوەسـتێت و دژایـەتیان بکـات. (ئاشـا) وتـی ئـەو ئیـشە (ماموریتە) دەبێ بە کەسێك بدرێت کە بە توانابێت و لەگەڵ خەڵکیش دڵسۆز بێـت و مرۆڤ دۆست و بێ ئازاربێت، تاکو خەڵکی کە باش بیر دەکەونەو لەگەڵ ئەو دابـن و لە نەبوونی ئەودا دژایـەتی خراپـەکاران بکـەن. خـودا فـەرمووی کـە بەندەیـەکی باش، و باش بیکرکەرەوەی بۆ ئەنجامدانی ئەو کـارە هەڵبـژاردەوەو ئـەویش (زرت ئەوشترە کوڕی ئاسپیتامەیە) بە گوێ لێ بـوونی ئـەو قـسەیە، (گـائۆش ئـاورون و ئاشا) دڵخۆش بوون و پەیمانیاندا لەگەڵ خودای خۆیان کە بە هـەموو توانایـەکیان یارمـەتی پـاك و چـاکەکاران بـدەن و پـشتیوانیان لـێ بکـەن، لەبـەر ئـەوەی کـە زەردەشت پیاوێکی تەنیاو بێ هاوڕێ و بێ توانا بـوو، و فـەرمانیان بـە (وهومنـە و خشترە) کە یەکەمیان فریشتەی ڕێ نیشاندەری چاکە بوو و دووەمیـان فریـشتەی حـوکمڕانی دادپەروەرانـە بـوو فـەرمان درا کـە یارمـەتی زەردەشـت بـدەن بـۆ گەیاندنی مامۆریەتەکەی، و توانای پێ ببەخـشن لـە توانـای خۆتـان تـاکو خـەڵکی

باش وتەکانی زەردەشت قبول بکەن، خودا زمانێکی شیرینی بە زەردەشت دا تاکو بتوانێت دڵی خەڵك بە ووتە شیرینەکانی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت.

لەبەر ئەوەی مامۆریەتی ڕێ نیشاندانی مرۆڤ بوو (ئەهورامزدا)ی سپارد بە زەردەشت، ئەو خۆی بە ناوی (زئۆتا) (پێشوای دینی)و مونتران (ووتاربێژ) ناساند، و بیروباوەڕی خۆی بە شێوەیەکی دڵ فراوان و جوان ڕێکخست بۆ ئەو ڕێبازەو دەستی کرد بە ڕاگەیاندن لە نێوان خەڵك لە ڕووی خەڵك ڕایگەیاند کە ئەو ماموریەتی هەیە ڕێگای ئاسودەیی و شادی بە هەموو خەڵك نیشان بدات، و هەمووان فێری چاك بیرکردنەوە بکات، و دژایەتی ئەوانە دەکات کە خراپ بیردەکەنەوەو زوڵم دەکەن، تاکو برایەتی و ئاشتی لە نێوان هەمووان پەیدا بێت بەربەستەکان لەناو بچن و دەردەکانی جیهان چارەسەر بکرێن، ئەو ئامادەی خۆی دەربڕی بۆ ئەوەی کە بە گیان ئامادەیە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و وتەی باش و بۆ ڕێ نیشاندانی ڕێگای دروست تاکو دواین نەفەسی دەست لەو کارە هەڵ نەگرێت. ئێمە وەکو کتابی (گاتا) دەخوێنین زەردەشت وەکو پیاوێکی زەحمەتکێش دەبینین کە تێ دەکۆشێت بۆ لەناوبردنی نەهامەتیەکانی مرۆڤ، دەبێ ڕێگا بە مرۆڤ نیشان بدات و هەمووان بگەینێتە ڕێگای ڕاست. وەکو دەزانی ئەو ئیشە ئیشێکی پڕ کێشەیە لەدەست مرۆڤێك و هەتا گروپێکیش نایێت لەو کاتدا دەست دوعا بەرزدەکاتەوە بۆ دەرگای خوداو داوای یارمەتی لە خودا دەکات، و داوا لە خودا دەکات کە ئەو هەموو نەهامەتیە و نائومێدیە و شەڕو خوێن ڕێشتنەو فەسادەی کە لە جیهاندا هەیە لە ناوببات و ئاسایش و ئارامی بگەڕێنێتەوە بۆ خەڵك. ئەو وا هەست دەکات کە ئیشی ئەوە مرۆڤایەتی لەو نەهامەتیانە دووربکاتەوە، بەڵام ئەو توانایەی لە ناخی خۆیدا نابینێت، و دەبینی کە هەموو زۆر گویانی (کاویاکان، کرپناکەن، ئۆسیجاکان، گرهماکان) بە هەموو توانایان دژایەتی ئەو دەکەن، و لە نێوان مرۆڤەکان هاوڕیەك بۆ خۆی نادۆزێتەوە، و هێشتاکەش زەردەشت دەبینین کە

بیر دەکاتەوە بۆ ئەوەی ماموریەتەکەی ئەنجام بدات و لە بێ کەس و بێ هاوەڕێیەتی ڕەنج دەکێشێت.

لە سرودەکانی زەردەشت دەبینین کە خۆی بە کەسایەتیەکی وا نیشان دەدات کە ماموریەتێکی هەیە بۆ هەموو جیهان و خۆی وا ناساندوە کە دەربازکەری مرۆڤایەتیە و ئاگاداری هەموو خێڵەکانی جیهانە. پیامبەرانی جیهانی کۆن بە گشتی تەنیا لە لایەن خودای خێڵەکەیان هەڵدەبژێردرا بۆ ڕزگارکردنی خەڵك و خێڵەکەیان، نە تەنیا مەبەستیان ڕزگارکردنی کەس و کاریان بوون بەڵکو خۆیان و خوایەکانیان دژایەتی خوایانی خێڵەکانی تریان دەکرد و لەناوچوونی ئەوانیان دەویست. حەزرەتی موسا وەکو لە لایەن خودای بنی ئسرائیل هەڵبژاردرا بوو، تەنیا ئیشی دەربازکردنی خەڵکی بنی ئیسرائیل بوو لەژێر دەستی فیرعەونی میسرو کۆچکردنیان بۆ جێگایەکی تر کە لە بەئازادی بژین، نەوەك دەربازکردنی خێڵەکانی تر بەڵکو وەکو دوژمن تەماشای خێڵەکانی تریان دەکرد، و هەتاکو ڕێگر بوون لە ژیانی کەس و کارا(قوم) بنی ئیسرائیل لەگەڵ خێڵەکانی تر بێجگە لە خێڵی بنی ئیسرائیل کە هەوادارانی یهود بوون.

بەڵام لە هیچ جێگایەکی کتابی (گاتا)دا نابینین کە زەردەشت هەتا لە باسێکدا دوعای دەربازکردنی قەومەکەی بێت خێڵی (ئاسپیتامە)یانیش وتەیەکی تایبەت بە خێڵەکەی ووتبێت یانیش ئاماژەی بە قەومەکەی کردبێت کە من بۆ دەربازکردنی ئێوە ڕەوانە کراوم، بەڵکو لە هەموو جێگایەك وتاری بۆ خەڵکی هەموو جیهان کە ڕوویکەنە بە (مزدا) پەرەستی و خۆیان بەدووربگرن لە پەرستنی (دیوا)، تاکو بەربەستەکان لابچن و جیاوازی و شەڕ لەناوبچێت و هەموو خەڵك لە ئارمش و ئاسایش دابژین.

خودایە ! بە ئێمە ڕابگەیەنە بە زوبانی خۆت و تێمان بگەیەنە چارەنووسی چاکەکاران چی دەبێت، تاکو من بتوانم هەموو خەڵکی ڕووی زەوی بۆ لای تۆ

ڕابکێشم. خوایە ! ئایا بە زوبانی خۆت و لە ناخی ڕوحی خۆت ئێمە فێردەکەی کە چۆن دەبێت بۆ هەمیشەیی ڕێگای ڕاست و بیرکردنەوەی باش بکەینە پیشەی خۆمان.

من کە دڵم کردوتە چاوێر لەسەر ڕوحی خۆم، و یەکمان گرتووە لەگەڵ بیرکردنەوەی باش، و بە باشی دەزانم کە هەر ئیشێکی باش بکەم (ئاهۆرامزدا) پاداشتەکەیم دەداتەوە، هەرچەندە توانایم هەبێت بەکاری دەهێنم لە ڕێگای فێرکردنی مرۆڤەکاندا بۆ ڕۆیشتن لەسەر ڕێگای ڕاست.

خودایە ! تۆ چاکەکاران و گەوهەری چاکەت داوە ئەوانەی بەهێزی تەقوا و ڕاستی ڕێنمایی کراون، بەڵام خراپەکاران خویەکی ئاگرینیان هەیەو ئەو دووانە لە یەکتر جیاوازن، هەموو ئەو کەسانەی کە گوێی تێگەیشتنیان هەیە، ئەو ڕاستیەی تێدەگەن و دێنە سەر ڕێگای تۆ.

لە فێرکاریەکانی زەردەشت بابەتێك هەیە کە لە هیچ دینێکی تردا نابینرێت، و ئەویش پیرۆز ڕاگرتنی خالقەکانی باش و بە سوودی (ئاهۆرامزدا)و پەرستنی ئەوانە. لە کتابی (ئاوستا) ئێمە سرودەکانی زەردەشت دەبینین کە ڕێزگرتن هەیە لە (ڕۆژ، مانگ، ئەستێرەکان، ڕووبار و ئاو، دار، چیا، ئاگر و ڕووداوەکانی سروشتی و هەتاکو گیانلەبەرانی بەسوودی وەکو مانگا). ئەو باسانە لە فێرکاریەکانی زەردەشت کەم و زۆر باس کراو و ڕێزگرتن لەوانە لە ڕاستیدا ڕێزگرتنی (ئاهۆرامزدا)یە و بە جۆرێکی تر بەڕێز ڕاگرتنی کەسایەتی ئاهورامزدایە.

ئەوانە کە درێژەدانی ژیانی مرۆڤیان بە ئیرادەی خودا ڕەخساندوە، مادام ئەوانە نیعمەتەکانی خودان و باشن و شایستەی ڕێزگرتنن، مرۆڤ وەکو ئەو سرودانە دەخوێنێتەوە دەکەوێتە بیری ئەو وتەی (سعدی شیرازی) دەڵێت: (بەجیهانی ژیاوە لەوانم کە جیهانی لەوە، ئەڤینداری هەموو جیهانم کە هەموو جیهان لەوە). سعدی لەو ڕووەی کە ئەڤینداری هەموو جیهانە کە هەموو جیهان لەژێر ئیرادەی خودایە،

ئەو کە یەك موسڵمانی ئێرانییە بڕوایەکی وای لە ناخی ڕوح و ویژدان خۆی دیتووە و بێگومان ئەوەی لە ڕۆژگاری دورەوە بە میرات وەرگرتووە و دوای بە زوبانی داهێناوە. دەمەوێت بڵێم کە بەڕێز ڕاگرتنی ڕووداوەکانی سروشتی لە ئایینی زەردەشت جوانترین شێوەی یەکتاپەرستییە، و بووە بە سەرچاوەی هەموو شتێك ئەوە لە ئاهورامزدای دەزانی، و هەر بە سەرچاوەی هەموو چاکێك و باشێك و ڕاستیەك و خۆشیەك دەزانی، هەموو ڕووداوەکانی سروشتی ئاهۆرامزدا دروستی کردوەو داناوە لە ژێر دەستی مرۆڤ تاکو مرۆڤ بەهۆی ئەوانەوە خۆشی و ئاسوودەیی بەدەست بهێنێت و خودای خۆی باشتر بناسێت و بیپەرستێت کە ئەو هەموو پیرۆزیانەی بە ئەو داوە. ئەو ڕووداوەش چونکە لە لایەن ئاهۆرامزدای دەبێ سوپاسگوزاری بکرێت و لە ڕێگای ئەودا خودات بناسی.

لە کتابی(گاتا)دا زەردەشتی وا دەبینین کە نە تەنیا سۆزی بۆ مرۆڤ هەیە بەڵکو سۆزی بۆ هەموو گیاندارێك هەیە، نە بەس بۆ مرۆڤ بەڵکو بۆ هەموو گیاندارێکی کە لەسەر گۆی زەویە ئاسایشی دەوێت. ئەو مرۆڤی بە گیاندارێکی خێرکەر و شەڕکەر دەزانێ و باس دەکات کە مرۆڤ لە سەرەتای دروست بوونیەوە بیر لە باشی دەکاتەوەو دادپەروەرە. ئەوە دروست پێچەوانەی فێرکردنی ئایینی (سامیە) کە مرۆڤی بە شەڕکەر و زوو هەڵگیرسێنەری فیتنە دەزانێ.

زەردەشت بنەمای فێرکاری خۆشەویستی بە خوایانی (ئاهۆرامزدا) دادەنێت و مەسئولیەتی سەرەتاو کۆتایی مرۆڤی بە پێکەوە ژیانی بە ئاشتی لەگەڵ یەك و پاراستنی ڕووبارو کشتوکاڵ و دارو گیانلەبەرانی ئەهلی داناوە، لەبەر ئەوەی دژایەتی هەر جۆرە تەعەدایەکی دەکرد بۆ مرۆڤ و گیانلەبەرو کشتوکاڵ و ئاوەدانیەك ئەو کارانەی بەناوی ئەو کەسانە دادەنا کە فەرمانبەرداری دیواکانن تاکو خۆشی لە خەڵك بگرن و جیهان کاول بکەن. لەو کاتەی کە لە سەردەمی ئەو کاویاکان لە شەڕی هەموو لایەنە دابوون، و ئەو شەڕانە و کاول بوونانە و نەهامەتی بە دواوە

بووو، لە سەرەتایەوە هێرەشکیان ڕووبەڕوی (کاویاکان، کرپنەکان، گرهماکان و ئۆسیجهاکان)دەبوونەوە.

بە باوەڕی ئەو روح و بیری خەڵکیان داگیرکردوە و بە داگیرساندنی شەڕی داگیرکارانە و کاول کردن، ئاسایشی ناو کۆمەڵگە لەناوبردوەو ئاسودەی مرۆڤەکانی لەناوبردوەو چوارپێیەکانی کوشتووەو کێڵگەکانی کاول کردووە.

ئەو بە مەبەستی لابردنی شێوازو نەریتی دڵڕەقی کە باوبوو لەگەڵ هەموو کەس، و دژایەتی دابو نەریت و ڕەفتاری ئایینی ڕۆژانە بوو، و بۆنەی ئایینی ئاریایەکانی کە پێکهاتبو لە ئاهەنگی تایبەت و سەماکردن و هاتو هاواری سەرخۆشانە و کوشتنی گیانلەبەرانی ئەهلی بۆ ڕازی بوونی خودایانیان بە کارێکی نەزانانە دادەناو ڕێبازی (دیوا) پەرستەکان دادەنا، و قوربانی کردنی خوێناوی و کاری زۆردارانەی بە لەناوبردنی گیانلەبەرانی بەسوود ناونابوو و بە توندی دژایەتی دەکردن و گوتی ئەو کارانە خودای گەورە توڕە دەکات.

زەردەشت ئەو کەسانەی کە لە بەرامبەر مرۆڤە ئاشتیخوازەکان چەکیان هەڵبگرتبایە وداوای شەڕی لەوان بکردبایە و کێڵگەو ئاوەدانیەکانی کاول بکردبایە بە مرۆڤی نەزان و دیوا پەرستی دادەنا و بە مرۆڤی درۆزن ناودەبرد و دوپاتی دەکردەوە کە ئەوانە ئەو نەزانانەن کە بە ئەو کارە ناشایستەیان داوای یارمەتی دەکەن لە دیواکان و لەسەر هەوەس و ڕابواردنی دنیای نشینگەکان کاول دەکەن و مرۆڤەکان دەکوژن.

ئەو وتی ئەو کەسانەی کە شەڕ هەڵدەگیرسێنن و نشینگەکان لەناو دەبن مرۆڤی نەزانن کە بە کارە ناڕەوایەکانانیان جیهانی مەعنەوی (گائۆش ئاورون) بە دەنگ دەردەهێنن و خودا توڕە دەکەن.

ئەو دژایەتی تەواوی فسادەی سەرخۆشی دەکردو دەیگوت هەر جۆرە خواردنەوەیەك کە سەرخۆشی بە دواوە بێت و هۆشی مرۆڤ لاواز بکات ئەوە بۆ

ڕازیکردنی خودایانی درۆین (دیواکان) سەما دەکەن لەگەڵ دەنگی بەرزی سەرخۆشانە و گیانلەبەران بە مەبەستی پێشکەش کردن بە خودایانی درۆین سەردەبڕن ئەوانە خودا تووڕە دەکەن و ڕووبەڕوی سزای خودا دەبنەوە.

بە باوەڕی زەردەشت مرۆڤ لە بنچینەوە ڕوو بە چاکەیەو ڕقیان لە خراپە دەبێتەوە، و ئەگەر ڕێنمایی خراپی سەرکردە فێڵبازەکان و داواکارانی درۆینی نەدەبوو هەموو خەڵك دروستکارو ئاشتیخوازو دادپەروەر دەبوون و بە هەموو توانایان تێیان دەکۆشی بۆ ئاوەدانکردنەوەی جیهان.

زەردەشت گوتی کە ئەو خراپەو شەڕانە پەیوەندی بە جیهانی مرۆڤەکانەوە نییە بەڵکو بە ئیقلیمی حەفتەمە کە ئیقلیمی(دیواکانە)، و دیواکان ئەو شەڕو خراپەکاریانەیان بڵاوکردەوە بە بەڵێن دانی درۆینی و هەڵخەڵەتاندنی بە ماڵی دنیای لە دڵی خەڵکدا و لە ناو دڵیان ئارەزوی مانەوەی ئەبەدیان پێ دەدان لە دنیادا، بەو ئومێدە بە دەستی فێڵبازان زوڵم و زۆرداری بڵاودەکەنەوەو جیهان کاول دەکەن و مرۆڤایەتی ڕادەکێشن بۆ لەناوچوون. بە وتەی زەردەشت ئەو شتەی کە خەڵك لەگەڵ دابو نەریتی خۆی بیگانەی دەکات هێزی شێتایەتیە کە لە ناخی مرۆڤدا بە خواری دەسوڕێتەوەو ئەوان دەکاتە (دیوای) زۆردارو بەکینەو خراپەکارە، ئەو هێزە شێتایەتیەی کە ناوی (ئەنگرەمینۆ) (پیس سیفەت)ە کە سەرەتای دروست بوونی جیهان لەگەڵ مرۆڤدا هاتووتە دونیا، بەو جۆرەی کە (سپنتامینۆ) (سیفەتی پیرۆز)یش لەگەڵ ئەو هاتووتە دونیاوە، (ئەنگرەمینۆ) مرۆڤ ڕادەکێشی بۆ لای خراپەو فساد، و (سپنتامینو) مرۆڤ ڕادەکێشێ بۆ لای چاکەو دادپەروەری. ئەو مرۆڤە خۆش شانسانە کە بەدوای (سپنتامینۆ) دەکەوێت و پیشەی بیێتە چاکەکاری و بە تێکۆشانی خۆی جیهان ئاوەدان بکاتەوە، خودا لەو ڕازی دەبێت و لە ژیانی دوای خۆشی ئەبەدی پێ دەبەخشێت، بەڵام ئەو بێ خەبەری کە بە دوای (ئەنگرەمینۆ) بکەوێت و بە فەرمانی (دیواکان) خراپەکاری بکات و ئاسایش و

ئاسودەی خەڵك لەناوببات لە دوارۆژدا دەکەوێتە خراپترین ئازارەکانی هەمیشەیی خودا.

ئەوەی کە لە فێرکاریەکانی زەردەشت لێکۆڵەران دەهاوێتە باری سەرنج ئەوەیە بە پێچەوانەی پیامبەری (سامی ) خۆی نەناساندبوو بە زیندوکەرەوەی ئایینەکانی پێش خۆی، بەڵکو هەڵسا بە دژایەتی کردنی ئایینەکانی کە ئەو سەردەم هەبوون بۆ لە ناوبردنیان، و ئەو فێرکاریانەی کە باسی دەکرد شتێکی تازە بوو بۆ خێڵەکانی دەوروبەری، پیامبەرانی (سامی) لە هەر کۆمەڵگایەکدا دەژیان درێژەدەری پیامبەرانی خێڵی خۆیان بوون، و هەوڵیان دەدا ئەو بابەتە کۆنانەی کە تێکچووبوون چارەسەر بکەن و بە شێوازێکی باش پێشکەش بکەن تاکو بگونجێت لەگەڵ سەردەمیان. بۆ نمونە (موسا) لە خێڵی (عبری) درێژەپێدەری ڕێگای یعقوب و ابراهیم بوو، داوای لە خێڵی ئەو (عیسا) هات تاکو ئایینی (موسا) لە گرفتەکان چارەسەر بکات، و فێرکاریەکانی (موسا) کە لە کتێبی ئایینی یەهود بوو بنەمای ئایینی (عیسا)ی پێکهێنا. پیامبەری ئیسلامیش خۆی درێژەپێدەری هەموو پیامبەرانی ئیسرائیلی ناساند، و بە فەرمی ناسینی ئەو ئایینانەو قبولکردنی حوکمەکانی کتێبی ئایینی یەهودو مەسیحی بە بەشێك لە ئیسلام دانا.

بەڵام زەردەشت بە بڵاوکردنەوەیەکی کودەتائی (انقلابی) دژ بە هەموو ئایینەکان کە دروستکراوی دەستی پیاوی فێلبازن بڵاوکردەوەو داوای شەڕی کرد، واتا ئەو ئایینەکی هێنابوو کە فێرکاریەکانی بە تەواوی کودەتائی بوون و ژیان و بیروباوەڕی مرۆڤی سەراوژێر دەکردو دادپەروەریەکی فێردەکردن کە تا ئەو سەردەم بۆ مرۆڤ نەناسراو بوو.

# دوژمنانی مێژووی کورد

د.محمد عبدالله کاکەسور

هەموو واقیعێك بە جۆرێك لە جۆرەکانی پەیوەندی بە مێژووەوە هەیە، تەنانەت هەندێك جار پەیوەستیشە بە مێژوو، ئایا دەکرێت بەدەر لە مێژوو باس لە ئاینی ئیسلام بکەین لە کاتێکدا کە موسڵمانانی ئەمڕۆ هاوچەرخی پێغەمبەر(د.خ) نەبوونە. ئایا بەبێ گەڕانەوە بۆ هەزارو چوار سەد ساڵ لەمەوپێش دەتوانین لە کەیسی سونەو شیعە بگەین و ئایا سەرەتای پەیدابوونی ئاینی مەسیحی ناگەڕێتەوە بۆ (٢٠١٣)ساڵ پێش ئێستا لە کاتێکدا ئەم ئاینە بڵاوترین ئاینی ئاسامانییە لە جیهانی ئەمڕۆدا، بە هەمان شێوە ناوی دەوڵەتی ئیسرائیل لە نازناوی پێغەمبەر یعقوب سڵاوی خودای لەسەر بێت) وەرگیراوە کە لە پێش زایین ژیاوە.

هەر لەم ڕووەوەش ئەزموونی ئەمڕۆی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە لە پەرەسەندنی بەردەوامە ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی شێخ عبیدوڵلای نەهری و شێخ عبدالسلام بارزانی و شێخ محمود شێخ سعید و شێخ ئەحمەدی بارزان و مەلا مستەفای بارزانی و سمکۆی شکاك و ئارارات و ئەیلول و گولان و چەندین بزووتنەوەو ڕاپەڕین و شۆڕشی تریش.

هەر بۆیە دوژمنانی ناوخۆی کورد ئەوانەی چاویان بە ئەزموونی حوکمڕانی ئێستای کورد هەڵنایێت سەرەڕای ئەوەی کە دیموکراتی و پێشکەوتووخوازەو کورد بە درێژایی مێژووی خۆی خەباتی بۆ کردووە. دوژمنانی ناوخۆ بریتین لەو کوردانەی بە هەموو شێوەیەك دەیانەوێت ئێستاو ڕابردووی کورد لەکەدار بکەن تاکو ئایندەی کوردیش تێکبدەن ئەمەش یان لە تێنەگەیشتنیانە یان لە ڕق و قینەیەکی نەخۆشیانەیانە یانیش بوونە بە داشی دەستی دوژمنانی دەرەوەی کورد لە هەندێك دەوڵەتی دژ بە کورد و هەندێك ڕێکخراوی تیرۆریستی هەرێمایەتی و جیهانی.

ئەگەر ناتوانن بە نووسینە ڕەخنەییە ڕوخێنەرەکانیان ئەم واقیعە پرشنگدارە لە پێش تاکی کورد ناشیرین بکەن بەداخەوە هەندێك بەناو نووسەر و مێژوونووس و ڕووناکبیری لە ڕاستیدا ڕەشبینەکان پەنا دەبەنە بەر تانەدان لە مێژووی کوردو دوژمنایەتی کردنی ئەم مێژووە بە ڕەش پیشاندانی هەموو لاپەڕەکانی هەوڵی شکاندنی سەرکردەکانی کورد بە ڕادەیەك کە دوژمنانی کورد ئەگەرچی دژایەتی کوردیشیان کردبێت لە قەتلوعام و ئەنفال و جینۆسایدو کیمیابارانکردن بەڵام هەردەم هەوڵیان داوە دوژمنایەتییەکەیان ئاراستەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بکەن نەك هەموو نەتەوەی کورد لە چوارچێوەی هەوڵی پەرتکردنی کورددا بۆ ئاسان زاڵبوون بەسەر نەتەوەکەدا، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە دوژمنانی ناوخۆی کورد بەوپەڕی ڕاشکاوی دوژمنایەتی خۆیان بۆ هەموو چین و توێژەکانی کورد لە ڕابردوو و ئێستا ڕادەگەیەنن. ئەوان دەیانەوێت بە کورد بڵێن ئەگەر نەتەوەیەك لە مێژووی خۆیدا نەیتوانیبێت شۆڕشێکی نەتەوەیی و سەرکردەیەکی نەتەوەیی پێ بگەیەنێت ئەوە بوونی ئەو نەتەوەیە خۆی لە خۆیدا بێ مانایەو جێگای پرسیارە.

بەلام خۆشبەختانە ئەم جۆرە ژەهرانە بە ئاسانی ناخرێتە مێشکی خوێنەری کوردەوە ئەم قەڵەمە نەخۆشانە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قێزەوەنتر دەبن لە لای کورد. ئەم جۆرە کەسانە مێژوویەکی ڕەش بۆ خۆیان تۆمار دەکەن، جا وانەبێ ئەمانە لە لایەن ئاغاکانیشیانەوە کە بەکاریان دەهێنن جێگای ڕێزبن چونکە کەسێك وەفای بۆ نەتەوەی خۆی نەبێت خیانەت لە کورد بکات وەفای بۆ بێگانەش نابێت بەڵکو لە لای ئەوانیش قێزەوەنن و بۆ ماوەیەکی کاتی و بۆ مەبەستێکی ناپەسند بەکاریان دەهێنن.

دوژمنایەتیکردنی ئەم کەسانەش بۆ مێژووی کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەسەلاتی هەرێمی کوردستان زۆر پشت ئەستوورە بە مێژوویەکی پڕ سەرەوەری و خەباتی کورد ئەگەر چی قوربانی زۆریش لەم ڕێگایە دراوە بەلام ئەمەش لایەنێکی پڕشنگداری مێژوومانە.

ڕیسواکردنی دوژمنانی ناوخۆی مێژووی کورد ئەرکی سەرشانی هەموو دڵسۆزێکی کوردە لە ڕاگەیاندنکارانی کورد قوتابیان و مامۆستایانی بەشەکانی مێژوو لە کوردستان سیاسەتمەدارە نەتەوە پەروەرەکانی کورد.